چاپی سێیەم

بۆ مێژوو

# بیرەوەری دەربارەی تاوانەکانی زەعیم سدیق و ئینزیباتخانە

گرتووخانەی سەربازی سلێمانی لە ساڵانی ١٩٦١بە دواوە



مامۆستا محەممەد باقی سەعید

سلێمانی/ ٢٠١٦

بۆ مێژوو

# بیرەوەری دەربارەی
# تاوانەکانی زەعیم سدیق
# و ئینزیباتخانە

## گرتووخانەی سەربازی سلێمانی لە ساڵانی ١٩٦١ بە دواوە


نووسینی

ماموَستا م. محه مەد باقی سعید بەرزنجی



چاپی سێیەم ٢١٠٦

ناوی کتێب : بیرەوەری لەبارەی تاوانەکانی زەعیم سدیق و
گرتوخانەی ( ئینزیباتخانەی)سلیمانی
نووسینی : مامۆستا محەمەد باقی سەعید
بابەت : (بۆمێژوو ) بیرەوەری
پیاچوونەوەی : مەریوان سەلاح حیلمی
تایب : فەرەیدون عەزیز
دیزاین و نەخشەسازی بەرگ: مةریوان مارف
چاپ : سێیەم
تیراژ : دانة
ژمارەی سپاردن : ١٦٦٩ ی سالَی
نرخ : ٥٠٠٠ دینار

لەسەر ئەرک وگیرفانی خۆم بەچاپم گەیاندوە

# ناوەڕۆک

## بەشی هەشتەم



## بەشی نۆیەم



## بەشی دەیەم

## بەشی یازدە



## بەشی دوازدە



## بەشی سیازدە



## بەشی چواردە



## بەشی پازدە

# پێشکەشە

بەگیانی شەهیدانی کوردستان ئەوانەی کە لە، پێناوی خاک و نەتەوەداو بۆنەوەی نوێ ودواڕۆژیان بوونە خۆڵ بیریان بووە مەشخەڵی هەرگیز نەکوژاوەی خەبات و تێکۆشان . بەتایبەت بۆگیانی برایانی شەهیدانی کوچکردوم کە لە ئینزیباتی عەسکەری ئەوچەندمانگە ئازارو ئەشکەنجە ئەدران هەربەو هۆیەوە شەهیدکران وکۆچی دواییان کرد .

پێشکەشە بەهەمووکوردێکی پاک و دەستپاک و دڵسۆزو خەمخۆری ئەم نیشتمانە ،

پێشکەشە بەگیانی دایکی خەمخۆرو هاودەنگ و یارمەتیدەرم لەکاروانی خەبات وکوردایەتیدا کەسەڵتەکەی بەدوگیرفانی ڕاست و چەپیەوە کردبووە جێگەوشوێنی نامەی هاتوو لەگەڵ ڕۆیشتو (هات وبرد )لای ڕاستی بۆنامەی هاتوی تەرخانکردبوو ،گیرفانی لای چەپیشی بۆنامەی چاوەڕوانکراو دانابوو کە کەسی دەستنیشانکراو بێت نامەوئامۆژگاری لێ وەربگرێت .

## ئەم نووسینە پێشکەش بەهەموویان ئەکەم

# پێشەکی

ئەم نووسینەم بۆیە ئامادەکرد تاببێتە تۆمارێک تیایدا تاوانەکانی دوژمنان لەشۆڤێنیەکانی عەرەب دژی نەتەوەی کورد بەر جەستەبکات و هەردەم لە بیرمان بێت و فەرامۆش نەکرێت وڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان و نەوەی نوی ئاشنا بکرێن بەو رووداوە مێژوویی و کارەساتانەی بە درێژایی مێژوو کە تووشی نەتەوەکەمان بوون.

من کاتێک ئەم نووسینەو یادەوەریەم ئامادەکردووە، خۆم لە ساڵی ١٩٦٢ـ ١٩٦٣ لەسوچێکي ئینزیباتخانەی سلێمانی بەندکرابووم، وەکو چاودێرێک کارەساتەکان وڕوداو ئازاردان و ئەشکەنجە لەبەرچاوم روویانداوە و ئەنجامدراوە، هەروەها مەبەستەم ئەوەنەبووە باسی کەسایەتی خۆم بکەم، بەڵکو مەبەستم ئەوە بوو کە کەباسی بەسەرهاتی بەشێک لەرۆلەکانی ئەم میللەتە بکەم چیان بەسەرهات لەوکاتەدا توشی چەند چەرمەسەری و ئازارو ئەشکەنجەو لێدان و هەڵواسینبوون کە یەکەم جاربوو بە وجۆرە لاوانی کورد دوای شۆڕشی ١٤ی تەموز تووشیبوون.

تا ببێتە تۆمارێکی مێژوویی لەبیر نەکرێت هەردەم ئەم جۆرە کارەسات و ناهەمواریانە ببنە پەندو وانە کە ئێمەی کورد زیاتر لەدوری یەکتر کۆببینەوە بەتایبەت لەکات و ساتی چارەنووسی نەتەوەییماندا .

داوای لێبوردن لەو کەسانە ئەکەم کە ناویانم بیرچووە، یان ئەگەر شتێکم بەسەردا تێپەڕبووبێت هەڵەیەک هەبێت هیوادارم بۆم راستبکرێتەوە، بۆ ئەوەی لە چاپەکانی داهاتوودا ئاماژەیان پێبدەین ،چەند جاریش لە ڕۆژنامەکاندا بلاومکردەوە وبەدەمی وتومەکە بەنیازم یادەوەریەک بڵابکەمەوە دەربارەی تاوانەکانی زەعیم سدیق و ئینزیباتخانە داوای وێنە و کورتەیەکی ژیانی بەندکراوەکانم کردبوو بەداخەوە هەرئەوەندەم دەستکەوت .

هەرچەندە هەموو بابەت و زانیاریەکان بێرەوەری تاکێ خۆمن و دیکۆمێنتی فەرمی لەبارەیانەوە دەستناکەوێت. لەبەشە مێژووییەکەیدا پشتم بەستوە بەچەند کتێبێکی مێژوویی کە ئامـاژەم پێداون .

زۆرترین ئەوکەسانەی لەگەڵماندا (حەپس ) بەندبوون لە ئینزیباتخانە پەسەندیانکردوە تێبینیەکی ئەوتۆیان لەسەری نەبووە،ئەگەر هەبووبێت بەگرنگم زانیوە چاکسازیم تیاکردوە. لەچاپی سێەمدا

دەستکاریمکرد  کەهەندێک گۆڕان وچاکسازیبوو  نەک بنەڕەتی بەهۆی ئەوەی کە کاتی خۆی من بەسەر چاپکردنی چاپی یەکـەم و دووەمـەوە نەبـووم، وەک پێویـست ڕێکخـستنی کتێـبەکەم بەدڵنەبوو.

لەبەرئەوەی ئەم یادەوەریە ئەگەڕێتەوە بۆ دەوری پەنجاساڵ لەمەوپێش لەوانەیە هەندێک باس و ڕوداو پێش ودواکەوتبن  یاخود لەبیرکراوبن وکەم کوڕی هەبێت، لەوڕووەوە داوای لێبـوردن ئەکەم

براتان

مامۆستا : محەمەد  باقی سەعید  مستەفا

سلێمانیمانی ٢٠٠٧

# سوپاسگوزاری

له گەڵ ئەم پێشەکیەدا ئەمەوێت سوپاسێکی  بێپایانی خانەوادەی کاک فایەقی قەساب بکەم کە دەورێکی کاریگەر و یارمەتی دەریان ئەبینی و ئەهاتنە دەست ،  لەوکاتانەدا کـە بـەدەم ئەوخەڵکەوە ئەچوون ،خواردن و شتومەکی پێویـستیان بـۆ هـەڵئـەگـرتن و ،دەنـگ و باسـی ڕۆڵەکانیانی پێ ئەگەیاندن ، بەدەم ئەوخەڵکانەوە ئەچوون ، کەلە بەر دەرگای ئینزیباتخانە کۆئەبوونەوە ناڕەزایی و کێنەی خۆیان دەر ئەبڕی دژی وبە رامبەر بە تاوانەکانی زەعیم سدیق لەئینزیباتخانە کە چیان بەڕۆڵەکانیان ئەکرد

# پێشەکییەکی مێژوویی دەربارەی گەلی کورد و خاکی کوردستان لە سەردەمی ئیسلامییەوە تا ساڵەکانی شۆڕشی چواردەی تەمموز ١٩٥٨

لەو ڕۆژەوەی ئایینی ئیسلامی بڵاوبووەوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە کوردستانی بەرینی (ئەو ساتانەوەش) کاریگەری گرنگی بنەڕەتی هەبووە لەسەربنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی و ژیانی کۆمەلایەتی کەلتوری ومرۆڤایەتی کوردو ناوچەکەو جیهانەوە، بووە هۆی گۆڕانێکی بنەڕەتی لەڕووی دیموگرافی دانیشتوان و ژیانی ئابوری و شارستانی کەلتـورو سـامانی نەتەوایەتـی و کۆمەلآیەتی وبیرکردنەوەی ئەو نەتەوانەی کەچوونە ژێر ئاڵآی ئاینی ئیسلامەوە یان دەبـوونە ئیسلام وئایینە کەیان قبوڵ کردبوو، بەخواهیشت بێت یان بەزۆر دەکرانە ئیسلام.

عەرەبەکان بە هێرشێک وەک نەتەوەیەک هاتن بەدەستێک ئاڵآی ئایینی ئیسلامیان هەڵکرتبوو بلآویانکردەوە و بەدەستێکی تر هەرچی کەلتوورو نەریتی عەرەب ودواکەوتوویی و گیانی تیرە گەری وگیانی تاوانکاریان هەبـوو ، بـەهـەمـوو هـۆزو تیـرەکانـەوە، لەگەڵ خۆیـان هێنایـان ، بەمەبەستی نیشتە جێ بوون لەوڵاتە داگیرکراوەکاندا ، کەدەرلەئایینی ڕاست و دروستی ئیسلام بوو، هێشتا زۆریان گۆڕانیان بەسەردا نەهاتبوو گیانی ڕەگەز پەرستی و جەهالەتی عەرەبی لەناو یاندا لە کردارو رەفتارو دەروونیاندا رەگی داکوتابوو ، ئەودینە نەیتوانی بیری جەهالەتی عەرەبی و گیانی تاوانکاری لەمێشکیاندا دەربکات، بەزۆربێت یان بەخواهیشت سەپاندیان بەسەر ئەو نەتەوانەدا، عەرەبە بەدەوی و خێلەکیەکان بە خاوخێزانەوە بە هەلیانزانی بەدوای لەشکری موسوڵمانانەوە هاتن لەناو دانیشتوانی ڕەسەنی کۆنی ئەوگەڵ و نەتەوەنەدا نیشتەجێبوون .

بۆ یەکەم جار وەک نەتەوەیەک لە ڕوباری فورات پەڕینەوە کە سنوری نەتەوەییـان بـوو ، هاتن بۆ ناو ئەو وڵاتانە نیشتەجێبوون بوونەگەورەو سەرکردە لەو ولآتانەدا ،بوونة خاوەنی سەروەت وسامان و ماڵی ئەو نەتەوانە ، دەستیان برد بۆ باری خێزانیان ژیانیان لێ تێکدان . هەرچەندە ئەو گەلانە ئایینی ئیسلامیان وەرگرت چوونە ناویەوەبەلآم لەبەرامبەردا سەربەخۆییان لەدەستداو بوونە ژێردەسـتەی عەرەب بێبەشـبوون لـە سـەروەری ئیـرادەو مـافی نەتەوەیـی ومرۆڤایەتی وتاکـەکـەسـی وبێچـارەنووس مـانەوە،بە دانیـشتوانی پـلەی (دوو)دائەنـران نـاوی (مەاليان) لێنرا. هەرچەندە موسوڵمان بوون عەرەب نەبوون، ئەبووایە سەرانەبدەن

لەئەنجامدا ئەونەتەوە گەلانە توشی زۆرداری و چەوسانەوەبوون بە دەست ئەوعەرەبە بەدەوی و خێڵەکی و هۆزانەی لەگەڵ و دوابەدوای لەشکری موسوڵماناندا بەخاو خێزانەوە هاتن وەک داگیـرکەر ، بۆنمـونە وەک خێڵـەکـانی : ( بەنـی تەمـیم و بەنـی بەکـر ، شـیبانی و مـوزەر

وجحـێش،،،،هه ،، دوایـی ) .دوای مـاوەیەک ئەونەتەوە ڕەسـەنانـە هاواریـان لێهەڵـسا بەدەستیانەوە. کەکردارو ڕەفتاریان دوربوو لە ئایین و فرمانەکانی ئایینیەوە کەزۆر کرداریان بەرامبەر موسوڵمانانی غەیرە عەرەب تاکە کەسی و هەوس و ئارەزووکاری بوو . ئەوەبوو ئەو نەتەوەو گەلانە دوای ماوەیەک ، کەوتنەخۆ بیریانکردەوەو کەوتنە قسەو جولآن، وتیان بێگومان ئێمە موسوڵمانین بەلآم عەرەبنین ئیسلاممان قبوڵەو پێی قایلین بەلآم لە عەرەب کەمترنین ،بەهۆی ئەوەی کەموسوڵمانین نامانەوی ببینە ژێردەستەی عەرەب. بەهۆی ئایینی ئیسلامەوە، بۆعەرەب بمانچەوسێنێتەوە ؟، سەرۆک هۆزو سەرکردەکانیان بەدەر لەپەیرەوو ئایینی ئیسلام رەفتـارئەکەن ، بـۆ تێرکردنـی ئـارەزوەکـانی تـاکی خۆیـان هەمـوو رةفتـارو کـارێکی نـارەوا ودەستدرێژی بۆماڵ و ناموس ئەنجامئەدەن تا ڕادەی ئەوەی خومان خاوەنی ماڵ و خێزانی خۆمان نین.

دەنگ بەرزبوو وە لەناوگەلانی موسوڵمانی ژێردستەدا، کوردان وتیان ئێمەي کوردیش وەکو عەرەب نەتەوەیەکی تایبەتین و مافی خۆمانە سەربەخۆ و خاوەنی سەروەری خۆمانبین پێش بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام نەتەوەیەکی شارستانی وخاوەنی سەربەخۆیی و دەسەلآتی خۆمان بووین ئێمە بووین خاوەنی دەوڵەتی ساسانی لەناوبراو ،نەریت و کەلتوری سامانی نەتەوەیی وئەدەبی تایبەتی خۆمان هەبووە وهەیە ،مافی خۆمانە بیانپارێزین ئەوان بۆ شـانازی بە کەلتوری زەمانی کافران و جاهیلی خۆیان ئەکەن کە لە پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیـسلامدا پەیرەویان ئەکرد ئەمرۆژ لەسەری ئەڕۆن ئەی ئێمە بۆنا ؟ ...

عەرەبەکان ئەم جۆرە هەست دەربرینە و بزوتنەوانەیان بە تۆمەت دانا ، بە (**شعوبیەت**) ناویـانبرد وتیـان وەرگەڕانە لە ئـایینی ئیـسلام ئەو بیـرو بۆچوونانـە زەنـدیق و کـافران ئەیانبەنبەرێوە. لەبەر ئەوە کوشتن و برین ماڵتالآنکردنیان و دەست بەسەراگرتنی ماڵ و ژن ومنداڵیان ڕەوایە حەلآڵە و وەرگەڕانە لەدین وگومڕاییە بائەنفال بکرێن .، **نەتەوەي کورد** : لەپێناوی ئایینی ئیسلامیدا گەلێک قوربانی گیانی وماڵی و نەتەوەیی دا، لەو پێناوەدا زمان و کەلتورو ئەدەب و نەریتی کۆمەلآیەتی نەتەوایەتی پـشتگوێ خـست. بە درێژایـی مێـژوو زۆر دەستکەوت و بەرژەوەندی تایبەتی نەتەوایەتی لەدەستچوو چەند جاریش بۆ کورد رەخسا کە دەولەتی تایبەتی و ناوچەیی و ئەمارەت دروستبکات، بەلآم بە زەبرو هۆکاری ئایینی و زۆری کەوە، لەدوای ماوەیەکی کەمدا لەناو ئەبران یان لەناو ئەچوون.

**بەڵام هەندێ لە نەتەوەکانی تر** : وریایانەو یەک وشە و یەکریز بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان سوودیان لەم ئایینە وەرگرت و بەکاریان هێناو گونجاندیان بۆ خزمەت و سـەرکەوتنی

نەتەوەکانیان و دوا ڕۆژی نەوەکانیان، کە کورد زۆر لەونەتەوەو گەلانە دڵسۆزتربوو بۆدینەکە زیاتر پەیوەست بوو پارێزەری بوو کەمێژوو شاهیدە بۆ ئەم ڕاستیانە.

عەرەبەکان بۆ ماوەیەک توانیان باڵادەست و سەرکردە وگەورەبن بەهۆی پشتبەستنیان وپەیوەستیان بە ئایینی ئیسلامەوە، بەڵام لەکاتی حوکمی خەلیفە (موعتەسەمە)وە خەلیفەکانی دوای ئەو لە ساڵەکانی دەوروبەری ( ٢٢٠ هیجری ـ کۆچییەوە) بەدواوە خەلیفةکانی عەباسی بەهۆی هەلەو نەزانی ولاوازی کەسایەتی و ژیانی ئارەزوکاری وڕابواردنەوە ونەیانتوانی وەک پێویست وڵات بەرن بەڕێوە ،پشتیانبەست بە تورک و ئازەرو تەتەر وجەلائیری وسلجوق و خەوارزمی نا موسوڵمان (بەپێی ئایینی ئیسلام کافران ) نامەیان نووسی بۆیان بانگیانکردن و هێنایانن کە بەهانایانەوە بێن و بەرگریان لێبکەن پشتیوانیان بن تا تەختی خەلافەتیان بۆبپارێزن و لەدەستیان دەرنەچێت.

بە کرداری نەفامی ونەزانی و هەڵەو نامەسئولانەی خەلیفەکان دەرگاکرایەوە بۆیان و بە کۆمەل هاتن، بەئارەزوو یان بەتۆپزی و بە شەرو کوشتار ئەم ولآتانەی ڕۆژهەڵاتیان داگیرکرد ،.بەم هۆیەوە گۆڕانێکی گەورە وبنەڕەتی لەناوچەکەدا ڕوویدا بەتایبەت لەڕووی دیموگرافی دانیشتوانەوە بەڕەوپێکردن و کوشتنی بەکۆمەڵ وتالآنی دژی دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ناوچەکە ، وڵاتەکە پڕبوو لە تۆرانیەکان بە هەموو ناو و بەشەکانیانەوە ڕویەکی تورکی وەرگرت کە بەدرێژایی مێژوو ، دەوڵەتی ساسانی بەربەست بوو لە بەردەمیاندا، تا ئەودڕندانە نەیەنە ئەم وڵاتانەوە، بەپێچەوانەوە خەلیفەکان بانگیان کردن ، وابەئاسانی تەنها لەبەر پاراستنی کورسیەکەی خۆیان چارەنووسی ئەونەتەوانەیان دایە دەستیان .

لەگەڵ ئەوانەشدا هێشتا ئاسەوارو کاریگەری کەلتورو زمانی عەرەب لەسەر نەتەوەکان هەر بەردەوامبوو بەهۆی کاریگەری ئایینی ئیسلامەوە کە شەعائیری ئایینی و قورئان بە عەرەبیە و عەرەب خاوەن وهەڵگری سەرەکی دینەکەبووە زمانی دین و ئایینەکە عەرەبیبوو ، کەبووە هۆی بە عەرەبکردنی سەرومری گەلان و نەتەوەکان وبڵاوبوونەوەی زمانی عەرەبی، و چەسپاندنی کەلتورو فولکلۆرو نەریت ئەدەبی عەرەبی . ئەم کاریگەریە کاریکردە سەر ناخیان وهەندێک بنەمای نەتەوایەتیان و زۆر نەتەوە بوونەعەرەب.(وەک سوریاو میسرو سەروی ئەفریکا و زۆرشوێنانی کە)، هەرچەندە عەرەب بۆ ئەم مەبەستە پرۆگرامێکی داڕێژراوي نەبووبێت ، هەر لەو کاتانەشەوە کەعەرەب هێز و حوکم دەسەلآتی لەدەستچووبوو ، بەڵام هەر لەڕێي پەیرەوکردنی فەرمودەکانی ئاین و ئایەتەکانی قورئانەوە وەک خاوەن دینەکەو زمانی دینەکەوە کاری گەری هەر بەردەوام بوو .

کوردستان ، بەهۆی هەڵکەوتنی جوگرافی ناوچەکەیەوە ، بەهۆی خراپ بەکارهێنانی ئایینەکەو ، بەهۆی کزی گیانی یەکگرتن وتەبایی و خۆویستن وتاکڕەوی لوت بەرزی دژایەتي یەککردن و

دوبەرەکی ودوژمنایەتی کردنی یەکتری ، فرت وفێڵی دوژمنان لەناوماندا کوردستان بووە مەیدانی شەرو ئاژاوە و دەستدرێژی ، لەناو ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورددا ، هەست نەئەکرا بەگیانی یەکێتی و یەکڕیزی وپەند لەمێژوو وەرنەئەگیراو وپشتی یەکترنەئەگیرا بەرژەوەندی نەتەوەیی نەپارێزرا .

کوردستان بووە مەیدانی ململانێی و شەڕو جەنگی بەر دەوامی ئەو دەوڵەتە گەورانەی کەلە ئەنجامدا دروستبوون وەک دەوڵەتی سەفەوی شیعە لە ئێرانداو دەوڵەتی سوڵتانی عوثمانی سوننە لەتورکیا ، لاوانی کورد بوونەچاوگی ئاگری ئەو شەڕانە ، بەئابوری ودرامەت و خەرجی وخوێنی لاوانی کوردستان ئەوجەنگانە ئەبرانبەڕێوە . دواجار لە مێژووی تازەی ناوچەکەدا لەسەدەی شازدەهەمدا، کوردستان لە ناوجەرگەیەوە بەدرێژایی یەک هێل لە سەرەوە بۆخوارەوە دەر لە ئیرادەو ویستی نەتەوەی کورد. دابەشکرا، لە نێوان دەوڵەتی سەفوی (شیعە) مەزهەب لەئێران و دەوڵەتی عوسمانی (سوننە) مەزهەب لەتورکیا.

ئەگەر ڕۆژێک کورد بەرامبەر ودژ بەهەر لایەکیان هەستایەو داوای مافی خۆی بکردایە و شۆڕشی بەرپابکردایە، بەشی کوشتن و برین و ماڵوێرانکردن و تالآنکردن کوشتنی بەکۆمەڵ ورەوپێکردنبوو .

دوژمنەکانمان ئەم کارەیان بە ئەرکێکی پیرۆز دائەناو هەرلایەکیان دینەکەیان وەک داردەست بەکارئەهێنا دژی کورد، وایان ئەدایە قەڵەم کە کورد دژی ئیسلامەو کافرەو کێویە شارستانی نیە و بەفیتی بێگانە هەڵساوە.

هەر لایەکیان هەر بە (کورد) راپەڕین شۆڕش و داواکارییەکانی کوردیان دائەمرکانەوەو بەسەریدا سەرئەکەوتن و جار جارەیش سەرکردە ودلسۆزەکانی کوردو شۆڕشگێڕانیان تاوانبار ئەکرد کە بەفیتی بێگانە هەڵساون بە درۆو دەلەسەو وشەی دوژمن فریویان خواردوە . لەئەنجامدا ڕۆلەکانی کورد ئەکەوتنە داوی بێبەزەییانەوە ئەکوژران و لەناو ئەبران.

بە درێژایی مێژوو لەگەل ئەم هەموو بەسەرهات مالوێرانی کارەسات ناهەمواری و کوشتن برینە، کورد هەر کۆڵی نەداو لە خەبات و تێکۆشان و لەهەولی بەردەوامدا بوو ، بێوچان بێهیوا نەبوو،تا جەنگیی جیهانی یەکەم، و هەر لەم جەنگەشدا کورد بووە چاوگ بۆ خۆشکردنی ئاگری بەردەوامی جنگەکەو هەزارەها لاوی کورد بوونە قوربانی ئەو شەڕە ، بێ سەرو شوێن نەگەڕانەوە، ئەم جەنگە بووە هۆی مالوێرانی وبرسێتی و نەبوونی و نەخۆشی ومردنی بۆ دانیشتوانی کوردستان ، بەڵام دڵسۆزان و ڕۆشنبیران هەر لە هەوڵداندا بوون بۆ دابینکردنی ڕۆژێکی روناک و پر لەسەروەری بۆ کورد کۆڵیان نەدا. لەوکاتەدا هیوایەکی نوێ لە ئاسۆدا تروسکاییدا، کاتێک دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانی (براوەی بەرەی جەنگی جیهانی یەکەم)

بلآویانکردەوە کەئێمة مەبەستمان لەم شەڕە دەستدرێژی و داگیر کردنی وولآتـەکانتان نیـیە، بەڵکو بۆ رزگارکردنی گەلانی ژێر دەست و چەوساوی سەر بە پیاوە نەخۆشەکەیە (مەبەسـت دەوڵەتی عوسمانی دۆڕاوی جەنگەکە)، بۆ دابین کردنی ئازادی و مافە بۆیان هـاتووین. وئەم جەنگە هەربۆ ئەو مەبەستە بەرپا بووە .

هەروەش ئەۆپئەم جەنگە بەلایەکدا بکەوێـت هەر لەسـاڵی ١٩١٦وە فەرەنـساو بەریتانیـا و ڕوسیای قەیسەری لەنێوان خۆیاندا بەنهێنی پەیمانێکیان واژۆ کردبوو بەناوی (سایکس بیکۆ)وە ولآتانی ژێردەستی (خەلافەتی عوسمانی) یان ، بەپێی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان پارچەپارچە وبەشبەش و دابەش کردبوو ، ، بێئەوەی داواکاری وماف وبەرژەوەندی ئەونەتەوانەو شوێنی جوگرافی و یەکێتی خـاکي نەتەوەییـان ڕەچـاوبکەن، بەتایبـەت هـی نەتەوەی کـوردو خـاکی کوردستان کەکردبوویان بە چوار پارچەوە لەڕاستیدا بە پێنج پارچەوە.

کاتێک لەساڵی ١٩١٨ دا جەنگی جیهانی یەکەم بڕایەوە، بە سەرکەوتنی هاوپەیمانان کەپێک هاتبوو بەتایبەت لە ئینگلیزو فەرەنسا وئیتالیا، دۆز و کێشەو داواکاری وچارەنووسی گەلانی ژێرردەستەی دەوڵەتی عوسمانی کەوتە بەرباس و لێکۆڵێنەوە لەبەردەم (لیژنەی ئاشتی) سەر بەکۆمەڵەی گەلان لەپاریس ( عوسبة الامم ) ،نوێنەرانی کورد وەک هەموو گەلانی ژێر دەستەو هاوشێوەی ئەوهان، چالاکـانەو دەسـتوبرد چـوونە بەردەم (لیـژنەی ئاشـتی) لە پـاریس، (کـە دەوڵەتە براوەکان بوونە ناوەندی بەهێزی بڕیاردەری جیهانی و چارەنووسی گوڵان کەوتە دەست ئەوان)، داواکاری نەتەوەی کوردو خاکی کوردستانیان لەیاداشتێکدا پێشکەشکرد بەدور و درێژی لەگەڵ نەخشەیەکی خاکی کوردستانی گەورەی یەکگرتوو کە تیایدا داوای چارەنووسی گەلـی کوردیان کردبوو لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە خاکی نەتەوەیی خۆیاندا.

لە ئەنجامدا زۆر لە نەتەوەو گەلانی ناوچە بە ئاواتی خۆیان گەیشتن بەپێـی بڕیـارەکـانی [پەیمانی سـیڤەر]، ونـوێنەرانی گەلـی کـوردیش مـافی پێکهێنـانی دەوڵەتێکـی سـەربەخۆیان لەبڕیارەکانی پەیمانی (سیڤەردا )بەدەستهێنا ئەوپەیمانە ، زیاتر لە چوارسەد بەند پێکهاتبوو لە سێ خاڵیدا بەژمارە (٦٢ ، ٦٣ ، ٦٤) کەپەیوەندی بەکوردو کێشەکەیەوەبوو لەژێر نـاوی (کوردسـتان) دا بـوو تێایـدا بڕیـار درابـوو دەوڵەتـی سـەربەخۆی کوردسـتان پێکبهێنرێـت ، کەبەسترابووەوە بەچەند مەرجێکەوە، ئەبێت لەماوەی ساڵێکدا کاری بۆکرابێت و ئامادەکرابێت کە ناوچەیەکی کەمی کوردستانی باکوری ئەگرتەوە.

پەیمانەکە نووسرایەوە لەسەر کاغەز مایەوە جێبەجێنەکرا ، لەدایک نەبـوو لەبـاربراو نەژیـا، بـەهـۆی هـەوڵـی دوژمنـان و ڕێـک نـەکـەوتـن کێبڕکـێ و دوژمنایـەتـی نـاو خـۆی کـورد، [پەیمانی سیڤەریش ] پوچەڵکرایەوە بەزۆر و زەبری مستەفاکەمالی سەرۆکی تورکیالە جێی ئەو (پەیمانی لوزان ) بەسەر کوردا سەپێنرا ، داواکاری مافی کورد پشتگوێخراو.

هەر لەناو لاپەڕەکاندامایەوە، لەئەنجامدا کوردستانی بەشی ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانی کرا بە چوار پارچەوە بەشێکی بچووکی لە (یەکێتی سۆڤێتی ) جاراندا خۆیدیەوە و بەشێکی زۆری لە تورکیا مایەوەو بەشی خواروی کوردستانیش ولایەتی موسڵ ( میسلا،میسێل) بەعێـراقەوە لکێنرا لەگەڵ ولایەتی بەغدادو بەسرە حکومەتی پاشایەتی عێراقیان پێدروسـتکرد ناویـان نـا عێراق کە لەوەپێش بەنـاوچەیەکی بچـوک ئەوتـرا [ عێـراق ]، بەم شـێوەیە مـامە ئینگلیـز و هاو پەیمانانی چارەنووسی ئێمە یان دایەدەستی عەرەب ، بەشێکی کەخرایەسەر سوریا .

بەشە مێژووییە کۆنەکەی کوردستانی ڕۆژهەلات بەرکەوتووی (دەوڵەتی سەفەوی) جارانی (ئێران) هەر لە بندەستی ئێراندا مایەوە بێئەوەی دەستکاری بکەن هەر باسیشی لێبکرێـت، مامەی ئینگلیزو هاوپەیمانان ڕایان وابوو ئەبێت ئێران وەکخۆی لەچوارچێوەو سنوری ئێستایدا بمێنێتەوە بێئەوەی بخرێتە سەر مێزی باس ولێکۆڵینەوە بۆ ڕەچاوکردنی ماف وچارەنووسـی نەتەوەی کورد.

لەو بەشە بەرکەوتووەی عێراق کەولایەتی موسل (موسیلا)ی ئەگرتەوە وەک باسکرا بەئارەزوی ئینگلیز لکێنرا بەعێراقەوە ،وەستاو ئەندازیاری ئەم کارە لەم مەیدانەدا هەر ئینگلیزبوو ، هەر ئەو بالادەستبوو، گەڵێ پەیمان و وشەو گفتی شیرینی دابوو بە کورد بـەمـەبـەسـتی کـات بردنەسەرو فێڵ و تەڵەکە ، کوردی پاساودابوو، ئێمەی کورد پـشتمان پێبەسـتبوو زۆر جـار بڕوامان پێیبوو . جاری وا هەبوو چاوەڕووانی دەستی کەرەمی ئەوبووین .

سەیرتر ئەوەبوو دوژمنانی کورد هەردەم نەتەوەی کوردیان تاوانبار ئەکرد کەبەفیت و هاندان وپشتی ئینگلیز کورد جولاوەو ڕاپەڕیوە و شۆڕشی بەرپاکردوە، سەیرتریش ئەوەبوو{ لەسالانی ١٨٨٧دا لەموئتەمەری بەرلیندا کێشەودۆزی نەتەوەی کورد درابووە دەستی ئینگلیز کە ئە و بەرگرو(حیمـایەی) کـوردو فریادرەسـمان بێـت لێکـۆڵینەوە لەدوزوکێـشە و مـافی کوردبکـات پارێزەرمان بێت}.

کە لە ئەنجامدا بێبەشبووین یان بێبەشکراین لە زۆر دەستکەوت و هەل کەبۆمان ئەڕەخسا ، وەک حکـومەتی پاشـایەتی شـێخ مەحمـودی نەمـر لە نـاوچەی سـلێمانی نـەیـان هێـشت بەردەوامبێت ، بەرپابێت زوبەزو لەناویان برد، تا ساڵەکانی نزیکیش فرو فێل و پاساودانی، ئینگلیـزو کـاری دژایەتیکـردنـی کـورد بـەردەوامبـوو هەر کـاریگەری هەبـووە لەسـەرمان. بالادەستبووە لە سەرکوتکردنی کوردو دامرکاندنەوەی شۆڕشەکانی کورد ، بەدرێژایی مێژووی سەردەم، هاوپشتی ڕژێمەکانی دوابەدوای عێراق بوو کە لە مێژووی تازەی عێراق و ناوچەکەدا زۆر بە ئاشکراو زەقی دیارە.

یەکەم بۆردومانی کوردستان بەفرۆکە لە کوردستانی خوارو ئەنجامدرا ، پشت تێکردنی ئینگلیز لە دۆزی کورد دژایەتی کردنی و پیلانەکانی تا ئەم دواییـەش پێـی تلاینـەوە، بـووە مـایەی

دابەشکردنی کوردستان و پێشێلکردنی مافی نەتەوایەتی و لەدەستدانی سەروەریمان. وەک زوتر باسکرا بەپێچەوانەیشەوە دوژمنەکانمان هەموو کات جولآن وراپەڕین وشۆڕشەکانی کوردیان تاوانبارکردوە کە بە فیتی ئینگلیز کورد داوای ماف ئەکات ڕاپەڕیوەو لە یاسا هەڵگەراوەتەوە ویاخیبووە، ئینگلیز هاندەرو یارمەتیدەریانە .(وەک کورد وەک هەموو نەتەوەکانی کەی سەر ڕوی زەمین لە ناخیەوە هەستی نیشتمان پەروەری و خۆشەویستی وڵاتەکەی لەدڵ و دەرونیاندا نەچەسپێبێت ،هەستی نەتەوایەتی نەبێت ، خەبات نەکات بۆڕزگاری وسەربەخۆیی.

لێرەدا کەمن باس لە رابردوو و ڕوداوە مێژووییەکان ئەکەم نامەوێ بچمە ناو وردە کاری باسەکانەوە بەڵگەو نووسراو بهێنمەوە کە بەڵگە لەوبارەیەوە زۆرن ساغبوونەتەوە، تەنها ئەوەندە دەڵێم ئەگەر نەزانین شارەزانەبین لەکەم و کوڕی و کەلێن هەڵەکانێ مێژووییمان ، نەتوانین باش هەڵیسەنگێنین و بیرو راو هەلە وچاک و خراپی لەیەک جیانەکەینەوە ، نەزانین تاچیڕادەیەک گونجاوە وکاریگەری و مەترسی لەسەرمانە و لەگەڵ لێکدانەوەی چاک و خراپ وکات وسات و پێویستی ئەوکاتە ودەوروبەر و ناوخۆیی چۆنبووە ،هۆی دواکەوتن و ژێر دەستەییمان چیە ...؟، چی پەندێکی لێوەرئەگرین ...؟ ، ئەوسا بەوشیوەیە ڕێگە لەبەردەماندا ڕونترئەبێتەوە بەرپێی خومان ئەبینین.

ئێمە مێژووی رازاوە پاککراوەمان ناوی، کاتێ مێژووی تازەمان ورد دەکەینەوە ئەبێت باش لێیبکۆڵێنەوە ئەزمونمان هەبێت ، تاباش شارەزاییین بەپێی زروف کاتی ئەوساتانە وردی بکەینەوە ،بزانیین هەڵەو ڕاستی لەکوێدایە وچۆنبووە تا پەندو وانەو دەرسیان لێوەربگرین بەڕاشکاوی وبەڕونی باسیان بکەین وەک خۆی بێگۆڕان بیخەینە بەردەست ، بەویژدان بێلایەن گیری تەنها پەیوەند بەکوردەوە خۆی ، مێژووی بژار کراو ڕازاوە و پاککراومان ناوێت بەم کارە تووشی ڕێگە ونی ئەبین هەڵەکانمان دوبارە ئەبنەوە.

لەدوای توێژینەوەو ردەکاری بۆمان دەرئەکەوێت کەچەندە دوژمن دەستیان هەبووە لەپلآن و دوژمنایەتی ودژایەتی کردنی نەتەوەی کورد، بەمکارە دۆست ودوژمنی خۆمان بەباشی جیائەکەینەوە.

هەروەها بۆمان ڕونئەبێتەوە وتێئەگەین کوردیش خۆی خەتاو هەڵەو دەستی هەبووە لەومەیدانەدا نەبوو ونەزان و یەکگرتو نەبووە ، ئایین و تێنەگەیشتنی کاری لە ناخی کردوە ئەگەر ئێمە هەنگاو بەسەر ئەم هەڵەو هۆیانەدا بنێین ناتوانین لەڕووی مێژووە وە وەک پێویست خزمەتی نەتەوەکەمان بکەین هەنگاوی شیاو وڕاست ودروست وپێویست وریایانە بنێین و جارێکی تر هەڵەکان دووبارە نەبنەوە.

دەرئەجام كوردستان دابەشكراو مافی پێشێلكرا وسەروەری لەدەست چوو ،چارەنووسی كورد لەبەشی كوردستانی خوارو درایة دەستی عەرەب، كورد كرایة ژێردەستەیان دۆزی كورد وەك نەتەوەیەكی كۆن و ڕەسەن و خاوەن خاكی تایبەتی خۆی و خاوەن ماف وشارستانی و دەسەلآتی كۆن سەیرنەكرا .

چەند خالێكی یاسایی بۆ ڕواڵەت خرایە دەستووری عێراقەوە هەر بۆناو ، ئەگەركاری پێبكرێت گوایە بۆ مافی گەلی كورد دانراوە .

دوای دامەزراندنی ڕژێمی پاشایەتی عێراق و . سەركەوتنی جولآنەوەی تۆرانیەت ( كە ڕەگەزی تورك پێی ناسرابوو ) كە مستەفا كەمال ڕابەری ئەكرد لەتوركیا. داوای ولایەتی موسلی كرد، كێشەو شكات گەیشتە (كۆمەڵەی گەلان) بەوهۆیەوە لیژنەیەك لە لایەن (كۆمەڵەی گەلانەوە ) پێكهات وهاتن بۆ لێكۆڵینەوە وردكردنەوەی كێشەكە .

لیژنەكە هاتن بۆ لێكۆڵینەوە وڕاپۆرت نووسین ، لەئەنجامی بگرەو بەردەو گەڕان و پشكنین و ووردكردنەوەی تەگەرەی نێوان عێراق (ئینگلیز ) و توركیا لیژنەكە ڕاپۆرتەكەیان پێشكەشكرد تیایداهاتبوو :

لەولایەتی موسێلادا نەتەوەیەكی تایبەتی تیائەژی كەزۆرینەن نەوتەوەیەكی تایبەتی ڕەگ داكوتاووی مێژوویی كۆنن نەتوركن نەعەرەب نەتەوەیەكی جیاوازن زمانی تایبەتی خۆیان هەیە،كەلتورو نەریت وسامانی نەتەوایەتی وكۆمەلایەتی و ڕابوردوی شارستانی و تایبەت مەندی خۆیان هەیە و خاوەن دەسەلآتی كۆن و دەوڵەت سەروەری بوون.

پێویستە مافی نەتەوایەتیان جێبەجێبكرێت و ئاواتیان بێتەدی ،تایبەتمەندی نەتەوایەتیان پارێزراوبێت .

كاتێك شكات وكێشەكە لە (دادگای دادوەری جیهانی لە لاهای ) تاوتوێ كرا ، لەئەنجامدا عێراق (ئینگلیز) بردیەوە ( ولایەتی موسێل ) بۆعێراق ساغبووەوە ئەومافەی پێدرا ، بڕیاردرا (وڵایەتی موسێل ) بەپێی بڕیاری دادگا بخرێتە سەر عێراق ، لەپاشكۆی بڕیارەكەدا ئاماژەدرا بەهەندێك لە مافی نەتەوەی كورد بەچەند ، بەندێك لەدەستووردا نووسرابوو ئاماژەی پێدرابوو. كە بنەڕەتی و نەتەوەیی نەبوون .

ڕژێمەكانی یەك لە دوای یەكی عێراق هەربەدەمی و بەرواڵەت پابەندبوون بەوچەند بەندەی دەستووریەوە .

ئەو(نەوەد) ساڵەی حوكمی عەرەب لە عێراقدا تاساڵی ٢٠٠٣ گەلی كورد مایە پووچ دەرچوو ، لە كوشتن و بڕین و ئەنفال جینۆسایدو پاكتاوی نەژادی كۆمەڵكوژی ڕەوپێكردن و كێمیاباران و كاوڵكردنی كوردستان ،بنبڕكردنی ژێرخانی ئابووری كوردستان و تاڵان وبڕێ و بەدێلگرتن و

دەست بەسەراگرتنی ژن و منداڵانی کوردو ،پڕکردنەوەی سەرچاوەی ئاوەکان و سوتاندن و لە ناوبردنی دارستان و ڕەزو باخی کورد ، نیشتەجێکردنی عەرەب لە شوێنی کورد زیاتر هیچی دەست نەکەوت ، بەکورتی قڕکـردن و لە نـاوبردنی گەلـی کـورد و کـاوڵکردنی کوردسـتان و بەعەرەبکردنی کورد ، میلەتی کورد لەو تاوانانە لە عەرەبی برای زیاتر چی دەستکەوت... ؟.

کە هەموو ئەم تاوانە بێوێنانە دژی نەتەوەی کورد ئەنجامئەدران لەولاوە (دۆستانمان لەهاو پەیمانان و دەوڵەتانی بەناو ئیسلامی و برایانی موسوڵمان و دەستگاکانی مافی مرۆڤـایەتی وڕێکخراو ناوەندەکانی مافی مرۆڤ و نەتەو یەکگرتوەکـان و مـرۆڤ دۆسـتان لەو لاوە سـەیر کەربوون ورتەیان لێوە نەهات .

کە ئەم تاوانانە نەئەگونجـان لەگەڵ نـامەو شـەریعەتەکانی ئاسـمانی و مرۆڤـایەتی و یاسـای نێودەوڵەتی کەتاوانێکی مرۆڤایەتی بێوێنەبوو.

بەدرێژایـی مێـژووی سـەردەم هەرچـی تێکۆشـان و جـوڵان و ڕاپەڕیـن و شۆڕشـی کـورد کە بەرپائەبوو زۆری بۆ بەرگری بوو لە مان و نەمانی کورد هەمـووی دائەنـران بەفیتـی بێگـانە ئەنجامدرابێت ، ئێمە پیاوی بێگانەبێن ( بەڵام زۆر جاربیرمان ئەکـردەوە کـام بێگـانەیە کە ئەوەنـدە دڵـسۆزی کـوردە تـائێمە لە پێناویـدا خـوێن برێـژین و خۆمـان بەکوشـتبدەین بـۆی لەپێناویاندا بجەنگین و بەهانایانەوە بێین ،تابزانین ئایا چیان بەسەر هاتوە ورزگاریان بکەین ...؟، ئەوان هەردەم حاکم وسەرکەوتووبوون زاڵم و دەست درێژکەربوون بۆمافمان ،. یـان تاوانباریان ئەکردین کە لە دین وەرگەڕاوین و کافرین ، مافی خۆیانە چیمان لێبکەن .

شـۆڕش و ڕاپەڕێنەکـان لەلایەن هەمـوو سـەرکردەو ڕابەران و دڵـسۆزانی کـوردە لـەشـێخ عەبدوالقادرەوە ولە شێخ مەحمودەوە تا مەلامستەفای بارزانی وسەرکردەکانی کەی کورد بە یاخیبوون ، دواکەوتن وچەتەگەری وەرگەڕان لە دین باسئەکراو ، بەپەنجەو بەفیتی ئینگلیز بەرپـابوون ، بەپـێچەوانەوە ، بەریتانیـا لە مێـژووی سـەردامدا ڕۆڵـی سـەرەکی هەبـووە لە دژایەتیکردنی کورد ودامرکاندنەوەی هەموو جوڵان و داواکاری و ڕاپەڕێنەکان و شۆڕشـەکانی کورد ، بەردەوام ئینگلیز لەپێش دوژمنانەوەبووە لەوبوارانەدا کەزۆر لە نووسراوو دۆکـۆمێنتە بەجێماوەکان بەئاشکرا ئاماژە ئەدەن بەم ڕاستیانە باشترین بەڵگەن و تادوای شۆڕشی ١٤ تەموزیش ئینگلیز هەر لە کاری دوژمنانەی خۆی نەکەوتبوو .

ئـێمەی کـورد کەبەزۆری توشـی دەردو سـتەم و جەورو ئـازارو کۆمەڵکـوژی (جینۆسـاید ) وکیمیاباران و ماڵوێرانی و ڕەوپێکردن و ئەنفالبووین و کاولکردنی کوردستانمان بەخۆوەدیوە و چێـشتوە و تـائەمرۆژ پێـووەی ئەتلێیـنەوە لە ئەنجـامی ژێردەسـتەیی و دابەشـکردنی خاکەکەمانەوەبووە لە لایەن کۆلۆنیالیزمی جیهانی و دوژمنانی دراوسێووەبووە یەکێک لەهۆیە

**بنەڕەتیەکانی تر ئەگەڕیتەوە بۆکێشەی ناو خۆمان ، ئەوەبوو کەماڵی کورد یەکنەبووە یەکڕیز نەبووین هێزمان یەکنەخستوە بۆیە دەوڵەتی سەربەخۆمان نەبووە سەروەریمان لەدەستداوە و دوژمنان بەئاگرو ئاسن حوکمیان کردوین .**
**ئەرکی سەرشانی ڕۆڵەکانی گەلەکەمانە و هەموو پارت کۆمەڵ و ناوەندو ڕێکخراوە کوردیەکانە بۆ ئەم ئاواتە پیرۆزە یەکرێز خەباتبکەن ، ئەگەر بیرو بۆچوون باوەڕیان و لایەنیان لەگەڵ یەکدا جیاوازییان تیاهەبێت بەلآم لەکاتی چارەنووسیدا یەک بڕیار وپرۆگرام و یەک هەڵوێست بین.**





**له ئەفسەره بەناو بانگەچالاکەکانی شۆڕشی ١٤ تەموز**
**مستەفا عەبدوڵڵە و حەمەعەلی خاڵە .**
**لەگەڵ فەتاح شالّی ئەندامی دادگای گەل کە ئفسەرێکی پلە داربوو بەناوی ئەفسەرە**
**سەربەستەکانی شۆڕش ناویان دەرکردبوو**

# بیرەوەری دەربارەی دۆخی سیاسی کوردستان پێش شۆڕشی چواردەی تەمموز ١٩٥٨ و دەور و کاری لاوان

**هەرلە ساڵەکانی دوای شکستی کۆماری کوردستانەوە لەمەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، بزوتنەوەی کوردایەتی لەهەموو پارچەکانی کوردستاندا بەنهینی بەرەوپێشەوە ئەچوو ، جار جارە ڕەوتێکی بەهیزتری بە خۆوە ئەدی ، لەوماوەیەدا گۆڕانکاری زۆرو هەمەجوۆڕ ڕویدەا لە ناوچەکەدا کە کاریکردە سەر ڕەوتی جولانەوەی خەڵکی کوردستان ، بەرەوڕ زگاری و ئازادی ، بەتایبەت خەڵکی بەزۆری لەدەوری ئەو هێزە ئازادیخوازانەدا زیاتر کۆئەبوونەوە ، کە پشت بەستوبوون بە بیرۆکەی (مارکسی _ لینینی ) ، پارتەکوردستانیەکان لەورووەوە کێبرکێیان بوو هەر لایەنە ئیدیعای ئەکرد کە ئەوان زیاتر پەیڕەوی ئەکەن ، هەندێکیان گونجانبوویان لە گەڵ بیروجوڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی گەلی کوردستان . لەوماوەیەدا دو پارتی سەرەکی لەخەباتدابوون :**

**یەکەم پارتی دیموکراتی کودستان : کەخەباتی ڕزگاری خوازی نەتەوایەتی ئەکرد بەمەبەستی گەیشتن بەسەربەخۆیی گەیشتن بەچارەنووسی نەتەوەیی بەڕابەری مەلا مستەفای بارزانی کەهێشتا لە یەکێتی سۆڤێت پەنابەر بوو .**

**دوەم پارتی کۆمۆنیستی عێراقی : کەخەباتی چینایەتی ئەکرد لەشێوەی سۆڤێتی، لەسەرو ئەمانەوە هەندێک گروپ و لایەنی نەوتەوەیی و ئیسلامی هەبوو ، بەڵام وەک هەردو پارتە**

سەرەکیەکە ئەوکاریگەریەیان نەبوو ، کۆمۆنیست بەردوام بوو لەخەباتی چینایەتی بڕوای وابوو کورد لەورێگەیەوە بەئاواتی ئەگات نەک لەڕێگەی جوڵانەوە ڕزگاری خوازی نەتەوەیی ، بەوهۆیەوە بەرامبەری و کێبڕکێ بەردەوامبوو لەنێوانیاندا لەگەڵ ئەم دو پارتە سەرەکیە گروپ و ناوەندی نەتەوەیی و ئیسلامی و چالاکی لاوان و خوێندکاران هەبوو.

لەبەشی عەرەبستانی عێراقێش پارتی هەمە جۆرو هەڵگری بیرو ڕای جیاواز هەبوو وەک نەتەوەیی وشۆڤێنی ڕگەزپرستی و ئیسلامی ومام ناوەندی ودیموکراتی و بەعسی کەزۆریان لەو ئاستەدانەبوون کە کورد هیوای پێیان بێت .

لە وسەردەمەدا واباو بوو زۆرترین لاوەکان خولیا وسەرگەرمی سیاسەت و خوێندنەوە خۆ شارەزاکردن بوون وخەریکبوون لەهەموو ڕویەکی زانیاریەوە شارەزابن کە ڕاژە و بەرژەوەندی و نەتەوەی کوردی تیابێت ورێگەیەکی ڕوونی تیابەدیبکەن خزمەتی نەتەوەی کورد و بیری رزگاری خوازی پێبکەن ، تاهەریەکەیان وەک تاکە کەسێکی شیاو ئامادەو ڕۆشنبیر و شارەزا ڕۆڵی خۆیان ببینن لەڕیزی خەباتگێران وشۆڕشگێڕان وتێکۆشەراندا .

لێرەدا کە ئەم باسانە ئەکەین نمونەی لاوێکی ساڵەکانئ پەنجاکان ئەهێنینەوە یاد کە هەردەم لە خەمی نەتەوەکەیاندابوون ونمونەی دڵسۆزیبوون بۆنەتەوەکەیان .

وەک هەموو لاوێکی کورد هەرلەساڵەکانی ١٩٤٨ بەدواوە کەخۆم ناسی و کەوتمە سەربیری نەتەوایەتی وئازادیخوازی بەهۆی مامۆستایانی کوردپەروەرو دڵسۆزی ئەوکاتەوە لەقوتابخانە ، منیش یەکێک بووم لە لاوە تازە پێگەیشتوانە وخولیای خوێندنەوە کەوتەسەرم کە باسئەکرا کورد کۆمارێکی بەخوێن ئاودراوی وەک کۆماری مەهابادی لە کیسچووە ، بەهوی پیلانی نێودەوڵتی ودوژمنانی کۆنە پەرستی ناوخۆوە ، هەستمئەکرد کە هەموو نەتەوەکانی دەوروپشت خاوەنی دەسەلآت و دەوڵەتی خۆیانن سەربەستن هەرئێمە ژێردەستەین دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان نایەڵن بەزمانی خۆمان بخوێنین و بنووسین وەک نەتەوەیەکی هاوشانی ئەوان بەسەربەستی بژین وپێشبکەوین خاوەن بڕیارو دەسەلآتی خۆمان بێن.

وردە وردە خەریکبووم خۆم سازئەدا و پرسیارم ئەکردو لە کتێبخانەی گشتی هەردەم ئامادەبووم کتێبم ئەخوێندەوە تاوتوێی بیرو زانیاریەکانم ئەکرد بەتایبەت بەشی مێژوویی.

لەکاتانەدا هەمووڕۆژێک کوردپەروەران وئازادیخواز و خاوەن بیری پێشکەوتوو خۆپیشاندانیان ئەکرد بە تایبەت لە ناوەڕاستی بازاڕ لە دەوری حەوزە وشکەکەو خوارتر منیش هەردوم بە پێویستی سەرشانم ئەزانی هاوبەشێ بکەم کە بەزۆری لەلایەن پارتی (تەحەرور کۆمۆنیستەکان) وە ئەنجامئەدرا،لەوکاتانەدا هەرەتی لاویم بوو زۆر دڵخۆشبووم وشانازبووم کە لە گەڵ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم بێدواکەوتن لەڕێزی تێکۆشاندابم .

هەردەم خەریکی خوێندنەوەی مێژووبووم بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە نەتەوەکەمەوە هەیە تاباش شارەزای مێژوو خەبات و بەسەرهاتی نەتەوەببین ، خەریکی خوێندنەوەی نووسراو بڵاوکراوە بووین . دەربارەی خەبات و ئامانج و ئاواتی نەتەوەکەمان و بەراوردکردنی لە گەڵ هی نەتەوەکانی کەدا تابتوانین شارەزابین و سود وەربگرین لەئەزموون و تاقیکردنەوەیان وانە وەربگرین لە هەڵەو پەندە مێژووییەکان، لەلایەکیکەوە لامان باشتربوو کە مێژووی خەبات و تێکۆشان و شۆڕشی زۆر لەکەسایەتی جیهانی بخوێنینەوە بۆ شارەزابوون لە هۆی سەرکەوتن ونەهێنیەکانی .

هەوڵدان بۆ شارەزابوون لەژیان و خەباتی نەتەوەکانیکە وهۆو شێوەی سەکەوتنیان وگەێشتن بە سەروەری وئەنجامی خەباتیان کەزۆریان لەئەنجامی شۆڕشیان و هەڵ وتێکۆشان وخەباتیان ئەمڕۆ لەژێر سێبەری سەروەری دەوڵەتی سەربەخۆیاندا ئەژین ، سەروەریان بەدیهیناوە ،لەخاکی تایبەتی خۆیاندا ئەمرۆ بەسەربەستی ئەژین.

هەروەها لە ئەنجامی وردبوونەوەو هەڵسەنگاندنی پرس وکێشەی نەتەوەی کورد کاریگەریەکانی ناوەوە و دەرەوە لە سەری وهۆی پەرەوازەبوون وکزی و سەرنەکەوتنی وبندەستی و هۆی دابەش بوونی، لە پرسیاردا ئەمان وت ئەی چیبکەین باشە ...؟.

ئەمانە هەموو لەبیرو هەستی لاوان ورۆشنبیران و سیاسەتمەدارو سەرکردەو خاوەنبیرەکاندا پۆنگی ئەخواردەوەو کە منیش یەکێکبووم لەو لاوانە هەردەم تاوتوێی ئەم بیرو بۆچوونانەم ئەکرد وەک ئەوهەموو کورد پەروەرو و لاو و رۆشنبیرانە .

دوایی بەبیری خۆم بەقەناعەتەوە هاتمە سەر ئەو ئەنجامە کە ئێمەی کورد ، ئیتربەسە ، ئەبێت بە خۆمانەوە خەریکبێن ، بۆ دوارۆژ وچارەنووسی نەتەوەکەمانەوە خەریکبین و خەبات بکەین ، باهەموو چین و توێژەکانی نەتەوەکەمان بەهەموو خەرێکبین یەک ڕێز بێینە کۆڕی خەباتەوە بۆرزگاری کوردو خاکی کوردستان ، بیرو باوەڕ وکاروخەباتمان بۆ سەرکەوتنی نەتەوەکەمان بێت ، ئەبێت هەموو لە کاروانی خەباتدا بەجوڵانەوەی رزگاری خوازی نەتەوەی کوردەوە بەردەوام خەریکبین ، کەکورد ئەمرۆ لەقۆناغی رزگاری نەتەوەییدایە ، نەسرەوین تاکورد ئەگاتە کەناری رزگاری و سەربەستی و ئازادی و سەرفرازی .

کە کورد گەیشتە ئەوئاستە هەر لایەک سەربەستە، چۆن ئەیەوێت لەچوار چێوەی دڵسۆزی نەتەوایەتیدا سیاسەت و کردارو رەفتاری ئەنجامبدات ،ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو یەکبیرو یەک هەنگاوبین تەنها مەبەست ئەوەیە ، لە ئاستی خواستی نەتەوەیی وبەرژەوەندی بەرزی نەتەوایەتی وئاسایشی نەتەوەیی و چارەنووسیدا یەکرێز وئامادەبین.

باهەموو ڕیکخراو وپارت و ناوند و خاوەن بیر بەرەو ئەو ئاواتە پیرۆزە بکەونەڕێ ، باخاوەنی بیرو ڕای جیاوازیش بن کە بیری ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی ،لە کارە بنەڕەتی و گرنگەکانی ئەم سەر دەمەیە ، ئێمەی کوردیش لەو بوارەدا زۆر دواکەوتوین ، گەلانی جیهان دەمێکە ئەو قۆناغە بنەڕیتیە گرنگەیان بڕیوە کەچی ئێمە تازە گومان لەوەدا ئەکەین ، ئایاکورد (ئوممەیە ) یان نا ،؟ گومان لەوەئەکەن کە مەرجی ( ئوممە ) مان تیانەبێت ، کە مافی چارەنووس و سەروەری شآدبوون بەدەوڵەتی سەربەخۆ لەخاکی نەتەوەییمان کە کوردستانە پێ ڕەوانابینن .

هاتمە سەر ئەوباوەڕەی کە ئەرکی سەرشانی هەموو کوردێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەرە و خاوەن بیری پوختە بزانێت ئەوەی لە بەرچاو بێت کە جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی لە سەرو ولەپێش هەموو خەباتێکی ترەوەیە .

لە ساحەی کوردستانیدا ئەو دو پارتە سەرەکیە هەبوون ( پ ، د ،ک ) بەناوی پارتیەوە. (ح ،ش ، ع ) بە ناوی تەحەرورەوە ناوی دەرکردبوو کە لەوەپێش خۆیان ڕێکخستبوو ئامادەبوون بەنهێنی کاریانئەکرد . لە مەیداندا بوون بەشێوەیەکی نهێنی کەوتبوونە چالاکی وهەڵسوڕاندنی کاری حیزبایەتی. لەگەڵ ئەمانەشدا یەکێتی خوێندکاران دەوری چالاکی خۆیان ئەدی کەهەر حیزبە یەکێتیەکی سەر بەلایەنی خۆی ڕیکخستبوو کە دەری چالاکیان هەبوو لەناو لاواندا .

هەرلە ڕوژانی سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ تەموزەو هەرلایەک کەوتنە چالاکی و ڕاکێشانی زۆرترین کەس بۆناو ڕێکخراوەکانیان بەم شێوەیە جۆرێک لە کێبرکی و بگرەو بەردە دروستبوو لە نیوانیاندا کە لە هەموو جیهاندا ئەبێتە کارێکی سروشتی ئەوکێبڕکێیە هەیە بەلام هەرلایە ڕێز لەلایەنەکەی کە بگرێت بەتەبایی و برایەتی و پێکەوە ژیان

بەوشێوەیە خەبات و تێکۆشانی پارتە نهێنیەکان وڕۆڵەکانی گەلی کوردستان بەهەموو چین و توێژەکانیەوە بەردەوام بوو ، تاشۆڕشی ١٤ تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ ، کەبزوتنەوەی کوردایەتی وجوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد ، گوڕان وڕەوتێکی بنەڕەتی نوێی بەخۆوە دی ، خەلک و جەماوەرێکی زۆر لەدەوری هیزی ئازادیخوازو نەتەوەییەکەی کۆبوونەوە ، کورد پەروەران و ئازدیخوازان زیاتر خۆیان سازدا بۆ پەرەپێدانی و گەشە پێدانی وبەهێزکردنی و بەرەو پێشبردنی بیری ئازادیخوازی (نەتەوەیی) وجوڵاندنەوەی ڕزگاری خوازی نەتەوەی کورد بەمەبەستی گەیشتن بەئامانجی کە برێتی بوو لەسەر بەخۆیی و مافی چارەنووسی کە سەدەها ساڵە کورد لەپێناویدا ئەجوڵێت و ڕائەپەڕێت و شۆڕش بەرپائەکات وخوێن لەپێناویدا ئەڕێژێت ، کەمافێکی ڕەوای کوردە وەک هەموو نەتەوەکانی کەی ئەم جیهانە .

لەوسالانەدا گۆڕآنی بنەڕەتی و هەمە جۆر ڕویدا لەناوچەکەدا کەکاریگەری و ئەرێنیان هەبوو لەسەر گەلانی ناوچەکە و هەژاندنی و وروژاندنی ڕەوتێکی نوێیان دا بەخەبات و جولانەوەی نەتەوایەتی و ئازادی خوازی گەلی کوردسستان

هەرلەسالی ١٩٥٦ دا کۆدەتایەکی سەربازی لەمیسر ئەنجامدرا بەڕابەری جەمال عەبدو الناسر ئاوەلەکانی کاری گەری ئەرێنی کردە سەر جولانەوەی ڕزگاری خوازی گەلانی ناوچەکە ، هەر لە میسر لەوکاتانەدا جولانەوەی ڕزگاریخوازی گەلان ڕەوتێکی نوێی دیاری تری بە خۆوە بینی وەلک ( جوولانەوەی دەولەتانی ێێلایەن ) کە جەمال عەبدولناسر و ئەحمەد سۆکارنۆی ئەندەنۆسیاو و تیتۆ لە یۆگۆسلافیا پێش ڕەویان ئەکرد ، لە لایەکیکەوە جولانەوەی چەپڕەوی کۆبا بەسەرکردایەتی کاسترۆ . کاریگەریان هەبوو لە سەر پێش خستنی بیری ئازادی خوازی گەلان بۆجولان وڕاپەڕێن . بەتایبەت لە ڕۆژهەلاتی ئاسیاو ئەفریکاو ئەمریکای لاتین . لەئێرانیش جولانەوەکەی دوکتۆر موسەدەق ئاسەواری هەرمابوو .

لەسالی ١٩٥٧ دا میسرو سوریا لەیەکێتیەکی کۆنفیدرالیدا یەکێان گرت کەمەترسی هە بوو بۆسەر ناوچەکە بەتایبەت بۆ سەر ڕژێمی پاشایەتی لەعێراقدا .

لەبەرامبەردا چەند مانگێک ،پێش شۆڕشی ١٤ تەمووز ( ئیتحادی هاشمی ) ڕاگەیەندرا ، ڕژێمی پاشایەتی عێراق لەگەل ڕژێمی پاشآیەتی ئوردنی هاشمی یەکیانگرت و کەمەبەستی سەرەکی بەرامبەر بە یەکگرتنەکەی سۆریاو میسربوو ، ئەوەبوو لەسەرەتای سالی ١٩٥٨ دا هەردولا لەژێرحکومەتێکی کۆنفیدرالی یەکڕژێم و یەکئالادا یەکیانگرت بوونە یەک حکومەت بە دو ولایەت یەکەم ولایەتی عێراق دووەم ولایەتی ئوردن ، (شافەیسەلی دووەم )بووە شای هەموو ، (شاحوسەین ) بووە شآی ولایەتی ئوردن . نوێنەرانی کورد لەپەرلەمان و زۆرئاستی تردا ، کەوتنە دواکاری ، جەماوەرێکی زۆری کورد و سەرۆک هۆزەکان ،یاداشتیاندا کە ئەبێت کوردستان بکرێتە ولایەت وپاشانشینی سێیەم لەو یەک گرتنە هاشمیەدا ، وەک لە کاتی خۆیدا دەنگۆ یەک هەبوو داواکاری هاتەکایەوە کە بەنیاز بن کوردستان بکەن بەولایەتی سێیەم ،خالی شآفەیسەل (وەسی عەبدولئیلاه )ببێتە شآی (ولایەتی کوردستان).

هەرلەکاتی دروستبوونی ئیتحادی هاشمی ڕۆشنبیران و کوردپەروەران و هەندێک لەئەندامانی پەرلەمان ئەندامانی پارت و ڕێکخراوە نهێنیەکان وکەسایەتی کەوتنە خۆ بۆ بە دەستهێنانی گفت و وشەو پەیمانێک بدرێت بەکوردو دلنیابکرێت و مافی وەک نەتەوەیەک پارێزراو بێت لەدەستوری نەیدا بەڕونی ئاشکرا ئاماژەی پێدرابێت. هەندێک لە کە سایەتی و لایەنە کوردیەکان لە پەرلەمانی عێراق بە تایبەت کەسی ناودارو خێرخوازی کورد عەلی کەمال باسی ئەوەی کردبوو کە ئالای عێراق دو ئەستێرەی تیایە یەکەم هێمایە بۆ نەتەوەی عەرەب دووەم

هێمایە بۆ نەتەوی کورد ، باشتر وایە کوردستانیش بکرێت بە ولایەتی سێیەم لە ئیتحادی هاشمی نوێدا . کەکورد نەتەوەیەکی جیاوازە لە عەرەب نەتەوەیەکی ڕەسەنی مێژووی ڕەگداکوتاوە ،لەخاکی تایبەتی خۆیدا ژیاوە ، تایبەتمەندی خۆی هەیە و لە بەڵگەنامەو ئاگاداری و نووسراوەکانی نەتەوەیەکگرتوەکاندا ئاماژەی پێدراوە .

بۆبێدەنگکردنی کوردو فریودانی وخاوکردنەوەی لەسەر داواکاری ، دوایی (ئەحمەد موختار بابان ) کەلە (بنەماڵەی بابانی بوو)کرایە سەرۆک وەزیرانی پاشایەتی یەکگرتوی نوێی ( ئیتحادی هاشمی ).

وەک لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا ئیتحادی هاشمی ئەوەندەی نەخایاند نەژیا بەهۆی بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ تەموزەوە تەخت و تاراجی تێکدرا.

هەرلەورۆژەدا مەلیک فەیسەڵ کوژرا لە گەڵ خاڵیدا ( وەسی ) عەبدولئلاە . لەوشۆڕشەدا زۆرلە ئەفسەرانی کورد ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو لە سەرخستنی شۆڕشەکەدا وەک فەتاح شاڵی و ڕەئیس مستەفاو عەلی خاڵە،،،،، وژمارەیک لە ئەفسەرانی کەی کورد. بەسەرکەوتنی شۆڕش ، لاوانی کوردو ڕۆشنبیران و ئەندامانی پارتە نهێنیەکان و ناوەندو ڕێکخراوە جەماوەریەکان هاتنە مەیدانی تێکۆشآنی ئاشکراو خۆڕێکخستن .



ڕەمزی قەزاز کەمامۆستایەکی ڕۆشنبیرو کورد پەروەر بوو

## شۆڕشی ١٤ی تەموز وساڵەکانی دوایی

کاتێک شۆڕشی ١٤ تەمووز بەرپابوو ( لەڕاستیدا هەڵگەڕانەوەیەکی سەربازی لەپڕ بوو ) بەسەرکردایەتی زەعیم عەبدولکەریم قاسم  دژی ڕژێمی پاشایەتی هاشمی عێراق .

نەتەوەی کورد بەهیوایەکی نوێ وئاشتی ودیموکرات خوازەیەوە باوەشی کردەوە بۆشۆڕشەکە، لاوانی دڵسۆزو نیشتمان پەروەرو خوێنگەرم وڕۆشنبیر کەوتنەخۆیان  لەدەوری یەکتر کۆبوونەوە ، خۆیان ڕێکخست بەنیازی ئەوەی لەم بارو دۆخە نوێیەدا بتوانن خزمەتی نەتەوەکەیان بکەن و دوزو کێشەو ئاڵیشەی کورد لە ناوەوە دەورەوەی وڵات بخەنە سەرمێزی لێکۆڵینەوە بە ئامانجی دەستکەوتی لە دەستچوویان بە هۆی حوکمی پاشایەتی عێراقەوە،    ڕابەری نەتەوەکەیان بکەن  بەرەو ئازادی و سەرفرازی ،  بارەکە بگونجێنن لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوەیی کورد دا، تا هەموو داخوازیەکانی نەتەوەی کورد و چارەنووسی لەم کەش هەوا تازەیەدا  لەژێر سێبەری کۆماری نوێدا بەدەست بهێنن .

قسەر باس و لێکۆڵینەوە لەزۆر ڕووەوە هاتە ئاراوەو دەستکرا بەگرتنەبەری ڕێگەی گوناجاو بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزەی کورد..

لەلایەکی کەوە دوژمنانی کوردو گەلی عێراق کەوتنە قسەوباس و مقۆ مقۆ  دوژمنایەتی دژی داواکاری و داخوازی کوردو هەنگاوەکان بەرەو دیموکراتی، لەولاوە دۆستانی کوردو گەلی عێراق لەجیهاندا  ئەم بارە نوێیەیان بەدڵ بوو.

کوردیش هەرلەڕۆژانی یەکەمەوە کەدی هەندێ هەنگاو وهەڵس و کەوت و هەڵوێستی سەرکردەکانی شۆڕشی ١٤ تەموز گفت و وشەکانیان وکرداریان بەرامبەر بەدۆزی کورد  ئەرێنیە بەهەموو  بوونە هۆی ئەوەی ببنە جێگەی  متمانە، کورد بڕوایان پێبکات ببێتەمایەی هیوای ودڵنیایی ، ئاسایی سەیری بارەکە بکات.

چەند ڕۆژێک بەسەر شۆڕشەکدا تێپەڕی سەرکردەو ڕابەرانی کورد پارتە سیاسیەکان بیریان لەوەکردەوە کە خۆیان ئامادەبکەن بە ناوی نوێنەرایەتی کوردەوە وەفدێک ڕێکبخەن ئەندامانی لە هەموو چین و توێژەکان پێکهاتبێت بەرەو بەغدا بە ڕێببن بۆ پشتگیری و پیرۆز بایی لە سەرکردەکانی شۆڕشی نوێ و پێشکەشکردنی داواکاری نەتەوەی کورد ، کەپێشنیاز کرابوو حوکمی زاتی {ئۆتۆنۆمی} بۆکوردستان دیموکراتی بۆعێراق لە چوارچێوەی عێراقی دیموکراتیدا جێبەجێبکرێت.

بۆ ئەومەبەستە بەڕێز ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری یەکەمی پارتی دیموکراتی کوردستان زووتر لە بە غدادبوو، ئامادەبوو ، (لە هۆتێل ترۆکادیرۆ) لە سەر شەقامی ڕەشید دانیشتبوو چاوەڕوانی نوێنەری هەموو شارەکانی کوردستان بوو لە ڕۆژی دیاری کراودا بگەنە بەغداد کۆببنەوە بەهەموو بەرەو( وەزارەتی دیفاع ) بەڕێببن کە بنکەی سەرەکی سەرکردەکانی شۆڕشی نوێبوو ، بۆ پیرۆزبایی و وپشتگیری لەشۆڕش و پێشکەشکردنی داواکار نەتەوەی کورد .

هەموو ڕۆژێک بەڕێز ئینراهیم ئەحمەد ڕەشنووسی داواکاریەکانی ئە خوێندەوە و خەڵکی بیروڕاو پێشنیازیان پێشکەشئەکرد لەو لاشەوە بەڕێز ( ئەحمەد غەفور ) ئە بینرا وەک (نوێنەری پارتی کۆمونیستی عێراق ) لەگەڵ هەندێک لەهاوڕێیانی لەوناوە ئامادەبوون . چالاکی خۆیان ئەنواند ، داواکاریەکان بەناوی هەموو نوێنەرانی نەتەوەی کوردەوە بوو کە بەیەکڕیزی پێشکەش بکرێت.

لەڕۆژانی ٢٣ / ٧ /١٩٥٨ تا ڕۆژی ٢٦/ ٧ / ١٩٥٨ بەڕێز ئیبراهیم ئەحمەد ڕۆژانە هەرخەریکی وردکردنەوە وباسکردنی خاڵەکانی داواکاریەکان بوو ، جەماوەرێکی زۆر ڕۆژانە سەردانیانئەکرد ، بڕیار درابوو لە بەیانی ڕۆژی ٢٦ /٧ /١٩٥٨ نوێنەرانی کورد لە هەموو شارو شارۆچکەکانەوە بەجلی کوردیەو ئامادەبن ، هەرشارە بەشێعار و دروشمێکەوە کە ناوی شآرو شآرۆچکەکەیانی تیانووسراوە بەدەستەوەبێت بەرز کرابێتەوە ، هەرپۆلە بەسواری قەمەرەوە ئامادەبن .

لەکاتی دیاری کراودا لەبەیانی ئەوڕۆژەدا سەدەها سەیارە بەکرێگیرابوو ئامادەکرابوو ، لە لایەکی شآرع الرشێد بەڕێز وەستابوون پڕبوون لە نوێنەرانی کورد لە هەموو شوێنەکان شارو شارۆچکەکانی خواروی کوردستان، لەکاتی دیاریکراودا لە بەردەم هۆتێل ترۆکادیرۆوە بەڕێز وەک کاروان بەرەو وەزارەتی بەرگری کشان کە (لە باب المعزم) بوو .

بەڕاستی وێنەیەک و خۆپێشاندانێکی بێوینەبوو کە هەرگیز لەبیرمان نەچێتەوە ، پیاو موچڕکی خۆشی بەلەشێدا ئەهات و چاوی پڕئەبوو لەفرمێسک و قوڕگی وشک ئەبوو کە ئەو دیمەنە

پرشکۆیەی نوێنەرانی کوردی ئەدی یەکریز ،هەردەم هەموو هاواریانئەکرد : بژی کورد ، بژی کوردستان، بژین سەرکردەکانی شۆرش و کورد، بژی شۆرش ، بژی کوماری نوێی کوردو عەرەب خەکی بەغدادێش لەهەردولای جادەی رەشێد وەستابوون چەپڵە رێزانیان بوو ،کە یەکەم جارە ئەونومایشە بەوشێوەیە بەرێوەبچێت.

کاتێک کاروانی نوێنەرانی کوردستان گەیشتە بەردەرگای وەزارەتی بەرگری ، پێشوازیکراین و دەرگای وەزارەت کرایەوە هەموو بەسواری ئۆتۆمۆبیلەکانەوە چووینەژورەوە لە گۆرەپانی بەربڵاوی ناو وەزارەت وەستاین لە بەردەم تەلارێکی بەرزدا دابەزین ، بەرێز ئیبراهیم ئەحمەد و هاورێکانی لەسەرکردایەتی لە پێشمانەوە بوون، هەموو چووینە ناوهۆڵێکی گەورەوە لە بەردەمیدا شانۆیەک هەبوو.

. بەرێزان ئەندامانی رێکخەر لە بەردەم شانووکەدا لەپێشەوە وەستان وتەبێژو شاعیرو ئەدیب و شۆرشگێرو هەڵکەوتوی کورد (کامەران موکری ) لەپێشەوە وەستابوو وتیان تەنها بەرێز کامەران هوتاف ئەدات هەموو لەگەڵیدا دوبارەی ئەکەنەوە .

لەپر زەعیم عەبدوالکەریم قاسم لە دەرگایەکی سەرشانوەکەوە هاتەدەرەوە کە دەرکەوت ودەستی بەرزکردبووەوە بەخێر هاتنی ئەکردین و سەلامی ئەکرد، دیمان هیلاکی و ماندویەتی بەدەم و چاویەوە دیاربوو، دەستکرا بە هوتاف و پیرۆزبایی بۆشۆرشی نووی، لەدوای ئەو بەرێزان ئەندامانی (مجلس السیادە محەمەد نەجیب الروبەیعی و خالد نەقشەبەندی و محەمەد حەدید ) لەگەڵ مەهداوی یەک لەدوای یەک پەیدابوون بەریز وەستان دەستیان بەرز کردبووەوە سڵاویان ئەکرد.

بەرێز ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتی چوونە پێشەوە بۆپیرۆزبایی و گەیاندنی پشتگیری نەتەوەی کورد، بە سەرکردەکانی شۆرشی نوێ ویاداشتێکی نووسراوی بەدەستیەوە بوو، لەولاوە لاوی خوێن گەرمی کورد کامەران موکری هوتافی شێاوی دوبارەئەکرەدەوە .

دوای تەوقەکردن و مجامەلەی شیاوی ئەو موناسەبەیە، ئەو یاداشتەی کە بەدەستیەوبوو کە داوا کاری نەتەوەی کوردی تیا بوو ، پێش ئەوەی پێشکەشی بکات، بەدەمی چەند وشەیەکی دوبارەکردەوە،ئەبێت مافی کورد وەک نەتەوەی دووەم لەعێراقدا لەهەموو ئاستێکدا رەچاوبکرێت، کە ئومەی کوردی دوەم نەتەوەی خاوەن خاکی عێراقە .

دوایی بەرێز ئیبراهیم ئەحمەد دەستیکرد بەخوێندنەوەی یاداشت و داواکاریەکانی نوێنەرانی کورد ، بەهیوای ئەوەی لەکۆماری نووێدا کورد وەک نەتەوەی دوەم لەدەستوری نوێدا مافی دیاری کرابێت کە بەرێوەیە بەنیازن کاری بۆبکەن ودابنرێت .

لەنیوان خوێندنەوەی داواکاریەکاندا بەرێز ئیبراهیم ئەحمەد چەندجارێک دووبارەی کردەوە ئیتر بەسە، بەکوردستان بووترێت ( شیمال العێراق ) ئەبێت لەنەخشەو نووسراوە فەرمیەکاندا ناوی

کوردستان بنووسرێت وەک لە لەیاداشت و داواکاریەکاندا هاتبوو ، کورد نەتەوەی دووەمە لە عێراقدا بەشێکە لەکوردستانی گەورەی پارچەکراو ، کورد مافی خۆێتی وەک هەموو نەتەوەکانی جیهان مافی چارەنووسی بەدەستخۆی بێت .

ئەمرۆ مافی ئۆتۆنۆمی پێرەوایە و بەباشی ئەزانێت بۆ ئـەم قۆناغـە لە چوارچێـوەی عێراقـی دیموکراتدا

دوای تەواو بوونی بەرێزی لە خوێندنەوەی یاداشت و داواکاریەکاندا ، پێشکەشێ عەبدولکەریم قاسمی کرد کەسەرۆک وەزیران و فەرمانده‌ی گشتی وشۆرش وهێزە چەکدارەکانی عێراق بوو عەبدوالکریم قاسم بەرێزەوە یاداشتەکەی وەرگرت.

ئەنجومەنی سەروەری عێراق (مەجلس السیاده العراقیه ) پێک هـاتبوو لە مـحەمەد نەجیـب الربیعی سەرۆکی ئەنجومەن بوو بەئەندامێتی خالد نەقشبەندی و محەمەد حەدید ، بەرویەکی خۆشە وە پێشوازیان لەو ئاداشت نامەیەکرد ، دوای مـاوەیەکی کەم و لـەپێـشکەشکردنی و هوتاف دوبارە کردنەوەی وپشتگیری نەتەوەی کورد بۆ شۆرش و سەرکردەکانی.

لەورەمدا عبدولکەریم قاسم کەوتە قسەو بەخێرهاتنی گەرمی نوێنەرانی کرد ودڵنیای کردین کە ئەوەی داواتانەو چاوەروانین دێتەدی کورد وعەرەب بـران ئەم خـاکە هـی هەموومـانە . بەم وشەیە مانایە

وتارەکەی دەستپێکرد :

( یائەبناء الشمال اهلا وسهلا بکم ،انتم اهلنا اخوتنا لقد اختلت دماءنا بدماءکم، انتم ئیخوتە العرب)، بەکوردی یانی: ئەی رۆڵەکانی شیمال بەخێـر هـاتن، ئێـوە برامـانن کەسمانن خوێنمان تێکەڵاوبووە ، ئێوە برای عەرەبن. لەسەری رۆیشت درێژەی دایە وتی : بەدرێژایی مێژوو هەردولا وەک برا بەیەکەوە ژیاوین وکەسی ئێمەن خۆێنمان تێکەڵاوبووە مافتان پارێزراوە و ئەپارێزرێت، وتی بەیانی (کە رێکەوتی ١٩٥٨/٧/٢٧ ) دەستوری کاتی لەهەموو روژنامەو دەستگاکاندا ، بڵاوئەکەینەوە دەبینن ، لەبرگەی ( ٣ ) دا هاتوە کە (کوردو عەرەب) شەریکن لەم خاکەدا ، لەگەڵ ئەم رستەدا دەستکرا بەچەپڵەرێزان و دوبارەکردنەوەی هوتاف ، دوای تەواو بوونی وتەکەی دەستکرا یەوە بەچەپڵەو هوتاف، نوێنەرانی کورد بەسوپاسەوەو بەرویەکی خۆشەوە وەزارەتی بەرگریان بەجێهێشت . تابەیانی لەچاوەروانی ئەنجامی مژدەکەی عەبدولکەریم قاسمدابووین ، بەیانی رۆژی ٢٧ / ٧ /١٩٥٨ لەرۆژ نامەکاندا و ئیـستگەکانـدا دەستووری کاتی بڵاوکراوەتەوە . دیم لە رۆژنامەی البلاد بەمانشێتی گەورە دەستوری کاتی بڵاوکراوەتەوە کە کوردو عەرەب شەریکن لەم نیشتمانەدا کە ناوی عێـراقە ، بەپێـی بـرگەی مادەی ٣ و برگەکانی کەی دەستورەکە نووسراوە . لەگەڵ ریپۆرتاجێک لە سەر کۆبوونەوەکانی

نوێنەرانی کورد لە گەڵ سەرکردایەتی شۆڕش بڵاوکراوەتەوە ، وێنەیکی گەورەی چوونە ناوەوەی نوێنەران بۆناو وەزارەتی بەرگری لە لاپەڕیی یەکەمدا بڵا وکراوەتەوە وێنەی من بەجلی کوردیەوە بەگەورەیی تیادیاربوو .

***



بەڕێز: ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری یەکەمی پ.د.ک

## بڵاوکردنەوەی دەستوری کاتی و ڕەنگدانەوەی

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەستوری کاتی، هەموو ڕۆژنامەکانی ئەو ساتەی عێراق بڵاویانکردەوە، لێکۆڵینەوەیان لەسەرکرد بەپێێ بۆچوون بیری هەرلایەکیان و هەڵوێستیان و لە ڕۆژنامەو میدیاکانی جیهانیشدا بڵاوکرایەوە ڕەنگدانەوەی زۆری لە سەر بوو ، وەک دەرئەکەوت و ئاساییە کە هەمووشۆڕشێک ناحەزو دۆستی هەیە ، بەڵام زۆرترین ڕۆڵەکانی عراق لەگەڵ شۆڕشدابوون و پشتگیریانئەکرد وەک دەر کەوت ئەوانەی ناحەزی ئەم دەستورە بوون شۆڤێنیەکانی عەرەب و بەعسی و هەندێک لایەنی عەرەبی بوون ، لەگەڵ دەوڵاتانی سەرمایدار ودەوروپشت کە بە شۆڕشیکی چەپڕەویان دانابوو ، ئەم هەنگاوەی سەرکردایەتی شۆڕشیان بەدابەشکردنی عێراق دایە قەڵەم. عەبدولکەریم قاسمیان ناونا (قاسم العراق ) وناڕەزاییان دەرئەبڕی دژی دەستورەکەو هەنگاوەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی ١٤ تەموز ، لەڕوژنامەی سەر بەشۆڤێنیەکانی عەرەب وتارو باسیان بڵاوئەکردەوە بە مەبەستی سوکایەتیکردن بە کورد ، هاندانی بەرپرسان و جەماوەر بۆ پەشیمان بوونەوە پاشگەزبوونەوە لە هەموو گفت و پەیمانەکانیان کە بە نەتەوەی کوردیان داوە، وتیان ونووسیان کە نیشتمانی عەرەب کەرتکراوە.

شۆڤێنیەیە عەرەبەکان شەو و ڕۆژ لە خەم و هەوڵی ئەوەدابوون بەچی ڕێگەیەک بتوانن ئەو دەستکەوتەی کورد لە ناوبەرن، لەوکاتانەدا (ڕۆژنامەی الثورة) کەتازە ڕێی پێدرابوو لەبەغداد دەرئەچوو وەک دەر ئەکەوت زۆری نووسەرەکانی سەربەحیزبی بەعس بوون ،شۆڤێنی و ڕەگەز پەرستانی عەرەب ئەیانبرد بەڕێوە ڕۆژانە ڕیپۆرتاج و زانیاری و نووسینی چەواشەکاری و ژەهراوی وسوکایەتی پێکردنی بڵاوئەکردەوە دژی نەتەوەی کورد کەسایەتی کوردی.

هەرلەوکاتانەدا بارزانی لەگەڵ هاوەڵەکانی لە یەکێتی سۆڤێت گەڕابووەوە دوای ئەوەی لە قاهیرە جەمال عەبدوالناسری دیبوو، ئەو خۆشحاڵی خۆی بۆ بەڕێزی دەربڕیبوو دەربارەی عێراقی نوێ و ڕۆڵی کوردو جێبەجێ کردنی مافی ڕەوای کورد . لەگەڕانەوەیدا وەک پاڵەوانێکی نەتەوەیی لەلایەن جەماوەر ونیشتمان پەروەرانی کوردو عەرەبەوە لە بەسرەوە تابەغداد پێشوازی گەرم لەبارزانیە گەڕاوەکان کرابوو . لەگەڵ هاتنەوەیدا ئامادەیی و پشتگیری خۆی و پارتی دیموکراتی کوردستانی دووبارەکردبووەوە بۆهاوکاری ، بۆسەرکەوتن و پاراستنی شۆڕش و دەستکەوتەکانی گەلی عێراق بەگشتی .

ئەم بارەی سەرکردەکانی عێراق بەردەوام بوو ، ناحەزانی شۆڕش و دوژمنانی کورد هەردەم لە کارو پلانگێڕی دابوون ، لە ئینگلیزەوە تا وڵاتانی دراوسی و دەوڵەتانی عەرەبیەوە تا ناحەزانی ناوەوەی عێراق ، ئەیانوێست شەڕی عەشایەری و لەنێوان هۆزو خێڵەکانی کورددا بەرپابکەن بیانکەن بەگژ یەکتریدا تاکورد بە شەڕی ناو خۆوە خەریکبێت و بیهێز ببێت و سەری نەپەرژێت بۆناحەزان و دوژمنانی .




هەمزە عەبدوڵلە یەکێک لەسەرکردە ناو دارەکانی پ ،د ، ک

لە ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتدا کۆمەڵێک لاو وەک :

نەژادی ئەحمەدی عەزیز ئاغاو ، خەسرەوی ئاغا فەتحوڵلە لەگەڵ حەمزە عەبدوڵلە و لەگەڵ چەند سیاسەت مەدارێکی کە ، تۆمەتێک درایە پاڵیان ، گوایە هەوڵیان دابوو لەناوڕێزەکانی پارتیدا دوبەرەکی دروستبکەن باڵێکی لێجیابکەنەوە یان بەرەوهاوکاری وتێکەڵ بوونی بەرن ، لەگەڵ پارتی کۆمونیستدا ، لەژێر ناوی بیرو باوەڕی مارکسی لینینی وەک بیرۆکە ، خەباتی چینایەتی پەیڕەوی بکەن ، نەک خەباتی ڕزگاری خوازی نەتەوەیی وگشتی جەماوەری . کەلەوکاتەدا جەماوەری لایەنگیرانی بیرو باوەڕی مارکسی لینینی زۆرتربوو . دواجار لەڕێی کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کەلە ساڵی ١٩٥٩ دا لە بەغداد گیرا ئەو ڕێگەیەیان لێگیراو لەناو ڕێزەکانی ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستاندا لەئەنجامی هەڵبژاردندا

لەڕێزەکانی ڕیکخستندا دور خرانەوە ، هەندێک لەئەندامانی کە هەڵبژێرران بۆ ئەندامەتی ناوەندی و بۆ مەکتەبی سیاسی.

ساڵ بەرەو ١٩٦٠ ئەچوو دوژمنانی کورد هەوڵی ئەویان بوو دوژمنایەتی دروستبکەن بۆ بارزانی وعەشێرەتی تری لێڕاستبکەنەوە . دەرئەکەوت بارەکە بەرەو باشی نەئەچوو، وردەوردە گۆڕانی بەسەردا ئەهات ، کۆمونیستەکان پەرەیان سەندبوو کە بەکۆمەڵی نزیکتر دائەنران لە سەرکردایەتی شۆڕشی ١٤ تەموز ، ئەوانیش ئەو دەورەیان کزبوو ، عەبدولکەریم قاسم لەزۆر وتارو گفت و گۆیدا قسەکانی بۆنی ئەوەیان لێئەهات لە زۆر بڕیارو هەنگاوەکانی پەشیمان بوویێتەوە.

وەک لەوەپێش ئاماژەمان پێدا گەلی کوردستان هیواو ئومێدێکی بەشۆڕشی ١٤ تەموز هەبوو ،کە دواڕۆژێکی پڕ لە روناکی ودەست کەوتی نەتەوەیی لێچاوەڕوان ئەکرد . دەرکەوت ئەوهیوایە بەرەو ڕەوینەوەئەچوو .

بارودۆخی دەوروپشت وجم وجوڵی دوژمنان بارەکەی بەلایەکی تردابرد . تاوایلێهات کاریکاتە سەر سەرکردەکانی شۆڕش و بەتایبەت عەبدولکەریم قاسم هەڵوێستی دوژمنانەو تاکڕەوی بگرێتەبەر بەوکارانەی تاک بووەوە هیچ لایەکی بەخۆیەوە نەهێشت ، دڵسۆزان دورکەتنەوەلێی و وای لێهات پارتی کۆمۆنیستیش ئەو ڕۆڵ بەهایەی لەلای نەمێنێت .



کلۆفیس مقسود گەورە شۆڤێنی عەرەب

لەوکەش هەوا پەشێویەدا (ڕۆژنامەی الثورە) بەهەلیزانی وتارێکی (کلۆفیس مەقسود ) ی گەورە شۆڤێنی عەرەبی دژی نەتەوەیکورد بڵاوکردەوە ، کەبەم مانایەی خوارەوە نووسیبووی : {ئەوکەمە نەتەوەییانەی کە لەسەر خاکی نیشتمانی عەرەبدا ئەژین ، باشتر وایەو بۆ بەرژەوەندی خوشێانە کەلەناو بۆتەقەی نەتەوەی عەرەبدا بتوێنەوە ، کە بۆ بەرژەوەندی عەرەبە، بەمکارە ئەو نەتەوانە کێشەو گرفتیان نامێنێت ، بۆ هەردولا سوودی هەیە، بەم پێیە درێژەی بەباسەکەی دابوو ئاماژەی دابوو بەنەتەوەی کورد }.

کلۆفیس مەقسودی شۆڤێنی  ئێستا نوێنەری  دەوڵەتانی عەرەبە لەنەتەوە یەکگرتوەکان  ، لە بەشێکی نەتەوەیەکگرتوەکاندا کار ئەکات.
ئەم نووسینە پڕ لەژەهراویەی عونسوریەتی عەرەبی کە لەلایەن  کلۆفیس مەقسودەوە نووسرابوو  بووە بۆمبێکی تەوقیتکراو هەست  کینەو وتورەیی  دەرونی هەموو کوردێکی هەژاندو ، ناڕەزایی سەرانسەری ڕۆڵەکانی کوردی لێکەوتەوە ، لاوانی دڵسۆزو خوێنگەرم وڕۆشنبیران کەوتنە جوڵان و دەربڕینی ناڕەزایی وبەرامبەری و لەڕوژنامە کوردیەکاندا وەڵام درایەوە،  بەتایبەت لەڕۆژنامەی خەباتدا زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان ،  سیاسەت مەدارانی کورد کەوتنە خۆ وەڵامی خێراو بەمەنتق بەڵگەداریان پێشکەشکرد ، بەو هۆیەوە کاربەدەستان هەڵوێستیان وەرگرت بەتایبەت دژی  ئەو کەسایەتیانەی قەڵەمەکانیان لە کاردابوو بۆ بەرپێچدانەوەی نووسینەکانی ڕوژنامەی الثەورە ، بەوهۆیەوە توشی لێپرسینەوە و ڕاونان سزادان بوون ، دەستکرابە هۆنینەوەی پیلان دوای پیلان دژیان  بەتایبەت دژی بەڕێز ئیبراهیم ئەحمەد . ئەم کارانە وای لە بەڕێز بارزانی کرد کەلە بەغداد دووربکەوێتەوە  تاخۆی بپارێزێت لەهەر ڕوداوێکی نەخوازراو.
عەبدلکەریم قاسم سواری سەری خۆی بوو  بەگوێی ڕاوێژکاران و نزیکی خۆی نەکرد و کوردیش بەردەوام لە ئاگادار کردنەوەی دابوو  ، بۆ جێبەجێکردنی دەستورو بڕیارو پەیمان و شەو گفتەکانی بەڵام ئەو لەسەرتاکڕەوی بەردەوام بوو  لە باتی ولەبری  ئەوەی پشت ببەستێت بە جەماوەری فراوان  لەدڵسۆزان وهێزی گەڵ کەبنکەیەکی بەهیزو فراوان پشت وپەنایە بۆی  ، بەپێچەوانەوە ، وبێپاڵپشت نەمێنێتەوە ، مەیدانیش چۆڵ ئەبێت بۆ ناحەزان و دوژمنان و نەژادپەرستان و شۆڤێنیزمی عەرەب کاری دوژمنایان ئەنجامبدەن  بەئارەزوایان دژی ڕژێم کاربکەن بەم کارەیان بتوانن دەستکەوتەکانی  کورد وگەلی عێراق لەبنبەرن     .
لەوکاتانەشدا باری کوردستان بەرەو خراپی ئەچوو بەتایبەت  لەنێوان پارت وناوەندە کوردستانیەکاندا جۆرێک لە ململانێ و کێبڕکێ  ودوبەرەکی و تاڕادەیەکێش دوژمنایەتی لە ناویاندا دەستپێکردبوو ، کە هەمووی بەهۆی نەشارەزایی و توندڕەوی و خۆویستن و بێئەزموونی ، بیروکردار وڕەفتاری نادیموکراتی و ناعەدالەتی هەرلایەکیان بوو کە هەرلایەکیان حەزی بەبوونی لاکانی کە نەبوو ، هەرلایەکیان تۆمەتی ناڕەوایان ئەدایە پاڵ ئەوانیکە  ، بەتایبەت لەناو لایەن ڕیزەکانی ئەندامانی خوارەوە کەبووە هۆی کزی و لاوازی هەموو.
لەولاشەوە عەبدولکەریم قاسم ڕۆژبەڕۆژ بەردوامبوو زیاتر دورئەکەوتەوە لەجەماوەر. هەنگاوی دوژمنانەی زیاتری ئەنا بەرامبەر بەداخوازیەکانی نەتەوەی کورد ، بەوهۆیانەوە کورد لە شۆڕش و سەرکردەکانی توشی دڵشکستی و بێهیوایی بوو ، دوای ئەوەی کە دانووسان و پەیوەندی

زۆرو داواکاری سودیان نەما ، بیری کاربەدەسان و سەرکردایەتی کورد هاتەسەر جـوڵان و ڕاپەڕینـی جەمـاوەری ئەگەر هەر سـودی نەبـوو بەرەو شۆڕشـێکی سەرتاسـەری لە خـوارووی کوردستان.

لەدوای ئەو هەموو هەوڵ و پەیوەندیەی کورد کـردی بـو جێبەجێکردنـی داوا ڕەواکـانی ، کە وەرامی نەبوو سودی نەبوو ، کورد بەزۆر لە خانەی پشتگیری وتەبایی وهاوبەشی بەڕێوەبردن و هاوبەشی بەرپرسیارێتی دورخرایەوە بۆ خانەی بێزاری و ناڕەزایی و بەرامبەری دوای ئەوهەموو نووسـین و پـلان وکـرداره ناڕەوایـانەی دژی کـورد ئەنجـامئەدرا ، بیـر بـۆ ئەوە ئەچـوو کە پڕۆگرامێکی داڕێژراو بەدەستەوەیە هەنگاو بەهەنگاو پیادەئەکرێت ، بەوهۆیانەوە مەیدان خۆش ئەبێت بۆ شۆڤێنیەکانی عەرەب و ناحەزانی گەلی عێراق بەگشتی کەکاری نهێنی و ئاشکرایان پەرەپێبدەن و پەیڕەوی بکەن دوایی ئەنجامیبدەن دژی هەموو دەستکەوتەکانی گەلی عێراق بە گشتی و گەلی کوردستان بەتـایبەتی .عەبـدولکەریم قاسـم بێئاگـابوو لـە پـلان و جـولانی ناحەزانی و شۆڤێنی عەرەبی بەهۆی ئەوەی کە دڵسۆزانی لەدەور نەمابوو ، لەولاوە سەرکردەو ڕابەرانـی کـوردیش بێئاگـابوون لە جـم وجوڵیـان یـان بێـئەوەی زۆر بایەخیـان پێبـدەن ، کۆمۆنیستەکان یەکـێ بـوون لەوڕێکخـراوە جەماوەریـانەو نزیـک عەبـدولکەریم ئەوانـیش زۆر بەئاگانەبوون لەپیلان و جم و جوڵی شوڤێنیزمەکانی عەرەب

.کورد لەوکاتانەدا پێداگربوو لەسەر جێبەجێکردنی مادە دەسـتوری و یاسـاییەکان وگفـت و پەیمانەکان وداواکاریەکانی کەلە ئەنجامدا ئەو پێداگرتنەی کورد لەلایەن عـەبدولکـەریمـەوە بەخراپ لێکدرایەوە بێسود بـوو هەنگـاوی ئیجـابینەبوو . ناچـار سـەرکردەو ڕابەرانـی کـوردو دڵسۆزان و کەسایەتی کورد وریایانە هەڵوێستیان وەرگرت دورکەوتنەوە لە شوێنەفەرمیەکان ، تا خویان بپارێزن لە بۆسەدابن بۆ هەموو ڕوداوێکـی نەخـوازراو وچـاوەڕوانەکراو کەلە دژیـان ئەنجامبدرێت .

دەستکرا بەپەیوەندی چڕوپڕ بەهەموو ڕێکخراو و لایەن ومرۆڤ دۆستانەوە لەناوەوە و دەرەوەی وڵات بەمەبەستی ڕونکردنەوەی دوز وکێشەی کورد و پشتگیری بۆمافە ڕەواکانی نەتەوایتی و هەڵوێستی کار بەدەستانی سەر بەڕژێمی قاسم .

وەک لەوەپێش باسکرا عەبدولکەریم قاسم وەک تاکەکەسی و تاکڕەوی ڕەفتاری ناڕەوای دژی نەتەوەکەمان ئەنجامئەدا ، لەزۆر وەعدو گفت و پەیمان وبڕیارەکان پەشێمانبوو ، لەلایەکیکەوە بێئاگابوو لە هەڵس وکەوت و ڕەفتارو سیاسەتی ناوەنـدە شـۆڤێنی وڕیگەزپەرسـتانی عەرەب کەدژی خۆی و گەلی عێراق بەکوردو عەرەبییەوە ئەوبارەیان قۆستبووەوە بۆ سودو تایبتمەندی و بەرژەوەندی خۆیان ،بەنهێنی بەکاریان هێنا بۆئامانجی گڵاوی خۆیان . هەروەها کوردەکانی

خۆشمان هەستیان بە مەترسی ئەوهەنگاوە دوژمنانەیـان نەکردبـوو ، بیریـان نەکـردەوە لە ئەنجامی خراپی بارەکەو هەنگاوی پێویستیان نەنا لەدژی ، کۆمۆنیستەکانیش کە لایەنگری بوون زۆر دەرکیان بەوبارە ترسناکە نەکردبوو .

ناوەندەکانی سوپاو تیپە سەربازیەکان و زۆرترین ناوەندە فەرمیەکانی میری لە هەموو ئاستێکدا هەردەم خەریکی پیلان گێڕان و کاری دژایەتی کردنی کوردو گەلی عێراق بوون ،دژی هەموو ئامانجە ڕەواکانی هەمووبوون ، ئەتوانرێت بوترێت کە عەبدولکەریم قاسم هەر وەزارەتی بەرگری ەبدەستەوەمابوو ، لەوێش ڤایرۆسی پیلانگێڕی ناحەزانی دەورەیان دابوو شوڤێنیە عەرەبەکان هەبوونی زۆریان لەو ناوەشدا هەبوو .

ئەم دوژمنانە هەردەم ئاگری دوژمنایەتیان خۆشئەکرد بو ناوەندە سەربازیەکان و هانیان ئەدان بۆ دەستدرێژی دژی گەلی کوردستان ، کوردی خۆفرۆش و نەزانیش لەولاوە بووەستێت ، سەرباری ئەم کێشانە کەسانی سەر بەحیزبەکانی کەی عێراقی ، ناوەندەکانی ناحەزانی کورد لە دراوسێکان لەولاوە هەرخەریکی دوژمنانەیەتی بوون .لە ئەنجامی ئەم هەموو دوژمنایەتیەو پیلانگێریەوە لەهەموو لایەکەوە وای لە سەرۆکایەتـی جـوڵانەوەی ڕزگـاری خـوازکرد کە دور بکەونەوە وئاگاداری کاری نامەردیان ببن ، هەندێک لە ئەندامانی مەکتەبـی سیاسـی پـارتی دیموکراتی کوردستان تۆمەت و تاوانی ناڕەوایان بۆ هۆنرایـەوە ، توشـی لێپرسـینەوە بـبن و بگیرێن ، بەوهویەوە لە شارەکان دورکەوتنەوە ، دوای ئەوەی بارەکە یەکالآبووەوە دوای ئەوەی کە پەیەوەندی گفت و گۆو دانوسان وتووێژ سودی نەمابوو .

(من لێرەدا بە بیروبۆچونی خۆم ئەڵێم کە ئەبووایە سەرکردایەتی کورد و سیاسـەتمەداران هەربەردەوام بوونایە لە هەوڵ و وتو وێژو پەیوەندیکردنی و سەرومڕ وبەردەوامدابن ، ئەگـەر سەرە داوێکیش بووایە لەنێوانیاندا بمایەتەوە ، عەبدولکەریم قاسم ئاگادار بکرایەتەوە لەو بارە ترسناکە وسیاسەتە تاکرەویە و ئەنجامی خراپی و پیلانـی دوژمنـان وڕەگەز پەرسـتانی عەرەب کە بەنهێنی و ئاشکرا خەریکن دەستکەوتەکانی گەلی عێراق لەباربەرن ، کەدژی خۆی و گەلی عێراق بەردەوام لەکاردان ، ناوەندە سەر بازیەکان لەگەڵی نین دوژمنایـەتـی ئەکەن خەریکـی پلانگێـڕین دژی) . لەهـاوێنی سـاڵی ١٩٦١ دا قـانوونی چاکسازی کشت و کـاڵی دەرچوو( قانون اسلاح الزراعی ) کە بەتایبەتی مەبەستی دابەشکردنی زەوی زاری کوردستانبوو ئەم قانونە بووە مایەی ناڕەزایی لەناوسـەرۆک هـوزو خێـڵ و تیرەکـان وخـاوەن موڵکەکـانی کوردسـتان ، کەبەزۆری ڕوی ئەمـانی ئەگـرتەوە وزەوی زارەکـانی لەدەسـت ئـەسـەندنـەوە، بەهۆیەوە زۆر لەسەرۆک هۆزەکان کۆبوونەیەکی ناڕەزاییان ئەنجامداو باری تێکچوی نەتەوەی کوردیان بە هەلزانی دژی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم ، جوڵانەوەیەکی چەکداریان پێکهێناو لە

دەربەندی بازیان و دەربەندی خان ، ئامادە بۆ بەرووبوونەوەی هێزی میری ، بەچەکەوە دژی میری وەستان ، ئەم جولاّن و کۆبوونەوەیە لەپڕبوو چاوەڕوان نەکراوبوو ، ناوەندەکان و ڕای گشتی دابەش بوون بەدولایەن بەشێک ئافەرین وپشتگیریان دەربڕی بۆ ئەم جولاّنەوەیە بەشێکی کەیش بەدڵیان نەبوو کە پێویستبوو تاوتوێی بارەکەبکراێە و ئامادەکاری پێش وەختی بۆبکرێت ، ئەبێت لەژێر سەرکردایەتی و ڕابەری پارتی دیموکراتی کوردستاندابێت کە[ لەوکاتەدا تاکە پارتی سەرەکی بوون ] و بەرەزامەندی ناوەندی ڕوشنبیری و جەماوەر و ڕاوێژکاری هەموو ئەنجامبدرێت لەدواییدا زۆر لە لاوان و ڕۆشنبیران وزۆر لە ئەندامانی ناو ریزەکانی ڕێکخستنەکانی ( پ،د،ک )حەزیان بەوەبوو کە پارتی دیموکراتی کوردستان باوەشبگرێتەوە بۆ جولانەوەکە نەیەڵێت وابەزویی شکست بخوات و بڵاوەیلێبکەن .

ئێمە ژمارەیەکبووین لەولاوانەی کەلەڕێزی ڕێکخستنەکانی پارتیدا کارمانئەکرد بەتایبەت لە :

١/ ڕێکخراوی فەرمانبەران و مامۆستایان ،

٢ / ڕێکخراوی کرێکاران ،

٣ / ڕیکخراوی کاسبکاران .

لەڕۆژی ٨/٣١ /١٩٦١ بەپەلە بانگکراین کە خێرابین و دەستبەکاربین لە ماوەیەکی کەمدا بەیانێک بڵاوبکەینەوە ، بەتایبەت کەلە مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە دەرچووبوو بەم مانایەی خوارەوەبوو { ئەم جولاّنەوە وگردبوونەوە ودەربڕینی ناڕەزاییە لەکات وهەل ومەرجی گونجاودا بەرپانەبووە ، لەڕوی بیروباوەڕو تیوری شۆڕشگێرپیەوە ئامانجی ڕووننیە ، زۆرتر بەلای جولاّنەوەیەکی تیرەگەری و دەرەبەگایەتیدا لاسەنگە، هیوای بەردەوامی وسەرکەوتنی ئەوتۆی لێناکرێت } ئێمەیش لاوانی خوێنگەرمی ئەوکاتە ئەوەندەی بڵێیت یک ودوو ناوشارو ناوچەکەمان پڕکرد لەوبەیان نامەیە و دابەشمانکرد بە سەر شانەکانی ڕێکخستندا کە ئەوانیش بڵاوییبکەنەوە ، کە کاتی کۆتایی کارەکە هاتبوو .

بەپەلە هاتنەوە بۆلامان وتیان فریابکەون چێتان وچەندتان بلاّکردوەتەوە ، بڕۆن هەموویان کۆبکەنەوە ، وەلاّم هاتوە کە بڵاو کردنەوەی ئەوبەیانە هەڵەوبووە ، بەلاّم کار لەکار ترازابوو ئاسان نەبوو بەوشێوەیە کۆبکرێنەوە تازەکۆکردنەوەی سودی نەمابوو .

لەوە ئەچوو ئەوبەیانە پەلەی تیاکرابێت، هەرچەندە خاڵی ئەرێنی تیابوو ، لەوەئەچوو سەرکردایەتی شۆڕش ئەوبەیانەی مەکتەبی سیاسی بەدڵنەبوو بێت ، بەهۆیەوە ساردی لەنێوانیاندا دروست کردبێت.

دوای چەند ڕۆژێک بەتایبەت پێش ڕۆژی ١١ /٩ /١٩٦١ دەستمانکردەوە بەبڵاوکردنەوەی بەیانێکی نوێ کە ئەو ڕۆژە دانرا بەڕۆژی دەستپێکردن و هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێ

گەلەکەمان یازدەی ئازاری مەزن بە سەرکردایەتی پ.د.ک بەناوی شۆڕشی نوێێ ئازادیخوازی نەتەوەی کورد، داوا کرا لە هەموو ئەندامان و لایەنگیران وڕۆشنبیران وکوردپەروەران و دڵسۆزان لەگەڵ لاوان و سیاسەت مەدارو خاوەن دەسەڵات و سەرۆک هۆزەکان و هەموو جەماوەری گەلی کوردستان ، کە هەموو یەکرێز بێنەمەیدانی خەبات و تێکۆشان و هاوکاری وبەرگریەوە بەهەموو باوەشبکەنەوە بۆشۆڕشی ئەیلولی ڕزگاریخواز بەڕابەری مەلامستەفای بارزانی ، پێویستی سەر شانی هەموو کوردستانیەکە ،هەرکەسە لە ڕێی خۆیەوە ، هەرچی لە توانایداهەیە بیخاتەگەر تا شۆڕشەکە سەر بکەوێت بەئاکامی خۆی ئەگات ، ئەم شۆڕشە شۆڕشی مان و نەمانە بەهەڵگری دروشمی ( ئۆتۆنۆمی بۆکوردستان ودیموکراتی بۆعێراق ) بەرپابووە. بەناوی (کوردستان یان نەمان ) . ئەوڕۆژەی کە شۆڕشی ئەیلول بەرپابوو ڕۆڵەکانی گەلی کوردستان هاتنەکوڕی خەبات و تێکۆشان ، هەریەکە بە پێی ڕێگەی تایبەتمەندی و توانای لەکاری سەرومرڕدابوون بۆ سەرخستنی ئەم مەبەستە پیرۆزە کەیەکەم شۆڕشی خواروی کوردستانە ، هیواهەیە لەژێر ئاڵاکەیدا زۆرترین جەماوەری کوردی هاوکاری بێت سەرتاسەری بێت لەزاخۆوە تا مەندەلی.
مەشخەلی شۆڕش ڕۆژ بەڕۆژ لە گەشەسەندندابوو ،وەک پورە هەنگ جەماوەر لەدەوری پارتی دیموکراتی کوردستان کۆبوونەوە ، هێزی پێشمەرگەی کوردستان دامەزرا ، مۆدرن بە شێوەی گارێڵلا وژمارەیان هەردەم لەپەرەسەندندابوو ، خۆی خەملاند وەک لەشکرێکی مۆدرن وبەرگری لەمافی داگیرکراو خوراوی گەلی کوردستان . لەبەرەکانی نەبەردیدا سەرکەوتن لەدوای سەرکەوتنی بەدەستئەهێنا ڕۆڵە بەئەمەکەکانی کوردستان بەشانازیەوە پۆل پۆل ئەهاتنە ناوڕیزەکانی پیشمەرگەوە بۆبەرگری و دەستکەوتی نەتەوایەتی گەلەکەیان .
بەوهۆیەوە نەهێڵرا جولانەوەکەی سەرەک هۆزەکان بڵاوەی پێبکرێت و شکست بهێنێت ، ئەو جوڵان و کۆبوونەوەیەی سەرەک هۆز و تیرەکان لە دربەندی بازیان و دەربەندیخان بووە دەستپێشکەر بۆشورشی نوێی گەلەکەمان شۆڕشی یازدەی ئەیلولی مەزن کە لە ڕۆژی ١١ سێپیەمبەر لەساڵی ١٩٦١ دا بەر پابوو بانگەوازی بۆکرا. لەوکاتەشدا میری لەڕێی بنکە سەربازی و دەستگا ئەمنیەکانەوە وموخابەراتیەوە ، لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرە ڕەگەزپەرست وتاوان کارەکانەوە دەستیکردبوو بە ڕاونان وگرتن وئازاردان و دورخستنەوەی کوردپەروەران بۆخواروی عێراق بەتایبەت بۆ نوگرە سەلمان و گوێزانەوەی ژمارەیەکی زۆر لەموچەخۆران بۆ خواروی عێراق کەچاوەڕوان نەکراوبوو ، بەتایبەت لە دوای شۆڕشی ١٤ تەموزەوە خەڵکی بەبیریاندا نەدەهات چاوەروانی نەبوون پێی ڕانەهاتبوون کەکاری دوژمنانەی لەوجۆرانە دژی خەلکی ئەنجامبدرێت .

ئەم  کرداره دوژمنانەی میری کاری نەکردەسەر وەرەو هەستی شۆڕشگێران ، بەپێچەوانـەوە زیاتر گیانی بەرخودان و شۆڕشگێڕی لەدەرونیاندا جۆشئەدا  . کاتێک عەبدولکەریم قاسم ئەو ڕاپەڕینە لەپڕەی جەماوەری کوردستانی بەو جۆرە دی  سەرسامبوو ، شێتگیر بوو چاوەڕوانی نەئەکرد بەوپەلەیە بگاتە ئەو ئاستەو گەلی کوردستان هێزی بەرگری و لە شـکرێکی وا لەپـڕ بەوشێوەیە ئامادەبکات . لە بەرەکانی بەرامبەریدا پێداگربێت بەرگەگربێت بۆ داواکردنی مافی نەتەوەکەی .

عەبدولکەریم قاسم بەلوتبەرزیەوە سەیری بارەکەی ئەکرد لەبیـری تاکەکەسـی و لەخۆبـایی ڕەفتاری خۆیدابوو ، پشتی بەستبوو بەو چەکانەی لە یەکێتی سـۆڤێت دەسـتی کەوتبـوو ، بەکاری بهێنێت دژی ڕۆڵەی نیشتمانەکەی .  ئەمادەنەبوو بۆ گفت وگۆو دیالۆک و ڕێککەوتن ، ( وائەزانم هەر هیوای ئەوەی لێئەکرا کەبێتەوە مەیدانی گفت و گـۆ بەڵام هـیچ لایان لەوڕووەوە بەچەختنەبوون ) .



بەڕێز ئەحمەد هەردی شاعیرو نووسەر

ئەندامی بەڕێوەبەری گۆڤای ئامانج

## لەڕێزەکانی کاروانی خەباتی ( پ ، د ، ک)دا

وەک هەموو لاوە خوێنگەرم و دڵسۆز وکوردپەروەرەکانی گەلەکەم بەوگیانەوە لە ساڵی ١٩٥٩ دا چوومە ڕێزی خەباتکەرانی ڕێـڕەوی کـوردایەتی لەگەڵ ئەو کـاروانەدا بەڕێکەوتـم ، زۆرترین کاتەکانم بەچروپڕی تەرخانکرد بۆ ئەومەبەست وئامانجە پیـرۆزە بەتـایبەت لە نـاو ڕێزەکانی ( پارتی دیموکرایتی کوردستان)دا ، لەلایەکی کەوە زیاتر لەوە هەر بوارم هەبـووایە وکـاتم بەدەسـتەوە بـووایە ، مێـژووی نەتەوکەم وخەبـاتیم بەدرێژایـی ژیـانی ئەخوێنـدەوە وردمئەکردنەوە ، پەندو وانەکان وهەڵە مێژووییە کانیم تاوتوێئەکرد وبەراورد ئەکرد لە گەڵ (تیوری ) سیاسی بیری شۆڕشگێڕی و ئازادیخواز و خەباتی گەلان وپەیوەندیان بە ئاسایشی نەتەوایەتی و نیشتمانیەوە .

لە گەڵ ئەو کاروانەدا بەڕێکەوتم کاتێک خۆمدیەوە لە ساڵەکانی ١٩٦١بەدواوە، بە ئیش وکارو ئەرکی چروپڕێ بێوچانی خەبات وڕێکخستنەوە خەریککراوم ،ئەنجامـدان وڕاپـەڕانـدنیان لە ئەستۆمدایە ( ئای کە دڵخوش و شاناز بووم بەوکارە پیرۆزە نەتەوەیەتیـانەی ڕۆژانە لەگەڵ هەڤاڵاندا ئەنجامم ئەدان ) .

لەوکاتانەدا هەردەم لە گەڵ هەڤاڵی شەهید ( ئەنوەر سەعید دارتاش) و کاک ( کەمال میرزا غەفور ) وزۆر لەهەڤاڵانی تر لەزۆر ڕێکخراو شانەکان وشوێنەکانی تـری ڕێـزی خەبـاتی سـەر بەڕێکخـستنەکانی ( پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان ) بەیەوەکەوە لەکـاری ڕێکخـستنی سەرومڕدابووین ، لەماویەکی کەمدا لەڕیزەکانی خەبات و ڕێکخسندا لەلیژنەو ڕێکخراو شانەکاندا پلە بە پلە پێش کەوتین سەرکەوتین ئەوفرمان وکارانەی لەسەرشـانمان بـوو بە خۆشـی و جەختەوە وچالاکانە ڕامانئەپەڕاند. وەک ئەم ڕێکخراوانەی لای خوارەوە:



بەڕێز کەمال جەلال ئاسنگەر

## ڕێکخراوی( کرێکاران - کاسبکاران - مامۆستایان )

### یەکەم / لیژنەی ڕێکخراوی کرێکارانی سلێمانی

لیـژنەی ڕکخـراوی (کرێکـاران لەپارێزگـاری سـلێمانی) سەربەڕێکخـستنی پـارتی دیمـوکراتی کوردستانبوو ، کرێکارانی هەموو پیشەکانی پارێزگاکەی ئەگرتەخۆی ، هەرلە دوای ساڵی ١٩٥٩ وە ئێمە ئەمانبرد بەڕێوە ، ئەندامەکانی لیژنەکە لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو.

١ /کەمال وەستاجەلال ئاسنگەر(برای شەهید ئارام) ڕێکخەری لیژنەکەبوو، لەسەرو ئـەوە وە لێپرسراوی کارگەی چێمەنتۆی سەرچناو پیشە ئاسنگەریەکان بوو بەئەندامێتی:

٢ / ئەنوەر سەعید دارتاش لی پرسراوی ڕێکخستنی کارگەی جـگەرە و پـاککردنی تـوتن و هەندێک پیشەی کەبوو.

٣ / محەمەد باقی سەعید نووسەری ئەم یادەوەریە ، لێپرسراوی ڕێکخستنی بەشی شۆفێران وفیتەران .

٤ / حەمە ڕەشید ئەحمەد شانە لێپرسراوی بەشی نانەواخانەو چێشتخانەکان وخواردەمەنی.

٥ / عەلی ئیبراهیم دەروێش لێپرسراوی بەشی و دوکانداران و دەلاکخانەکان و پیشەییەکانی ناوبازار وپارچەي سەیارە .

ڕێکخستنی شۆفێران وفیتەران سەر بە ( بەندە) محەمەد باقی سەعید کەلێپرسراوی کاروباریان بووم ، لەوکاتەدا لەگەرمەی شۆڕشی ئەیلولدا کەسایەتی کوردپەروەرو دڵسۆزی ئەوتۆ مان لە گەڵدا بوو کە ئەندامی پێشکەوتوبوون وناسراو و خۆشەویستی شارەکە بوون ، زۆریان شانەی سەرکی کرێکارانیان ئەبردبەڕێوەٍ ، ئەندامانی شانەی سەرەکی یەکەم ئەم بەڕێزانە بوون :

١ / وەستاشەفیقی فیتەر .

٢ / جەماڵ ڕفعەت

٣ / حەمەڕەشێد حەمووش .

٤ / تۆفیق حاجی باقی بەنگینە

٥ /مەلاعەبدولکەریم لە ( مەلاریا ) .

٦ / مەلاحەسەن ، ماڵیان لە سەرشەقامی نالی ئەوسابوو

٧ / حەمە ڕەشید بێچار .

٨ / کاک ئینراهیم ناوی باوکیم بیرنەماوە.

**شانەی سەرەکی دووەم**

١ / مەحمود ڕحمتوڵله .

٢ / مەحمودی شا محەمەد

٣ / حەمەڕەشید تۆفیق تاڵانی

٤ / عەبدوڵله تۆفیق تاڵانی

٥ / سابیر شامحەمەد

٦ / کەریم تەگەرانی

٧ / جەلالی ئەحمەدی حەمامچی کادرو چالاکی ڕێگەی ماوەت

٨/ کوڕەکەی عەبودی ناویم بیرچووە

٩/ ساڵح پەنچەرچی

١٠/ عەبدوڵله عەلی ئەکبەر .

١١ / وائەزانم کەسێک بەناوی قالەی حەمە چاوش لەڕیکخستندا لەگەڵماندابوو ، چەند کەسایەتی کەمان لەگەڵدا بوو بە داخەوە ناوی زۆریانم بیر چووە کە هەموو پارچەیەک بوون لەوزەو چالاکی و کارڕاپەڕێن وکوردپەروەرو دڵسۆز ، ئەتوانم بڵێم کە بێوێنەبوون. وەک سەلامی دەلاک کەپیاوێکی خۆشەویستی شارەکەبوو جەماوەرێک زۆری لەدەوربوو .

هەرلەبارەی کرێکارانەوە ئەوزانیاریانەی لامە وتایبەتە بەشانەیەکی سەرەکی سەر بە شەهید ئەنوەر سەعید دارتاش لەکارگەی جگەرە پێک هاتبوون لە :

١/ حیکمەت مەلا عەبدوڵڵە بەرپرسی کارگە

٢ / تالیب سەید عەلی. ئەندام

٣ / عەبدولی سوران . ئەندام

٤ /حەسەن سەید ئەحمەد. ئەندام

٥ /ئەحمەد کاکە ڕەش ئەندام

تێبینی (ئەم ناوانە لە کاک حیکمەتەوە وەرگیراوە)



**بەڕێز كەریم حاجی مارف**

## دووەم / لیژنەی ڕێكخراوی كاسبكاران

**ئەم لیژنەیە یەكێك بوو لە ڕێكخراوە پیشەییەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان ،لەساڵەكانی پێش شۆڕشی ئەیلول ئێمە كاری ڕێكخستنی كاسبكارانمان ئەبرد بەڕێوە ، كە چالاكیەكی بێوێنەی هەبوو لەوساتانەدا كە بەرچاو بوو لە هاوكاری وباربووكردنی شۆڕش بەشێوەی نهێنی وگونجاو ، وئەوەی لەتواناو لە بەردەستدابوو لە لەدابین كردنی پێویستی شۆڕش پێوەی خەریك بووین ، لەم بەڕێزانە پێك هاتبوو : :**

**كەریم حاجی مارف كۆتاڵفرۆش لەقەیسەری وەسمان پاشا ڕێكخەری كاروباریبوو ئەندامانی لەم بەڕێزانە پێك هاتبوو :**

**١ / كەریم حاجی مارف كوتاڵفرۆش ڕێكخەر.**

**٢ / محەمەد باقی سەعید . ئەندام مامۆستا**

**٣ / ئەحمەد مارف مۆریاسی ئەندام مامۆستا**

**٤ / حەمە ساڵح بانەیی شال فرۆش ئەندام .كاسب**

**٥ /حەمە نوری حاجێ عەبدوڵلە ئەندام كاسب.**

**٦ / عەلی مام ڕەزا . ئەندام كاسب**

**شانەیەكی سەرەكی تر هەبوو :**

**بەناوی شانەی كۆمەڵایەتی .هەر سەر بەم لیژنەیە بوو ، ئەگەر لەنێوان ئەندامانی پارتیدا كێشەیەك هەبووایە ، ئەندامانی ئەم لیژنەیە هەڵئەسان بە ڕێكخستنەوەیان و جارەسەركردنی كێشەكان پێكهاتبوو لەم بەڕێزانە "**

**.١/ حەمە نوری حاجی عەبدوڵڵە**

**٢/ محەمەد باقی سەعید .**

**٣/مەحمودی شازەمان**

٤/حەمەسآڵح بانەیی شآڵفرۆش

٥/حەمەساڵح کارگەچی

کەسایەتیەکی کە هەبوو ناویم بیر نەماوە.

شانە سەرەکیەکانی سەربەکاسبکاران ئەوەی پەیوەندی بەمنەوە هەبوو لەم بەڕێزانە پێکهاتبوون .

١ / عەبدوڵلە حاجی سەعید سەڕاج ،ئەندام

٢ /فازیل حاجی حەمە ئەمین سەڕاج ئەندام.

٣ / مەحمود شازەمان دوکاندار . ئەندام

٤ /فەقێ عەلی ماوەتی دوکاندار . ئەندام

٥ /عەلی مەلا عەبدوڵلە کاسب . ئەندام

٦ / ساڵح کارگەچی کاسب ئەندام

لێرەوە داوای لێبوردن ئەکەم لەوکەس وئەندامە بەڕێزانە ئەوزاتانە کە ناوی زۆریانم بیرنەماوە و یاخۆد ناوی ئەندامانی شانە سەرکیەکانی تری سەر بەهەڤاڵانی لیژنەکان نەم نووسیوە کە ناوی زۆرترینیان نازانم و بە حوکمی ئەوەی سەربەمن نەبوون ، ناویان لەکۆبوونەوەکاندا کەم باسکراوە و، بەپێی پرانسیفی ڕێکخستن نەئەبووە ، بۆم نەبوو بزانم کێن وناویان چیە ؟



بەڕێز د. کامل حەسەن البەسیر

## سێیەم/ لیژنەی ڕێکخراوی فرمانبەران ومامۆستایان

لیژنەی ڕێکخراوی (فرمان بەران و مامۆستایان مان )ئەبردبەڕێوە کەلەوکاتەدا بەشێک بوو لە ڕێکخستنەکانی ناو (پارتی دیموکراتی کوردستان ) یەکەم جار مامۆستا عیزەت تاهیر ڕێکخەری بوو دوایی بەڕێز محەڕیم محمەمەد ئەمین بووە ڕێکخەری ، لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بەڕێز عەلی مام ڕەزا بووە ڕێکخەری ، دوایی (دوکتۆر کامل حەسەن البسیر) بووە ڕێکخەری لیژنەکەمان ، ئەندامانی سەرەکی لیژنەکە ئەم بەڕێزانە بوون :

ڕێکخەری لیژنەکە دوکتۆر کامل حەسەن البسیر بوو

١/شەهید ئەنوەر سەعید دارتاش ئەندام

٢ / م ، محەمەد باقی سەعید ئەندام

٣ / م ، کەمال میرزا غەفور ئەندام

٤ / کۆچکردو حەسەن حسەین ئەندام

، هەرئەندامێکی لیژنەکە دو شانەی سەرەکیان ئەبرد بەڕێوە .

لە پێش شۆڕشی ئەیلولدا عەبدولخلق جەباری و ئەحمەد مارف مۆریاسی و جەلال عەزیزی هونەرمەندو لەتیف قادر لەگەڵماندا ئەندام بوون ، دوایی کارێکی کەیان پێسپێررا گوێزرانەوە ، زیاد لەوەبەڕێزانە لەگەڵ چەند بەڕێزێکی تر وەک عارف عەبدوڵلە ، ڕەفعەت محەمەد عەبدوالڕحمان و فەرەج عەلی و نوری عارف و نوری شێخ ڕەزا و حسەین سالح ئاغاو عەبدوڵلە ڕەزا ئەژدەر و عەبدوڵڵە زێباری و محەمەد مەلا حسەین و ئەکرەم فەوزی ومحەمەد حەمەسالح و ئەمجەد مەلاکاکە حەمە و عومەری مام ڕەحیم ، محەمەد مەجید ئەسلان ،مەجید سەعید دزکوژ ،بابەعەلی شێخ ئەحمەد ، فەرەیدون عەلی ئەمین ، شێخ حەسەن بەرزنجی ،جەمال تاهیر ،کاک لەتیف قادر، جەمال عومەر. . کە ئەم بەڕێزانە زۆریان لەناو ڕیزەکانی ڕێکخستندا کادری پێشکەوتوو و چالاک ودڵسۆزبوون زۆریان شانەی سەرەکیان بەدەستەوە بوو یان لەشانەی سەرەکیدا ئەندام بوون .

هەندێکیان مامۆستابوون کە تەنها لەبەشی مامۆستایاندا چالاک و دەست بەکاربوون. دواییش ئەوبەڕێزانە هەموویان لەڕیزەکانی یەکێتی مامۆستایاندا شوێنی شیاوی خۆیان کردەوە ، لەگەڵ هەندێک لە خوشکان کەلەناو ڕێزەکانی یەکێتی مامۆستایاندا ڕۆڵی گرنگیان هەبوو وەک بەڕێزان درەخشان شێخ جەلال حەفید ، بەهیە شێخ مەعروف، بدریـە عـەلـی وشـەفیقـەعـەلـی وزۆر مامۆستای بەڕێزی تر.



عەلی مام ڕیزا لەتیف قادر ئاغا

دوکادری فرمانبەران کورد پەروەرو دڵسۆزو و چالاک

## چوارەم/ یەکێتی مامۆستایانی کوردستان

ساڵی ١٩٦١ بەرەو کۆتایی ئەچوو نزیک نیوەڕۆ بوو هەڤاڵانی سەربە لیژنەی فرمان بەران و مامۆستایان ئاگاداریان کردم کە ئەم ئێـوارەیە کۆبوونەوەمـان هەیە لەمـاڵی (دوکتـۆر کامـل حەسەن البسیر ) کەماڵیان لەکۆڵانی بەرابەر خەستەخانەی منداڵان بوو سەرو مزگەوتی گەوەرە لەگەڕەکی شێخان تەنیشت مەزاری شێخ جافر .

کەگەیشتمە ناوماڵەکە دیم بەڕێز مام جەلال لەگەڵ دوکتۆر کامیل بەسیر و خوشـکە ئەنجـوم عەبدوڵلە زوهدی دانیشتوە، دوایی ئەنوەر سەعید دارتاش پەیدابوو لە گەڵ کەمال میرزا غەفور و حەسەن حسێن ( کاک حەسەن بەڕێووەبەری بەشێ کشت وکاڵبوو لەپارێزگەی سلێـانی ) ئێمە جگە لە ئەنجوم عەبدوڵلە زوهدی لە لیژنەی فرمان بەران ومامۆستایاندا ئەندامبووین .

بەڕێز جەلال تاڵەبانی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو فرمانـدەی گشتی پێشمەرگەی نـاوچەی سـلێمانیبوو تاخـانەقین و مەنـدەلی و کەرکـوک ، دیمـان وەک نەخۆشبێت وابوو نان و ماستی ئەخوارد، بەنهێنی هاتبووە ناوشـارەوە بـۆ بەسـەرکردنەوە و ڕێکخـستنەوەی ڕیزەکـانی ( پ، د ، ک ) مـاوەیەک خەرێکبـووین بەکاروبـاری ڕێکخـستنەوەی ڕیزەکانی ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە بەر ئـەوەی ڕێکخـستنەکـان کـەلێنیـان تێکەوتبوو زۆرلە ئەندامان پەیوەندیان بەپێشمەرگەوە کردبوو یان دورخرابوونەوە بۆ خواروی

عێراق یان گیرابوون یان نان براوکرابوون یان خۆیـان شـاردبووه وه ، وەک هیـوای لێئەکـرا ،کارەکان بە باشی جێبەجێکرا ، تا شەوێکی درەنگ ماینەوە ، لەدوای ئەنجامـدانی کارەکـان ئێـمە باسێکمان درکان دەربارەی بیرۆکەی دامەزراندنی یەکێتیەک بەناوی (یەکێتی مامۆستایانی کوردستانەوە) بەهیواین ئەنجامی بدەیـن، کەلەم ڕۆژە ناسـک و مەترسـیدارو چارەنووسـیە و هەڕەتی شۆڕشدا، ئەتوانین ڕێکخراوێک دابمەزرێنین کە پاڵپـشت بێـت بـۆ شـۆڕش و زۆربەی مامۆسـتایان لەدەوری خـۆی کۆبکـاتەوە و، بەرگـری لەمافیانبکـات وبـێلایەن بێـت ، کە زۆر لەمامۆستایان ئەم داواکاریەیان هەیەو بەهیوان بێتەدی ، ئێـەبەهێواین مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان سەیری دواکاریەکەمان بکات ،ڕێگەبدات وبڕیارێک لەو ڕووەوە دەربکات ، کەئێمە ماوەیەکە ئەوداوا کاریەمان پێشکەشکردوە.

بەڕێزی بیرۆکەکەی بەدڵبوو ، فەرمووی پەسەندە وپێم باشـە ، منـیش ئەم بیرۆکەوداوایـە ، ئەگەیەنم . دوای ماوەیەک لە دانیشتنێکی ئاسایی لیژنەی فرمانبەران و مامۆستایاندا، بەڕێـز دوکتۆر کامیل بەسیر بڕیاری مەکتەبی سیاسی پێڕاگەیاندین ، کە پێیان باشە یەکیەتیـەک ڕێکخراوێک دابمەزرێت بە ناوی (یەکێتی مامۆستایانی کوردستان — عێراق ) ، لەگەڵ بڕیارەکدا هاتبوو ، ئەم کارەو ڕاپەڕاندنی لە سەرشانی ئێوەیە .

ئـێمەیش لەمـاوەیەکی کەمـدا دەسـتبەکاربووین ، بـەچڕوپـی بـەوکـارەوە خەریکبـووین ، پەیوەنـدیمان کـرد بەزوربەی زۆری مامۆسـتایانەوە بـە مـەبـەسـتی کـۆکردنەوەی بیروڕایـان ،بۆبژاردەکردن وبۆڵبژێرکردنی بیرۆکەو پێشنیازو شـێوەی کـارکردن و نووسـینەوەی پەیـڕەو پرۆگرام ، هەردەم لە کۆبوونەوەدا بووین تا هەموو کارەکان وپێویستی بەستنی کـۆنگرەی یەکەم بۆ دامەزراندنی یەکێتی مامۆسـتایانی کوردسـتان ئامـادەکرا ، یـەکـەم کۆبوونـەوەی ئاندامانی لیژنەوی ئامادەکەر بۆگرتنی کونگرەو ڕێکخـستن ودانـانی پرۆگرامـی وئـەنجامـدانی کارەکان لەڕۆژی ٢١ نەورۆزی ساڵی ١٩٦٢ دا ، لەماڵی (ئـەمینـی حـاجی بـیلال ) گیـرا بـۆ خۆئامادەکردن بۆ گرتنی کۆنگرەی یەکەمی دامەزراندنی یەکێتـی مامۆسـتایانی کوردسـتان ، هەموو هەنگاوەکانی ئامادە کرا. دووەم ڕۆژی چەژنی قوربان ڕۆژی ١٥ /٥ / ١٩٦٢ بەهەل زانرا بۆ بەستنی کونگرە، تەنها حەفدە ١٧ مامۆستا ئامادەبووین کە نوێنەری هەموو ناوچەکـان و لیواکانی (پارێزگاکانی ) خواروی کوردستان بوون ، لەبەر باری خراپی ناوچەکەو مەترسی گرتنی ئەندامانەوە، بۆیە ژمارەی ئەندامانی کۆنگرە کەم بوون .

کۆنگرەبەسەرکەوتوویی ئەنجامدرا و پەیڕەو پرۆگرامی ناو خۆی یەکێتی مامۆستایان پەسەندکرا، بەپێشەکیەکی مێژوویی وپەروەردەیی وسیاسی ڕازێنرایەوە، لەڕێی هـەڵبژاردنـەوە (ئەنـدامانی سکرتاریەت )دیاریکرا ، لەگەڵ لیژنەی دەرکردنی (گۆڤاری ئامانج ) تا ببێتە زوبان حالێ یەکێتی مامۆستایانی کوردستان مانگی جارێک دەربکرێت.

له ماوەیەکی کەمدا یەکێتی مامۆستایانی کوردستان بووە تاکە نوێنەری مامۆستایان کە زوربەی زۆریان لە ژێر باڵێدا کۆئەکردەوە . بەهۆیەوە ئێمە کارو فرمانەکانمان زیادیکرد و کەم مۆڵەتی ئەوەمان هەبوو کە پشوبدەین ، ئەوبەهارو هاوێنە بەکاروبار و ڕاپەڕاندنی کاری ڕێکستنی یەکێتی مامۆستایانەوە خەرییک بووین ،بەدروستکردنی لیژنەو ڕێکخراو لقەکانی شارەکان ودەرکردنی گۆڤاری ئامانج ، لەدوای هەڵبژاردنێکی سەربەست مەکتەبی سکرتاریەت لەم بەڕێزانە پێکهات:

١ / د . کامل حەسەن البسیر سکرتێری یەکەم .

٢/. ئەنوەر سەعید دارتاش جیگری سکرتێر .

٣ / محەمەد باقی سەعید ئەندام .

٤/ عەبدوالقادر مەلا عومەر گۆمبەدی ئەندام .

٥/ فایەق میرزا عارف ئەندام .

لیژنەی نووسینەوەی گۆڤاری ئامانج بەم شیوەیەبوو ئەم بەڕێزانە ئەیانبرد بەڕێوە:

١ / دوکتۆر کامل بەسیر سەر نووسەر .

٢/ ئەنوەر سەعید دارتاش ئەندام .

٣/ محەمەد باقی سەعید ئەندام .

لەدوای کۆدەتای بەعس لە ٨ شوباتدا لەدوای گرتنی دوکتۆر کامل البسیر . لە٩ حوزەیرانی ١٩٦٣ دا لەدوای شەهیدبوونی ئەنوەر دارتاش . بەناچاری لەهاویندا بەم شێوەیەگۆرا ئەم بەڕێزانە گۆڤاری ئامانجیان ئەبرد بەڕێوە تاساڵی ١٩٦٥ .

١/ محەمەد باقی سەعید سەرنووسەر .

٢/ ئەحمەد هەردی شاعێر ئەندام .

٣/ فایەق میرزا عارف ئەندام .

٤/ محەمەد البدری ئەندام .

لەگەڵ یەکەم هانگاوی ساڵی دامەزراندنی یەکێتی مامۆستاینی کوردستان کەوتینە ڕێکخستنی لقەکانی یەکێتی مامۆستایان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو بەڕیزان:

١/کەمال میرزا غەفور لێپرسراوی لقی سلێمانی بوو

٢/ئیبراهیم سەعید لێپرسراوی لقی کەرکوک.

٣/ شەهید ئەحمەد ڕشوانی لێپرسراوی لقی هەولێر ، دوایی عەلی هەژار بووە لێپرسراوی لق.

٤/عەبدواڵلە زێباری لێپرسراوی لقی دهۆک ، بەیارمەتی کورکێکی ئەنوەرمائی،

٥/ کەریم مەجید عارف لێپرسراوی لقی بەغداد و خواروی عێراق .

٦/ درەخشان شێخ جەلال حەفید لێپرسراوی لقی سلێمانی بەشی خوشکان .

**کۆمەڵێک کوردپەروەر:** بەردەوام لە کاروبارمەتیدان دا بوون: وەک بەڕێزان حەمەی خاڵەکەریم (حەمەی خەرەشۆ) و خوشکی بەڕێزی (ئاتەخان)، یارمەتی زۆریان ئەدایان بۆ کار ئاسانی و ڕاپەڕاندنی کارەکان وپەیوەندی و گەیاندنی نامەو بڵاوکردنەوەی بەیانی ، کرێکاران و فرمانبەران و مامۆستایان و کاسبکاران ، کە زۆر ئازاو و بەجەرگ و دڵسۆز بوون.
هەر وەها بەڕێز ئەمین ڕەسوڵ محەمەد کەسایەقی تاکسی بوو لەنێوان کەرکوک وسلێمانی جار جارەیش بۆ هەولێر بەیان و ڕاسپاردەو نامەی ئەیگەیاند، پیاوێکی دڵسۆزو بوو.
هەروەها مامۆستا بابەعەلی شێخ ئەحمەد ، ئەندامی لقی کەرکوک (ی ، م ، ک) ، هەردەم ئامادەبوو هات و چوی ئەکرد بەیان و نامەو ڕاسپاردەهەرچی هەبوو ئەیگەیاند. ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر بوو هەروها بەشی ڕۆنیۆ وبڵاوکراوەی پەروەردەی سلێمانی یارمەتی دەرمان بوون بۆکۆپی وبڵاوکردنەوەی بەیان و ئامۆژگاری .



مەلا عبدالکەریم جەماڵ ڕەفعەت

دو ئەندامی دڵسۆز وچالاک کورد پەروە لەڕێکخراوی کرێکاران (شۆفێران)

## پێنجەم / هەندێک چالاکی جۆراوجۆریکە

**ئا/** ئەگەر بوار هەبووایە کاتمان بە فیڕۆ نەئەدا تا فریابکەوین کارئاسانی هەندێک کاروچالاکی پێشمەرگە راپەڕێنین ، فریا ئەکەوتین شتومەک و نامەو پێویست بگەیەنینە دەستیان لەگەڵ حسەڕەشی خەیات و حەمەی خەرەشۆ وخوشکی بەڕێزی ، بە تایبەت لە سەروشاری سلێمانی لە ناو دارسنەوبەرەکاندا لەبناری ئەزمڕو گۆیژە.

**بێ/** هەرکاتێک دەست بەتاڵ بووینایە من و ئەنوەر دارتاش بەناوشاردا ئەسوڕاینەوە بەناوی (یارمەتی و باربوو ) بۆپێشمەرگە ، کتێبی مێژوویی (کوردو کوردستانمان) دابەشئەکرد کەلە چاپخانەی خەبات چاپکرابوو ، دەست گای پەخش و بڵاوکردنەوەی چاپخانەی خەبات دەریئەکرد کە ئەو چاپخانەیە لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە تازەکڕابوو ).

، لەشوێنە شێاوەکاندا پێشکەشمانئەکرد بەکەسانی بەخشندە و بووە و دەوڵەمەند بەئارەزوی خۆیان بەناوی کڕێنـی کتێـبەکەوە بڕێـک پارەبـدەن ، بەڵام لەڕاسـتیدا پـارەکەی بـۆ شـۆڕش وپێشمەرگەبوو . بەتایبەت دوای دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلولی مەزن لە ( ١١ /٩ /١٩٦١) دا.

**جـــیم/** لەسـالانی پـێش شۆڕشـی ئەیلـول پـارتی ڕۆژنـامەی کوردسـتانی دەرئەکـرد سەرنووسەرەکەی ( بەڕێزمام جەلال بـوو ، کـە لێپرسـراوی پارێزگـای سـلێمانی و ئـەندامی مەکتەبی سیاسی بوو ) لەناوچەی سلێمانی دەرئـەکرا ، کۆمۆنیـستەکان ڕۆژنـامەی ئازادیـان دەرئەکرد زۆرجار کێبڕکێ و وردەنووسین و ڕەخنە هەبوو لەنێوانیاندا ، من لەگەڵ شـەهید ئەنوەر دارتاش ، تێبینیمان لەوبارانەوە ئەنووسی لە سـەر بنەمـای بیـری پێـشکەوتنخواز ، کەوەرامبوو بۆیان ئەمان دایەدەستی بەڕێز مام جەلال .

**د/** لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول دوکتۆر کامیل بەسیرو ئەنوەر دارتاش و بـەنـدە محەمەد باقی نامەیەکمان نووسی ڕەخنەمان لە حیزب گرت کە ئەبێت پـارتی وسـەرکردەکان پێـشڕەوی جەمـاوەربن لە پێـشەوەبن نەک لەدوای جەمـاوەرە بـن دوایـانبکەون ، هەرچەنـدە جەماوەر سەرچاوەی بیرو هزری نەتەوایەتیە باشتر ئەوەیە ئێمـە پـرس بەجەمـاوەربکەین و هەڵبـژاردەی بیـرو پێـشنیازیان بکەیـن و تـاوتوێیبکەین ئـەوەی باشـە وبـەکـەڵـکە و ئەوەی سودبەخشە لەناوجەماوەردا بڵاوییبکەینەوە ڕابەری و پێشرەویان بکەین، ئەم نووسینە بووە هۆی ئاڵ وگۆڕی بیرو بۆچوونی زۆر لەناو لیژنەی فرمانبەراندا وریزەکانی ڕێکخستندا ،کە بەڕێز حیلمی عەلی شەریف هات بۆ کۆبوونەوە بۆتێڕوانین ولێکۆڵێنەوە دربارەیەوە ، باس و خواز لەسەری ماوەیەکی خایاند ، لەوکاتانەدا بەڕێز حەمەی حاجی تاهیر لەگەڵ ئیسماعیل عارف و حیلمی عەلی شەریف ئەندامانی سەرکردەی پارتی بوون لە ناوچەی سلێمانی .

ئەتوانم بڵێم ئەوساتانە بەڕاستی ڕۆژانێکی پڕلە خۆشی و سەروەری بوو ،کەزۆر شادمان و دڵ پڕلەهیوابووم ، بیرو ویژدان و دەرونم زۆر ئارام وپڕ لەخۆشیبوون . هەر لەبەر خۆمەوە ئەموت و ئەموتەوە ئای کە شانازم مـن لەکـاروانی خەباتـدام لەگەڵ هەڤـالان و ڕۆڵە بەئەمەکەکـانی نەتەوەکەم لەخزمەتدام ، وائەزانم ئەم جیهانە هەموو دنیاو جوانیەکانی بە دەممەوە پێئەکەنن و هانمئەدەن بۆ خەباتی زیاتر ،،، وام بیر ئەکردەوە کە هەموو داخـوازی وئـارەزوی لەگەڵ مەینەتیەکان وناهەمواری وکارەسات و ناخۆشی گەلەکەم لە سەر شان و ئەستۆی یەکێکـی وەک منە و فرمان و ئەرکی ئێمەیە ، لەگەڵ هەڤاڵەکانم بۆی تێکۆشـین ، لە نەهامەتیەکـانی ورزگارییکەین ،،،، کەی بگەینە ئەوئاواتە ،،، بەڵام بەئاسانی و خۆڕایی و هەربەقسەو بەدەمی پێیناگەین ،،،، ئەبێت بەهۆی خەبات وشۆڕش و قوربانیدان خۆبەختکردن وتێکۆشانی سەرو مڕبێت وبەیەکڕیزی پێی ئەگەین .



بەڕێز بارزانی  سەرۆکی شۆڕشی ئەیلولی مەزن

## هەڵگیرسانی شۆڕشی یازدەی ئەیلول ساڵی ١٩٦١

وەک لەوەپێش هۆکانی بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلول وردکرابوونەوە کە گەلی کورد ناچارکرا ، دوای ئەوەی هەموو پەیوەندی وهەوڵدان بۆ ڕێکەوتن و بەدەست هێنانی مافەکانی نەتەوەیی کورد جێبەجێنەکرا ، وەک خۆیان لەکاتی خۆیدا بڵاویانکردبووەوە کەکوردو عەرەب شەریکن لەم خاکەداو مافیان پارێزراو ئەبێت ، کە دوای ماوەیەک لە هەموو نووسین و وتەو گفت و پەیمانیان پاشگەزبوونەوە. لەدوای چاوەڕوانی زۆر نەتەوەی کورد بیری لە هۆیەک کردەوە وهاتە سەربیرۆکەی بەرپاکردنی شۆڕشێک ، هەر بەوهۆیانەوە شۆڕشی ئەیلولی مەزن هەڵگیرسا و دوای بڵاوەکردن سەرنەکەوتنی جوڵانەوەکەی سەرۆک هۆزو تیرەو خێڵەکان لە دەربەندی بازیان و دەربەندیخان، کە دژی عەبدولکەریم قاسم وڕەفتاری میری بوو ، ودژی یاسای ژمارە ٩٠ بوو کە دەرچوو بۆچارەسەری کشت وکاڵ و زەوی وزار کەدژی بەرژەوەندی دەرەبەگ و خاوەن موڵک وسەرۆک هۆزەکان بوو.

نەهێڵرا وابەئاسانی بڵاوەی لێبکرێت، ئەوکۆبوونەوەو دژایەتیە بێئەنجام وابە فێڕۆ بڕوات، سەرکردایەتی کورد فریاکەوت باوەشیان بۆکردەوە،بەوهۆیەوە شۆڕشی ١١ /٩ /١٩٦١ بەرپابوو ، جێگەی گرتەوە بووە تەواکەربۆی، بەڕابەری و سەرکردایەت بەڕێز بارزانی، هەر چەندە لەپڕ بوو موستەلزەماتی شۆڕش وخۆئامادەکردن هیشتا کاتی مابوو ی. وەک لەوەپێشەوە باسکرا. لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشی یازدەی ئەیلول، لەهەموو ناوچەکانی کوردستان لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان دامەزرا و لەژێر سەرکردایەتی وڕابەری پارتی دیموکراتی هاتەمەیدانی نەبەردی و بەرگریەوە .

یەکەم پۆلە پێشمەرگە (وەک گەرێللایەکی مۆدرن) لە ناوچەی سلێمانی وگەرمیان بەڕابەری بەڕێز جەلال تاڵەبانی دروستبوو کە لەوکاتەدا ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو ،زۆر لەکادرانی پارتی ودڵسۆزان و کوردپەروەران و ڕۆشنبیران ئەفسەرانی سەربازی ناوچەکان و شارەکانی سلێمانی و کەرکوک و هەولێرو دهۆک و خانەقین شوێنانی کەی کوردستان و بەشی عێراق بەرەو شاخبوونەوە بۆ خۆڕێکخستن لە ڕیزەکانی پێشمەرگە و بۆخۆسازدان وبەرگری لەخاکی کوردستان و بەدەستهێنانی مافی ڕەوای نەتەوەی کورد ، لەژێر چەتری شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا.

شۆڕش ڕۆژبەڕۆژ پەرەیئەسەند بەرەوسەرکەوتن و پێشەوە ئەچوو ، لە ناوچە شاخاویەکاندا میری رۆژانە توشی شکستی و نوشوستی ئەبوو .

عەبدولکەریم قاسم کاتێک کەدی شۆڕشێکی والەپڕو مۆدرن و بەهێز وبەژمارە زۆر وڕێک وپێک و سەرتاسەری بەرپابووە لە زاخۆوە بۆ خانەقین و مەندەلی ، گەلی کورد دژی جوڵاوە .

ئەم شۆڕشە لە ناکاو هەڵگیرساوە شێتگیر بوو خێرا دەستیکرد بە ئۆپەراسیۆنی سەربازی دژبەشۆڕش ، دەستیکرد بەهێرش هێنان بۆ سەر بنکەو بارەگاکانی لەشکری شۆڕشگێڕي کوردستان لەلایەک، بۆردومانکردنیان بە فرۆکەو تۆپ و تانک لە لایەکی ترەوە.

بە ولەشکرە پڕچەککراوە نوێیەوە هاتەمەیدانی پەلاماردانی کورد ، کە تازە لەیەکێتی سۆڤێتی کڕابوو، بۆ بەرگری لە خاکی عێراق دژی هێرشی دەرەوەکی بوو، نەک بۆ کوشتن و کاوڵکردنی ناو وڵاتەکەی ودژی ڕۆڵەکانی گەلی کورد، ئەوچەکە تازانە بۆیەکەم جار لەکوردستاندا تاقیکرانەوە ، وەک هەموو دوژمنە دێرینەکانی کەی کورد هەردەم چەکەکانیان بەسەرکورددا تاقیکردوەتەوە.

دەستکرا بەڕاونان وگرتنی خەڵکی و تۆمەتی ناڕەوایان دروستکرد بۆ هەندێک لە کەسایەتی کورد ودەستیانکرد بەدەرکردن و نانبڕینی زۆر لە فرمانبەران وموچەخۆران و گرتن وتوندکردنی زۆرلە لاوان لە بەندیخانەی ( نوگرەت سەلمان ) لە بیابانی عەرەب ، نەقڵکردنی زۆرلەمامۆستاو فرمانبەر بۆ خواروی عێراق ، کەش و هەوایەکی ترسناک و لێپرسینەوە وزولم و ئازاردانی زۆر وگرتنیان ئەنجامئەدا ، کە لەوەپێش دانیشتوان ئەو دیاردەو زوڵمەیان نەدیبوو بەسەریان نەهاتبوو لە سەری ڕانەهاتبوون لە زەمانی حوکمی پاشایەتیدا.و ڕژێمی کۆماری نوێیشدا بەوشێوەیە نەبوو .

***



هەردو براو پێشمەرگەی دێرێنی ناوشار، کورد پەروەر ودڵسۆزو چالاک ، ئەندام لەرێکخراوی کرێکاران : حەمە رەشید تۆفیق تاڵانی ، لەگەڵ عەبدوڵله تۆفیق (تاڵانی ) لەگەڵ بەندە مامۆستا باقی .

## چالاکی ئەندامانی (پ،د،ک) و پێشمەرگە

دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ١١ ئەیلولی مەزن عەبدولکەریم قاسم ئەمری کرد بە لیوای ٢٠ کە تایبەت و سەربەخۆی بوون ، دەستبکەن بە ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە لیوای (پارێزگای ) دیالەوە تا ناوچەی سلێمانی ، هەموو بگرنە ئەستۆ بێلێپرسینەوە لێیان ببنە بکوژو ببڕی خەڵکی ناوچەکە ، ئەم لیوایە لەژێر فرماندەی تاونبارو خوێنڕێژ
( زەعیم سەدیق )دابوو ، دەستیکرد بەگرتن و ڕاونان کوشتن و بڕێن ئازارو ئەشکەنجەدانی خەڵکی و دەرکردن و نەقڵکردنیان بۆ خواروی عێراق ، خەڵکی کە ئەو جەوروستەم ڕاونان و ماڵ تاڵانکردنە یان بەخۆیانەوە نەدیبوو ، تالە زەمانی ڕژێمی پاشایەتیدا بەوجۆرەش نەبووە بەبیریاندا نەئەهات وابەخوت و خۆڕایی وبێ هۆو تاوانێک
وا بە ئاسانی بگیرێن سزابدرێن لە بەندیخانە توندبکرێن لەکار دەربکرێن لەموچەی ژیان بێبەشبکرێن و لەکوردستان دور بخرێنەوە،کە ڕانەهاتبوون لەگەڵ ئەم جۆرە تاوان زوڵمانەی ناوەندی سەربازی بەسەرکردایەتی زەعێم سدیقی تاوانبار .
ئەم ڕەفتارانەی زەعیم سدیق کاری کردەسەر ورەو بەرگەگرتنی هەندێک لەخەڵکی ، زۆریش لەکوردپەروەران بەوهۆیەوە لەشارەکان دور کەوتبوونەوە بوونە (پێشمەرگە) بەم هۆیانەوە ڕێکخستن و ڕێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شارەکاندا کەلێنی تێکەوت بەهۆی بڵاوبوونەوە و پەرەوازەبوونی زۆر لە خەڵکی و پەیوەندیان بەڕێزەکانی پێشمەرگەوە ، کاریکردە سەر ڕێکخستنەکانی پارتی و ڕێکخسنەکانی ڕێکخراوەکان کە پەرتەوازەو بێ هێزبوو ، پێویستی بەڕێکخستنەوەو بەسەرکردنەوە و نوێکردنەوەهەبوو ، لەماوەیەکی کەمدا لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٢ دا لە ئەنجامی کاری سەرومرو چرووپر ، ڕێکخراوەکان لیژنەکان شانەکان ڕێکخرانەوە لەلایەن

ئەنـدامان و كـادرانی دڵـسۆزەوە ئەو ئەنـدامانەی پچڕابـوون پەرەوازەبـوون  بە سـەركرانەوە ڕێكخرانەوە ، ڕێكخستنەكان و ڕێزەكانی پارتی ڕوپەكی نهێنی وپتەوتر ونوێیان گرتەخۆ .
جەماوەری دانیشتوی شارەكان هەموو پاڵپشت و هاوكاری شۆڕشەكەیان بوون  نهێنی پارێزبوون ، بۆنمونە شـاری سـلێمانی بەرامـبەر دوژمنـان و میـری وەك شـآرێكی داخـراوی لێهـاتبوو ، پێشمەرگەیەك    یان سەركردەیەك ئەگەر خۆی بكردایە بەناوشاردا پارێزراوبوو بەسەربەستی ئەیتوانی بسوڕێتەوە هێزەكانی سەر بە حكومەت پێیان نەئەزانی.
 ڕێزەكان وڕێكخستنەكانی  (پ،د ،ك ) بەشێوەیەكی چاوەڕواننەكراو پـتەو و بەهێـزو توانـاو ورەبەرزبوو  ،لەگەڵ سەركەوتنەكانی هێزی پێشمەرگەی كوردستان لە بەرەكانی نەبەردیدا لە ناوچەی سلێمانی و شآرباژێرو ماوەت و چەمی ڕەزان  وبادینان بەهەموو ورەو ڕەوتێكی تازەیدا بەخەكی وسەركەوتنی بەردوامی شۆڕش .
خەڵكی بەتاك و بەكۆمەڵ ئەهاتنە ناوڕێزەكانی پێشمەرگەی كوردستانەوە ، لاوێكی كوردستانی ، ئەوساتەی پێخۆشبوو شانازبوو كە شەرەفی ئەندامێتی پێشمەرگەی پێبدرێت  ، خۆی پێوە ئەنواند و شانازی بەوناوە پێرۆزەوە ئەكرد ، بێسێودوكردن هەردەم ئامادەبوون كارو فرمـانە كانی پێشمەرگە جێبەجێبكەن .
ئێمەیش لەڕێی خۆمانەوە بەهۆو لەڕێی ڕێكخراو و شآنە سەرەكیەكانەوە ، چالاكیمان لە ئاستی پێوویستدابوو ،چالاكی هەمەجۆری كەیشمان هەبوو لەزۆر بواردا وەك بۆنموونە:
١ /  لەڕێی شانەیەكی سەرەكی سەربە ( لیژنەی فرمانبەران ومامۆستایان )  شانەیكی سەرەكیم بەدەستەوەبوو كە ئەندامانی سەربە بەڕێوەبەرایەتی  (پۆست و بەریدو تەلەفۆن) بوو كە مـن ئەمبردبەڕێوە بەهۆی چەند لاوێكی ئەندامی فرمانبەری( پۆست و بەرید )  وەك نووری ئەحمەد برای شەوقی ئەحمەدی مامۆستا و چەنـد هەڤـاڵێكی كە لەو شانەسـەرەكیە دا  ئـەنـدامبوون بەداخەوە ناویانم  بیرنەماوە ، توانیمان دەستبەسەر بەریدو پۆست وئەلەفۆناتدا بگرین نهێنی و نامەكانمان دەستبكەوێت ، ڕۆژانە هەرچی هەواڵ و نامەی گومانلێكرابوو ئەمانكردەوە ، هەرچی نامەیەك یاخود خەبەرێك بـدرایە لە سـەر كەسـێك یـان پێـشمەرگەیەك ئەكەوتەدەسـتمان ، بەكۆمەڵی لە دانیشتنەكاندا ئەمانكردەوە لەناومان ئەبرد، زۆر لەوكەسانەمان ئەناسیەوە كەبەم كـارە تاوانكاریـانە هەڵـساون ، بەوشـێوەیە نەمانهێـشت هـێچ نـامەو خەبەرێـك لەوڕێـگەیەوە بگاتەدەستی میری .

**هەربۆنمونە** :یەكێك لە نامەكان بەجۆرێكی ڕێك وپێك نووسرابوو ناوێ كەسانی ناسـراوی تیابوو كە ئەندامی پارتی دیموكراتی كوردستان بوون و ناوی چەند پێشمەرگەیەكی ناوشاری

تیابوو کە ئەگەر دەستی میری بکەوتایە ، ئەنجامەکەی باشنەبوو ، زانیمان ئەوەی نامەکەی نووسیوە خەبەریداوە کەسەکە کێیە ..؟ دیمانەوە، نامەکەمان خستەگیرفان چووین بۆلای خاوەن نامەکە ، هەندێک پرسیارمان لێکرد ، ڕواوڕو پێمانوت ئایاکاری واتکردوە ،،؟ ویستی ئینکاری بکات ، دوایی نامەکەیمان پێشاندا لەپڕ ڕەنگی مردنی لێنیشت و خەریکبوو بکەوێت، ئێمە بڕیاری لێبوردنمان پێگەیاند کە جارێکی تر ئەمە دوبارە نەبێتەوە، ئەویش سوێندی هەتاهەتایی بۆمان خوارد و تۆبەیکرد وتی مەرجبێت ئەوە دواهەڵەی ژیانم بێت وهەردەم لەگەڵتانابم ، گوێ ڕایەڵتان بم .



بەڕێزان مەحمود سابیر عەبدوالقادر مەعروف

نهێنی وهەواڵی موخابەرەیان ئەگەیاند

٢/ هەربەهۆی (مەحمود سابیر)ەوە کە نائب زابتبوو لەبەشی موخابەرەی سلێمانی لەودائیرەدا ئیشی ئەکرد، برادەری عەبدولقادر مەعروف بوو ژمێریاری پەروەردە وبرای نووسەرو ئەدیب عومەر مارف، بەهۆی کاک عەبدولقادرەوە هەموو دەنگ و باسی مخابەراتیئەدا ئەیناردبۆمان کاک عەبدولقادر بۆئەو مەبەستە پەیوەندی پێوە ئەکردم هەموو دەنگ و باسەکانی پێڕائەگەیانین

٣ /لەبەرئەوەی من لەڕێکخراوی کرێکارانی پارێزگای سلێمانی کارمئەکرد، ڕکخستنی شۆفێرانم بەدەستەوەبوو لەشانەیەکی سەرکیدا کەبەدەستمەوەبوو نامەیک هاتبوو کەئەندامێکی پارتی سەر بەشۆفێران لەدەربەندیخانەوە تازە نەقڵبووە بۆشانە سەرکیەکەمان ،کەپێک هاتبوو لە تۆفیقی حاجی باقی بەنگینە و مەلاحەسەن و مەلاعەبدولکەریم، وەک لەوەپیش ناوم هێنان . لەکات و ساتی کۆبوونەوەی ئەوشانەیەدا کەلەماڵی مەلا حەسەن بوو لەسەرکارێز لە کۆڵانێکی سەرشەقامی نالیدا ، لەگەڵ خۆم ئەوئەندامە نوێیەم هێنا بۆکۆبوونەوە لەگەڵیاندا لە دانیشتنەکەدا پرسیمان ئیستا لەکوێ شۆفێریت وکار ئەکەیت کەنەقڵ کراویت؟ وتی ماوەیەکە لە ئەمنی سلێمانی کارئەکەم سایەقی مودیری ئەمنم ، دوای ئەم قسەیە هەریەک لە ئەندامانی شانەکەمان بە بیانوویەک چوونەدەرەوە هەرمن و ئەو ومەلا حەسەن ماینەوە.

لەدواییدا لۆمەیانکردم وتم بۆچی کۆبوونەوەکەتان بەجێ هێشت هەریەکە بەبیانوویەک جوونەدەرەوە ، ئەوان لەوە ناڕازیبوون چۆن ئەپیاوەم هێناوە بۆناویان کە سایەقی مودیری ئەمنە ، منیش وتم بەهەڵە ئەمکارەنەکراوە ئەوکەسە ئەدامبووە لە دەربەندیخان و نامەم بۆ هاتوە جێگەی بڕوایە مادەم ئێوە پێتان خۆشنیە، من بەتاک پەیوەندی پێوە ئەکەم لەدواییدا دەرکەوت پیاوێکی پاک ودڵسۆزبوو ، زۆر جار دەنگ و باسی ئەمن ئەوەی دەستی بکەوتایایە لەڕێی ئەوەوە خەبەروباسمان وەرئەگرت و سودی زۆری پێگەیاندین بەداخەوە ناوەکەیم بیر نەماوە .

شۆڕشی کوردستان پەرەی سەندبوو ، سەرکەوتنەکانی شۆڕش و پلان وبیرو ڕێڕەوی مرۆڤایەتی پێشکەوتنخوازی شۆڕشەکەو دڵسۆزی سەرکردەو پێشمەرگەو ئەندامانی ، وای لە زۆری شیوعیەکان کردبوو بو بەچاوێکی دادوەری سۆزەوە سەیری شۆڕشەکەبکەن بەتایبەت لقی کوردستان و لەناو ڕێکخستنەکانیاندا بەشێوەیەک داوایان کردبوو بشتگیری وهاودەنگی شۆڕشەکە ببن ، دەنگ بەرزبکەنەوە دژی ئەو زوڵم وزۆرەی کەدەکرێت لەدژی دانیشتوانی کوردستان بەرگری لە جەماوەری گەلی کوردبکەن ، باری تازەی کوردستان و عێراق و هەڵوێستی عەبدولکەریم قاسم ، بووە هۆی ئەوەی ڕژێمەکەی بەرەو کزی بڕوات جەماوەرلەدەوری کەم بێتەوە ، لە ئەنجامدا شیوعیەکان (دروشمی ئاشتی بۆکوردستان) یان هەڵگرت کەهەڵوێستێکی ڕاست ودروست واقیعی بوو ، لەوپێناوەدا ئەوانیش تۆشی زوڵم ئازارو ولێپرسینەوە کێشەو گرتن بوون .

***

# پێشمەرگە (لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان)

کات بەرو هاوێنی ساڵی ١٩٦٢ ئەچوو پێشمەرگە لەنەبەردیەکانیاندا لەخەندەقەکانی بەرگریدا سەرکەوتنی گرنگیان بەدی ئەهێنا توانیان ناوچەی شاربازێڕو ماوەت پاکبکەنەوە لە هێزاکانی میری ناوچەکانی دەوروپشتی چەمی ڕەزان پاککرانەوە ،کەبووە مەڵبەندێکی گەورەو بەهێزی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان وەک پورەهەنگی لێهاتبوو هەموو جۆرچالاکی وپێویستی لەشکری وئامادەکردنی و سازکردنی وبەردەوامی شۆڕشی تیا ئامادە ئەکراو ئەنجامئەدرا .

ناوچەیەکی فراوانی سلێمانی بەدەست پێشمەرگەوەبووو بەسەرکردایەتی وکۆنترۆڵی بەڕێز جەلال تاڵەبانی ، لەنەبەردیەکاندا و ڕوبەڕوبوونەوەی دوژمن ، سەدان سەربازو ئەفسەرو دەرەجەدار بەدیل گیران و چەک و تەقەمەنیەکی زۆر کەوتەدەستی پێشمەرگەوە لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان بە پێی ستراتێجی بەرەو ڕوبوونەوە شێوەی لەشکری مۆدێرن و پارتیزانی وەرگرت.

خەڵکی لە هەموو لایەکەوە لەهەموو ئاستدا گەورەو بچوک بەڕێزەوە سەیری پێشمەگەکانیان ئەکرد لاوان لە ئاوات و خەیاڵێ ئەوەدابوون کە ڕۆژێک ببنە پێشمەرگە ئەو ناوە پیرۆزەیان پێببەخشرێت و ئەو جلە زەردانە لە بەربکەن و کلاشینکۆفێک لە شانبکەن .

بەرپاکردنی شۆڕشی نوی ئەمرۆ تاکە هیواو تاکەڕێگەی ناچاری نەتەوکەیان بوو بۆبەگەیشتن بەئاواتی سەروەری چاوەڕوانکراو .

گەلی کوردستان ناچاربوو خۆزگەی ئەوەبووو نەتەوەکەیان بەوشێووەیە لاوەکانی چەک بەشان نەبوونایە و لەباتی ئەوە قەڵەم بەدەستبوونایە، لەو ڕێگەیەوە خزمەتیانبکردایە ، بەڵام ناچاریە دوژمنەکانمان هەرگیز ئامادەنین بو تێگەێشتن و بیرکردنەوە وحەلکردنی کێشەو گرفتەکانی نێوان ، بەدیالۆک کەگیانی دیموکراتی و مرۆڤایەتیان لە ئاستێکی نزمدایە و گیانی نەتەوەپەرسیان زاڵە و ڕێگەی دادوەری لێگرتون پرکێشی وجورئەتی ئەوەیان تیانیە کە دانبنێن بەڕاستیداو مافی نەتەوەکەمان بەڕەوا بزانن ، یان بێنە مەیدانی گفت و گۆو دانووسان ، تابەگیانی برایەتی وهاوتاو هاوشان و هاو سەنگ بەخۆشیبژین لەباتی ماڵکاولی کوشتن ، خووبدەینە چاکسازی و بنیاتنان .

ئەوسیخوڕو پیاو خراپانەی کە ئامۆژگاری و لێبووردن و بانگکردن ئاراستەکردن و تێگەیاندن لە گەڵیاندا سودی نەبوو بەردەوامبوون لە خراپەکاری و زەرەر مەند بوون هیوای چاک بوونیان لێ نەکرا ، لە لایەن پێشمەرگەی ناوشارەکانەوە دور خرانەوە و پاککرانەوە [ کە پێشمەرگەی ناوشار ڕێکخراوێکی تایبەت و پر لەنهێنی بوون لەلاوی خوێنگەرم پێکهاتبوو پەیوەندیان

بەڕێکخستنەکانی ئاسایی پارتیەوەنەبوو ،کەسێکی ئاسایی وئەندام ئاگاو زانیـاری لەسـەریان نەبوو بەڵکو وەک بەشێک لە لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان و تایبەت مەندو ونهێنی پـارێز لەکاردابوون

لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان وەک لەشکرێکی ڕێک و پێک و مۆدێرن خەملّی ،لەهەموو ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان هەبوون وئامادەبوون،شۆڕشی ئەیلول کەشۆڕشی سەرتاسەری گەلی کوردستان بوو لەشنگالّ وزاخۆوە تا خانەقین و مەندەلی هەموو ،لەژێرفرمان وئاڕاستەی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بوو بە سەرکردایەتی بارزانی ، یەکەم شۆڕشی سەردەمی نەتەوەی کوردبوو بەوفراوانیەوە جەماوەرەزۆرەی لە دوایەوە بوو .

***



زەعیم سدیقی تاوانکار

# زەعیم سدیقی خوێنڕێژ ئامر لیوای بیست

زەعیم سدیق ئامر لیوای بیست بوو کاتی خۆێ عەبدولکەریم قاسم خۆی ئامر لیواییبوو دوایی دابوویە دەستی ، ناوچەی چالاکی پێشووی لە بەعقوبە ( باخقوباد ) و خانەقین بوو ، زۆرترین سەربازەکانی خەڵکی ئەو ناوچانەبوون کوردیان تیابوو .

عەبدولکەریم قاسم ناوچەی سلێمانی تاخانەقینی بەرەو بەرەوڕوی کردبووە وفرمانی بێسنوری دابووەدەستی بەئارەزووی خۆی چی کارێکی پێباشە دژی سەرکردەکانی شۆرشی ئەیلول وگەلی کوردستان ئەنجامیبدات بێلێپرسینەوە لەئەنجامی کارەکانی .

زەعیم سدیق پیاوێکی گردیلەی تۆزێک بە خۆوەبوو ، کەسێک سەیری دەم و چاوی بکردایە نیشانەی تاوانی تیا ئەبینی بەدوچاوی بچوکیەوە وێنەی پیاوکوژی تیا بەدیئەکرا ، هەردەم تورەبوو پێکەنین و زەردەخەنە لە دوم وچاوێدا بەدینەئەکرا ، پیاوێکی تورەو کەللە شەقبوو هەرگیز تەفاهومی نەبوو ،کەم دووبوو وەک دەرئەکەت لە قسەکانیدا دەبەنگبوو وریانەبوو بەڵام قاڵبوی تاوان و جنێودان وپیاوکوشتنبوو ، لەقسەکردندا مەنتقی نەبوو قسەکانی هی پیاوێکی زیرەک و عاقڵ وبەڕەوشت نەبوو ، نەدوبوو .

لەکاتی خۆیدا کە ئەفسەری یەک ئەستێرەبووە لەسلێمانیبووە هەردەم لەیانەی ئەفسەران بووە (کەئەکەوتە تەنیشت بیناکەی ئەوقاف لەبەردەرکی سەرا ) ڕەشۆلی ( هونەرمەند )

لەوكاتەدا يانەی  ئەفسەرانی بەدەستەوەبوو ناسیبووی ڕای لە سەری ئەوەبوو كەپیاوێكی هەڵەو بێڕیز بوو جارێكیان بە ڕەشۆلی وتبوو ( كەی  ئەو ڕۆژەبێت تۆكارێكت بكەوێتە من ، بتوانم یارمەتیت بدەم ،،،؟ .

لەگەڵ دەست پێكردنی شۆڕشی سیپتەمبەر ١٩٦١ ، زەعیم سدیق دەستیدابووە ئۆپەراسیۆنی سەربازی فراوان دژی  پێشمەرگەی كوردستان و دانیشتوانی نـاوچەكە ، بەم كـارانە بـارێكی ترسناكی هێنابووە ئاراوە لەناو شارەكاندا خەریكی ڕاونانی خەڵكی و بەندكردنی لاوان بوو ،بە ئارەزوی خۆی خەڵكی ئەگرت بەكۆمەڵ فرمانبەر، كرێكاری  دەرئەكردو موچەو نانی ئەبڕێن ، ئەقلی ئەكردن بۆ خواروی عێراق بەتايبەت بۆ بەنديخانەی نوگرت سەلمان ، بەشەوانە هەڵێان ئەكوتايە سەر دانیشتوان و خێزانەكان دەستی ئەكرد بەترسـاندنیان وگرتنيـان و تـالانكردنی ماڵەكانیان ، دوای لێدان وشەق وئازاردان جنێودان وهەڕەشە ڕۆڵەكانیانی ئەگرت و بەجێیان ئەهێشتن ، لەهەرشوێنێك پێشمەرگە چالاكیەكی بنواندایە یان ڕووداوێك ڕوییدایە دوایی بەتانك و مـودەرەعە هەڵـی ئەكوتـایە سـەر شـوێنەكە ئەو نـاوەی وێـران و تـاڵانئەكرد هەركەسـێكی دەستبكەوتایە بەتايبەت لەلاوان  بێلێپرسینەوە كۆمەڵی ئەكردن خەڵكی ناوچەكەی كۆئەكردەوە ڕێزیئەكردن لە پیرو جوان و ژن و مندال  ، بەرچاوی كەس وكایـانەوە وخەڵـكەكەوە  گـوللە بارانی ئەكردن ،   بۆنمونەوە وەك تاوانەكەی (دێی سپیدارەی )سەرجادەی نزیك دەربەنديخان كەچەند لاوێكی گرت وڕێزیكردن لە ناودێ بەبەرچاوی كەس و كارو دانیشتوانی دێیەكەوە گوللە بارانی كردن دێیەكەی وێران و تاڵانكرد.

زەعیم سدیق دەستی خستبووە كاروباری هەموو دائیـرەو شـوێنەفەرمیەكانەوە هەتادەسـتی خستبووە سەر ژیانی ڕۆژانەی خەڵكی وبۆ سەر ڕۆژنامەو كتێب و هونەر و ئەدەب هونەردۆستان وكاسب و پێشەوەران  ،سەربازەكانی لەبازگەكاندا خەڵكیان ئازارئەداو سوكایەتیان پێئەكردن ماڵی بازرگانیان پێبووایە دەستیان بەسەریدائەگرت و لەناخۆیاندا بەشیانئەكرد.

بەپێ ئەودەسەڵاتەی پێی درابوو ئەمری ئەكرد بەگرتنی خەڵكی بەكۆمەڵ وبەنانبڕین و موچەی كرێكارو فرمانبەرو خەڵكی ، نەقلی ئەكردن بۆ خواروی عێراق بەتايبەت بۆ  (نوگرەت سەلمان ) بەنديخانەی سلێمانی و ئینزیباتخانەی پڕكردبوو لە بەندكراوان هی واهەبوو ئەوەندە مـابوەوە تێكچووبوو لەبیرچووبووەوە .

شاڵاوی گرتن ودورخستنەوەو دەركردن و پەلاماری میری هەتـا ئەهـات ڕۆژ بەڕۆژ  زیـاتر و دڕندانەتر ئەبووو ، لە بەرامبەریشدا پێشمەرگەی كوردستان سەركەوتنی زیاتری بەدەستئەهێنا خەباتی ڕۆڵەكانی كوردستان  زیاترو بەهێزترئەبوو ، ورەو گیانی بەرگەگرتن و بەرگری هەرلە بەرزبوونەوەدابوو .



**بەڕێز عەلی هەژار سەرۆکی لقی هەولێر (ی،م،ک)**

## چالاکی یەکێتی مامۆستایان :

**وەک لەمەوبەر باسکرا کۆنگرەی دامەزرانـدنی یەکێتـی مامۆسـتایانی کوردسـتان لەڕۆژی ١٥/ ٥ / ١٩٦٢ گیرا لە ماڵی دوکتۆر کامل حەسەن البسیر کەدووەم ڕۆژی جەژنبوو لەوکاتەدا ماڵیان لە نزیک مزگەوتی شێخ بابە عەلی بوو، کەتەنها ١٧ حەفدە مامۆستابووین لەبەرخراپی بـارەکە وامـان پێخۆشـبوو کەهەرئەوەنـدەبین ، کـۆنگرە بە سـەرکەوتوویی دواییهـات ،خێـرا هەمووکەوتینە چالاکی بۆ ئەنجامدانی ئەوکارانەی پێویستە لەدوای کۆنگرەبکرێت بۆ کردنەوەی لقەکـانی یەکێتـی مامۆسـتایان و لێـژنەی نـاوچە لەهەمـوو شـارو شـارۆچکەکانی کوردسـتان وناوەڕاستی عێراق وبەغداد و دابەشکردنی قوتابخانەکان بەسەر مامۆستای لێهاتو شێاو ، بۆ ئەوەی لە هەر قوتابخانەیەکدا لێپرسراوێک هەبێت بۆکـار ئاسـانیان وبەرێـوەبردنی کـاروبیری پەیوەند بەمامۆستایانی کوردستانەوە ، زۆرجار لەکۆبوونەوەکانی لیژنەی ناوچەی سلێمانی سەر بە یەکێتی مامۆستایان کۆئەبووینەوە ، من تەکلیف کرام لەکۆبوونەوەکانی لیژنەی ناوچەو لقی سـلێمانیدا ئامـادەبم وەک ئەنـدامێک ، هەرچەنـدە لە (سـکرتاریەتدا )ئەنـدام بـووین لەگەڵ ئەندامەتی دەستەی نووسەرانی (گۆڤاری ئامانج) ، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری خواسـتی مامۆستایان ورێکخستن و بەڕێوەبردنی کارەکانبین ، هەروەها هەستنەکرێت کەئێمە لە ئاستێکی کەدا ئـیش ئەکەیـن ، بەوشـێوەیە لەنـاو ڕیزەکـانی یەکێتـی مامۆسـتایاندا خەریکبـووین کە ئەزموونێکی نوێبوو ، لەماوەیەکی کەمداو لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانەکاندا بەڕووی قوتابیاندا زۆری کارەکانی ڕێکخستنمان بەئەنجامگەیاندبوو هەربەردەوامیش بووین .**

**لەمانگی تشرینی یەکەمدا مانگی ( ئۆکتۆبەر )میری هێزێکی زۆری کۆکردبووەوە بە مەبەستی هێرشکردنە سەر پێشمەرگەو بنکەکانی ، بەتایبەت لە ناوچەی چەمیرەزان ، پێـشمەرگەکانی کوردستان لەنەبەردێکی بێـوێنەدا شکستیان هێنـا بە هێـزە لەشـکرە هێرشـبەرەکەی میـری وبەشکستی گەڕانەوە دواوە، لەئەنجامدا کۆمەڵێکی زۆر لەئەفسەرو سەربازیان لێگیروا کوژراو بریندایان هەبوو .**

لەئەنجامی ئەوهێرشەدا ئەندامێکی لقی کەرکوکی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان شەهیدکرابە ناوی: (شـەهید حەسـیب مـحەمەد ئەمـین ) کە یەکەم شـەهیدی یەکێتـی مامۆسـتایانی کوردسـتان بـوو لـەلقـی کەرکـوک لەڕۆژی ٩ /١٠ / ١٩٦٢دا شـەهیدبوو بەوپێـیە رۆژی شەهیدبوونی دانرابە (ڕۆژی یەکێتی مامۆستایان ) کە هەمووساڵێک لەو ڕۆژەدا یادی بکرێتەوە .
هەر بەو بۆنەیەوە یەکێتـی مامۆسـتایان لقـی کەرکـوک بەیانێکیـان دەرکردبـوو بۆجەمـاوەری مامۆستایان وگەل ، هەروەها سکرتاریەتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان بەیانێکی ڕێزلێنانی دەرکرد بۆگیانی پاکی ئەوشەهیدە ، ئێمە لەوچەند ڕۆژەدا خەریکی بڵاوکردنەوەی بووین .
لەڕۆژی ١٧ / ١٠ /١٩٦٢ دا لەکۆبـوونەوەیەکی لیـژنەی نـاوچەی یەکێتـی مامۆسـتایاندا لە سلێمانی ئامادەبووم لەگەڵیان خەریکی ڕێکخستن و دابەشکردنی قوتابخانەکان بووین بە سەر مامۆستای دەستنیشانکراو ، لە هـەڵبژاردنـدا ڕەچـاوی دڵـسۆزو شـیاوی مامۆسـتای لێهـاتوو باوەڕپێکراو بکەین، کەببنە لێپرسراوی قوتابخانەکانیان کەئێش وکاری پەیوەست بە یەکێتی مامۆستایان بـەنهێنـی قوتابخانەکـان بـەرنبـەڕێـوە ، هەرلەو کۆبـوونەوەدا نـامە نووسـرا بـۆ ئەومامۆستایانە، نامەکان دابەشکران بە سەر ئەنداماندا منیش چەند قوتابخانەیەکم بەرکەوت ، کەبیانگەیەنم، زۆری نامەکانم دابەشکرد ، لەڕۆژی ١٨ /١٠ / ١٩٦٢ وەک لە بیـرم مابێـت نامەی قوتابخانەی مەڵکەندی کوڕان مابوو لە گەڵ قوتابخانەی دووەمی میوانیان کەبەنـۆرە دەوامیانئەکرد نامەکە ئاڕاستەکرابوو بۆبەڕێز( فەتاح ئاغای) پێشمەرگە.
(فەتاح محەمەد ئەمین ئاغا) تائەوکاتە مامۆستابوو بەرپرسیارێتی هەردوقوتابخانەکە بەرەوڕوی ئەوکرابـووە کەچـووم بۆقوتابخـانەکە، دیـم بەڕێـز (عەبـاس تۆفیـق شـلک ) بەڕێەربەری خوێندنگەکەیە ، هەواڵێ کاک فەتاح ئاغـام پرسـی کـاک عەبـاس وەرامیـدایەوە، کە نـزیکەی مانگێک ئەبێت لەقوتابخانە دابڕاوە دەوامناکات ، ئەڵێن پەیوەندیکردوە بە لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستانەوە پێشمەرگەیە و لە پەروەردەی سلێمانیەوە ئەمری ئیداری بۆ دەرچووە ، ئەگەر دەوام نەکات دەستی لەکار ئەکێشنەوە ، دوای ئەوە لە قوتابخانەکە هاتمەدەروە و نامەکە هەر لەگیرفانمدا مایەوە .
هەر ئەوڕۆژە لە کۆبوونەوەیەکی ڕێکخستنی سەرەکی کرێکاراندا سەر بەحیزببوو ئامادەبووم ڕاپورتی ئەوانیش لە گیرفانمدا مایەوە .
ئەوڕۆژە ئێمە دەوامی پاشنیوەڕۆمان هەبوو فریای قوتابخانە کەوتم کاتێک هاتم بۆقوتابخانەی (ئیبن خەلەکان) کە دەوام بکەم فریانەکەوتم نانی نیوەڕۆ بخۆم وتم دوای دەوام ئەچمەماڵەوە .
لە پـشوی وانەکانـدا لە گەڵ مامۆسـتاکان بەنـوکتەو قـسەیخۆش کاتمـان ئەبردەسـەر کە دەفتەرێکمان دانابوو ڕۆژی نوکتەیەک بنووسینەوە بەڕێز (عەبدوڵڵە محەمەد کوردی ) دەستی باڵای هەبوو لەوبوارانەداو بەقسەخۆشەکانی کاتمان ئەبردەسەر .

ئەورۆژە هەوالێ بەسەرهاتی بنەماڵەی فەرەجەفەندی باسکرا کە زەعیم سدیق هەموویانی گرتوە لە ئینزیباتخانە توندیکردون ، بەهۆی ئەوەوەی کۆمەڵێک نامەو بڵاوکراوەی پارتی دیموکراتی کوردستان لە لۆریەکی باری ئەوانداگیراوە کەبەنیازبوون ببرێت بۆقەڵادزی لەگەراجەکەی ئەوانەوە دەرچووە ( کە گەراجەکەی فەرەجەفەندی لە شوێنی ئێستای تەلاری نەقیبدابوو ) ، لەپشکنینی لۆریەکەدا بەیانەکانیان گرتبوو ، لە ئەنجامدا زەعیم سدیق هەموو ئەندامانی خێڵی فەرەجە فەندی گرتبوو بەتایبەت حەمەی فەرەجەفەندی وکەمالی کورێ و ڕەئوفی فەرەجەفەندی ، ئەوانی کەی بەردابوو ، ئەم خێزانە بەهیچ شێوەیەک ئاگایان لەم کارەنەبووە ،هەر لەبەر ئەوەی لەگەراجەکەی ئەوانەوە دەرچووە تاوانبارکراون ، هەرلەو پشوانەدا مامۆستایان باسیانکرد کە ئەندامانی ئەوخێزانە لەئینزیباتخانە ئەشکەنجە دراون زۆریان لێدراوە مەترسی مردنیان لێئەکرێت ، زەعیم سدیق خۆی بەسەرکارەکەو ئازاردانیانەوە وەستاوە ، ئەورۆژە هەر باسی ئینزیباتخانەوە گیران ولێدان و ئازاردان و هەڵواسین و کوشتن بڕێنبوو ، کە زەعیم سدیق ئینزیباتزانەی کردوەتە دۆزەخی ئاگرو ئاسن بۆ ئازاردانی جەستەی لاوان وهاوڵاتیانی بێتاوان ، ئینزیباتخانەی کردوەتە قەسابخانەیەکی کوردان ، بەڕاستی یەکێک کە ئەوباسانەی ئەبیست وایلێئەکرد کە بسڵەمیتەوەو موچڕکەی تورەیی و هەست بەئازار بەلەشیا بێت ، هەرکەسێک ئەم باسەی لابکرایە سەرسام ئەبوو، کەبەوجۆرە ڕوداوی سەیرو سەمەرەو ترسناکیان لێئەگێڕایەو ، خەڵکی ئەیان پرسی باشە ئەم هەموو دوژمنایەتی و تەعەدا بێ ئەندازەیەی زەعیم سدیق لە پێناوی چی و بۆ ،،،،،،؟.



بەڕێز مامۆستا عومەر عەبدوالرحیم لێپرسراوی لیژنەوی ناوچەی سلێمانی

یەکێتی مامۆستایانی کوردستان ، بەشی خوشکان

# چۆن وا لەپڕ کەوکوژی گیرام

وەک لەلاپەڕەکانی پێشودا باسمکرد لەڕۆژی ١٨ / ١٠ /١٩٦٢ کاتێک لە فرمان و ئەرکەکان بوومەوە ، بەرەو قوتابخانە بوومەوە کە ئەوڕۆژە دەوامی قوتابخانەکەمان پاش نیوەڕۆ بوو فریاکەوتم هەندێک وانەم وتەوە وانەی چوارەم شآغێربوو لە بەر قسەی خۆش ودەنگ وباس بەسەرهاتەکانی ناوشارو نامەردیەکانی زەعیم سدیق خۆم خەریککردبوو لەولاشەوە مامۆستا عەبدوڵلە کوردی بە نوکتەی خۆش خەریکی کردین ، هەموو گوێیان لێگرتبوو بەوهۆیانەوە بۆنان خواردن دواکەوتم نەچوومەوە ماڵەوە.

لەپڕ شێخەی فەڕاش هاتە ژووری مامۆستاکان : وتی مامۆستا باقی مودیر بانگت ئەکات ئیشی پێتە ، (شێخەی فەڕاش پیاوێکی بەتەمەن بوو دڵسۆزو کوردپەروەربوو قسەخۆش و خۆشەویست بوو لای هەموو پاک وپیاوچاک بوو ) کاتێک شێخە وتی حسەین ئاغای مودیر ئیشی پێتە ، منیش خێڕا بێ سێو دوو هەڵسام بەرەو ژوری بەڕێوەبەر چووم ، هەرکە گەیشتمە ناودەرگای مودیر ٣ سێ کەسم دی یەکێکیان دانیشتووە و دوان لە ناو دەرگاکەدا ڕاوەستابوون ، لەپڕ خورپەیەک بەدڵمداهات . وبواری خۆدزینەوە و خۆڕزگارکردنم نەما ، بواری گەڕانەوەم نەبوو ، هەستمکرد ئەمانە ئەمنن هەردو پیاوە ڕاەستاوەکان لەپڕ هەریەکەیان پەلاماری باڵ و لایەکیان دام و ئەوەی دانیشتبوو لەپڕ هەڵساو باوەشێ پیاکردم ، خێراکە لەپچەی کردە دەستم وتی: یاڵلە ویانا .

سەربازەکان پەلاماریان دام وکەوتنە وێزەم ، بەڕاکێشان بەلێدان بەدەم وردەلێدان وجنێو دانەوە وتیان [یاڵلە ، ویانا ] ، لە وپەلامارە لەپڕەو بێمەجالە، هیچ توانایەکم نەما و فریای هیچ نەکەوتم ، بیرم کردەوە وتم من دەرسی دواییم نەبوو بۆ نەڕۆشتمەوە بۆماڵ ؟ بیری نامەکانی گیرفانم کەوتەوە ، بیرم لێکردەوە کە ناوی ئاشکرا یان تیایە دەبارەی کرێکاران ونهێنی و پێشنیاز و ناوی کەسانی سربەمیری تیایە کەپیاو خراپن . نامەکان وەک (چوکلێت ) پێچرابوونەوە.

بە هەرسێکیان بە پاڵ بردمیانە دەرەوە ، فرێیانـدامە پشتی پیکابێک پڕبوو لە سەرباز بەچەکەوە لەهەردولای پیکابەکەدا دانیشتبوون دوای ئەوە، چاویان بەستمەوە لە ناوەڕاستدا لەپشت یپیکابەکدا پاڵیان خستم، سەربازەکانیش لە سەر کورسی هەردولای پیکابەکە پۆساڵەکانیان لە سەر ورگ و سنگ ولەش وگیانم بوو هەریەکەیان بەلەقەی پۆستاڵەکانیان لێیان ئەدام و جنێوی ناشیرینیان ئەدا بەکورد، جار جارەش بەمن .

نەم زانی بۆچی گیراوم وبۆچی وام لێئەکەن ، نەمزانـی بەرەوکـوێم ئەبەن؟ دوای مـاوەیەک هەستمکرد دورکەوتونەتەوە، لەبەردەم شـوێنێکدا وەسـتان ، دابەزیـن و منیـان بەرخۆیانـداو بردمیانە ژورەوە لەپڕ کەچاویان کردمەوە ، خۆمدیەوە لە ئینزیباتخـانەی عەسـکەری لـەنـاو حەوشەکەیدا فڕێدراوم .

لە حەوشەیەکدا، کە بەسەربازی زۆر تـەنرابـوو لەگەڵ گەیـشتنم بە حەوشـەکە ، هەرچـی سەربازێک لەو ناوەدا هەبوو تێمئالآن بە لێدان بە کێبڵ وشەق وزللەو جنێودان ، لە بەردەمیاندا هەڵئەسام و رابکەم پێیان ئەدایە بەرپێم بەدەمدا ئەکەوتم ، ئەهاتنەوە سەرم هەموو لوت ودەم چاوم بریندارببوون و خوێنیان پیائەهاتەخوارەوە دوایی کفت بووم کەوتم توانای هەڵسانم نەما زۆر ئاگام لەخۆ نەماو پەکمکەوت لە حەوشەکەدا کەوتم ، ئەوەی مەراقمبوو بیرم لێئەکردەوە نەمئەزانی بۆچی گیراوم و لە سەرچی بۆچی واملێئەکەن ؟ .

ئینزیباتی عەسکەری: {لەسلێمانی لەکۆلآنی دواناوەندی فریشتەی کچانبوو ،تەنیشتی لای ڕاستی ماڵی فایەقی کاک سەعیدی قەساب بوو ، کەئەمە بەشی بەڕێوە بردن بوو ، ئامر ئینزیبات لێرەبوو هەموو بەندکراوەکان لێرەبوون لەژورەکاندا دەرگایان لەسەر داخرابوو ، بەڵام هەموو ئینزیباتەکان لەبیناکەی ئێستای باری شارسـتانی ورپیگـەزنامـە کۆکرابوونـەوە} ڕوی بیناکە لە ڕۆژ ئاوابوو دو دەستەبوو دەستەی پشتەوەی لە چوار ژور پێک هاتبوو دەسـتەی پێشەوەی سەردەرگاکە }چوار ژوری گەوەرەبوو ، لای خواروی هەموو توالێت و سەر تەنوور بوو ، ژورێکی سەردالآنەکەی پێشەوە هی ئامر ئینزباتبوو، دەستەی پشتەوەی بەرامبەر دو ژور هەبوو دالآنێک لەبەینیاندا هەبوو ، دەرگای دو ژورەکەی لەسـەربـوو ، لای سـەروەش دو ژورهەبوو لە سەر دالآنێک هی لێکۆڵێنەوە لێدان و هەڵواسین و ئەشکەنجەدان بوون .

ئەم بینایە خانوویەکی ئاسییبوو بەکرێ گیرابوو ، وەک باسمکرد ئینزباتخانەی سەرەکی لە بیناکەی (ڕەگەزنامەو باری شارستانی ئەمڕۆی سلێمانیدابوو) سەربازەکان لەوێ مۆڵدرابوون ،کە بەمەزەنە سی مەتر دوربوون لەیەکتری ).

دوای ئەوەی تێر لێدانم خوارد بەکێبڵ و شەقی پۆستاڵ وزللەو لیدان لە ناوخۆڵدا تلامەوە خوێن و خۆڵ تێکەلاوی یەکتر بوون ، دوای ماوەیەک دورکەوتنەوە لێم کە بەلیدانی کەسانی ترەوە خەریکبوون ، هـاتمەوە سـەرخۆو چـاوم هەڵهێنـا ، دیـم حەوشـەیەکی گەورەیە پـڕەلە فرەدەگەنم و ئاردو گوڵە بەرۆژە وفەردەی کە ، بەشێکیان لە بەینی فەردەکاندا لەملاو ئەولای فردەکان ڕژابوون ، لەشێ کەسانم دی کەوتبوون ڕاکشابوون بـوراوەو نەتوانـا نـرکەو نـاڵەو نوزەیان ئەهات ، کۆمەڵێک سەرباز خۆیانکرد بەناو حەوشەکەداو سەربازێک ئیـشارەتی کـرد کەمن میـوانی تـازەم ، تـومەز سـەر بە حیمایەکـانی زەعـیم سـدیق بـوون ، هـاتنەوە وێـزەم

بەداروشەق بۆهەموو لەشم دەستیان نەئەپارست ، هەڵ ئەسام ڕابکەم ئەکەوتم و هەڵئەسامەوە هەرجارە بەلەقەو لێدان ئەهاتنە سەر ورگم وسەرسنگ و پشتم بێتاقەتیان کردم پەکم کەوت ئاگام لە خۆنەما گێژبووم ، ئەجارەش دوای ئەوەی لە لێدانم هیلاکبوون هەمیسان دورکەوتنەوە .

کات بەرو ئێوارەئەچوو، کاتێک سەرم هەڵبڕی و سەیری دوەرو پشتمکرد بینیم هەڤاڵی دێرین و هاوڕێی خەباتم ئەنوەرسەعید دارتاش ئەناڵێنێت دیم پەکیکەوتوە بۆراوەتەوە ، بۆم ڕونبووەوە و شتێک تێگەیشتم ، بەڵام چۆن وبۆ ئەمە ڕویداوە ،،،؟ . لەولامەوە لە پاڵ فەردەیەکدا سەری عەلی ئیبراهیم دەروێشم دی نزیکمە و نوزەی دێت ئەناڵێنی و دەم بەئازارە وسەیرم ئەکات لەبەر خۆیەوە ئەڵێت :

[ لەدوێنیەوە منیان گرتوە ومنیان کوشتوە هەموو گیانیان شکاندوم ، ناچارییبوو ] ، ئیتر بە باشی بۆم ڕونبووەوە و تێگەیشتم هۆی گرتنمان ، چیبوو هۆی گرتنەکەمان ، ئەبێت شتێک ڕوی دابێت ئەوگیرابیت ئێمەیش بەوهۆیەو گیرابین ،،،؟ ، بەڵام هێشتا باش نازانم و بۆم ڕون نیە نازانم بۆچی ولەبەرچی وچۆن،،، ؟. عەلی بەنوزە وئازارە وە وتی بەهۆی ماڵی حاجی فەرەجەوە بوو .....!.

تومەز بەهۆی گرتنی بەیانەکانی ناو لۆریەکەی قەڵادزی لە گەراجی حاجی فەرەجەفەندی ودوایی لەهەڵمەتەکەی میریدا وگرتنی کەسانی زۆر بەوهۆیەوە ، و دوایی لەئەنجامی ئەشکەنجەو لێدانی خەڵکی ، ئەشێت ناوی کەسانێک لەدەمەوە درابێت وادیارە پەرەی سەندوە ئێمەیشی گرتوەتەوە ،بەڵام چون و بەچی ڕێگەیەک ، وکێ ، نازانم ...؟. چونکی ئەوە هیچ پەیوەندیەکی بەئێمەوە نەبوو و زانیاریمان دەربارەی نیە . لەمەجالی کارو ڕێکخستنی ئێمەدا نەبووە ، من و ئەنوەر دارتاش وحەمە ڕەشید ئەحە شانەو عەلی ئیبراهیم دەروێش هەڤاڵانی کەی ڕێکخستنەکانی کرێکارانمان ئەبردبەڕێوە، ئاگامان لەم ڕوداوە نیە وپەیوەندی بەئێمەوە نەبووە و ئەو کەسانە ناناسین .

***

# هۆکاری گرتنەکەم ئەشکەنجەو ئازاری زۆر درام

کاتێک کە کاک عەلی ئیبراهیم دەروێش ئەوچەند وشەیەی بەدەم ناڵاندنەوە وت ئەوسا تێگەیشتم گرتنەکەم بەهۆی کارکردنمەوە لە ناوڕێزەکانی یەکێتی مامۆستایان و ناو ڕێکخستنەکانی فرمانبەران و کاسبکاران دا نەبووە ، بەڵکو لەڕێی کارکردنمانبووە لە ناو ڕێزەکانی ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بووە ، بەتایبە لیژنەی کرێکاران : کە من وئەنوەر دارتاش ، وعەلی ئیبراهیم دەروێش ، وحەمەڕەشید ئەحەشآنە وکەمالی وەستاجەلالی ئاسنگەر ئەمانبردبەڕێوە ، بەڵام چۆن ئەمڕۆ وابەئاسانی کەوتینە بەردەستی ئەمن وئیستخبارات لەسلێمانی .

هەرلەو کاتەدا کەوتبووم ڕوم لەوشوێنەبوو کەلەسەردالانی دەرەوەبوو کەسێک بهاتایە ئەمدی لەنزیکەوە دیم ڕەشۆلی ( هونەرمەندو دەنگخۆش ) میوانی تازەیە ، سەربازەکان فریای ئەوە نەکەوتن لێیبدەن ،پیاوێکی ئەفسەری دەرەجەداری گردەڵە لەپڕ لەحەوەشەکدا دەرکەوت سەرشانی پڕ بوو لە ئەستێرە لەنزیک ڕەشۆلەوە وەستا (لەدواییدا زانیم ئەوە زەعیم سدیق بوو ) عەریف ئیسماعیلی لەگەڵدابوو کە خەڵکی دەوری خانەقین ومەندەلی بوو یەکێکبوو لەحیمایەکانی زەعیم سدیق ڕویکردە زەعیم سدیق وتی ( بێگ هذا ڕشۆل )یانی بەگم ئەوە ڕشۆلە یارمەتی موتەمەڕدینی داوە (پێشمەرگەیە) ئیعتیرافی لەسەرکراوە وناوی (حەرەکی قەلەباچکەیە) ، ئەم وشانەی دوایی بەکوردیەکی سەروگوێ شکاو وت وبەعەرەبیش وتیەوە ودوبارەی ئەکردەوە ،زەعیم سدیق لە ڕەشۆل چووە پێشەوە وهەندێک قسەی لەگەڵکرد ، وەک گوێم لێبوو ڕەشۆل وتی : گەورەم من قەڵ نیم پیاوم ، ئەگەر پێشمەرگە بوومایەو یارمەتیم بدانایە ناوم ئەبرا بە (شێر ) نەک (قەلە باچکە) ،جەنابیشت کاتیخۆی وکۆن لێرە بوویت کەتازە بوویت ومنت ناسی وگەنج بوویت ، ئەتوت تۆبرای منیت وگەورەی منیت ، کەی ڕۆژێکبێت تۆ ئەمربکەیت ، من جێبەجبێیبکەم ، ئەمڕۆ تۆ وارێزم لێئەگریت..! وپاداشتم ئەدەیتەوە؟ بەخۆڕایی گیراوم وئاگام لەهیچ نیە، لە وکاتەدا عەریف ئیسماعیل وشە بەوشە قسەکانی کاک ڕەشۆلی بۆی ئەکرد بەعەرەبی، وەک لە بیرم مابێت زەعیم سدیق چووە پێشەوە دەستی خستە سەرشانی وتەوقەی لەگەڵکردو، وتی تۆڕاستئەکەیت و حەقتە من قەرزداری تۆم، تۆ ئازادیت، فەرموو بڕۆ خواحافیزتبێت بەسەربازەکانی وت وازیلێبهێنن بابڕوات ،ئیتر زەعیم سدیق حەوشەکەی بەجێهێشت، ڕەشول کرایەدەرەوە .

هەر ئەوندەی زەعیم سدیق چووەدەرەوە سەربازەکان تێمئالانەوە هاتنەوە وێزەم ، بە تێهەڵدان و کێبڵ و دارو شەق و زللەکاروانێکی ترلێدانم خوارد خوێن بەدەم وچاو قاچمدا ئەهاتەخوارێ

و قاتێکی تازەم کردبوو لای (حسەرەشی خەیات) چەند ڕۆژێکبوو لەبەر مابوو دڕاندیان هەردو قۆڵی چاکەتەکەمیان لێکردەوە لەبەرمدا وەک هێلەکی لێهات و لەپشتەوەشی کردیان بەدوکرتەوە پانتۆلە کەمیان لەبەرمدا دڕی و پارچە پارچەکرا ، بەدەم لێدان ڕاکردنەوە بەعەرەبی ئەیان وت ئەوە حەڵوایە لەوخرابترت لێ ئەکەین ، خۆت ئەبینیتەوە، بردمیانەوە بۆ ناو ئاودەستخانەکە .

دوانیان بە سەرمەوە بوو هەردو قاچمیان بەرزکردبووە، سەرم لەناوسیفۆنی ئاودەستەکەدابوو ماوەی چەند کاتژمێریک بەئازارەو نیوەبووراوە هێشتمیانەوە . دوایی هاتنەوەسەرم بەڕاکێشان و لێدان.

وهەڵسان وکەوتن بەشەق وتێهەڵدان و ڕاکێشان هەردوپەلیان گرتبووم کردمیان بەژورێکدا لە ناوەڕاستدا فڕێیان دام ،ٍشەکەت ماندو برسی و گیان بەئازار وبریندارو لەشی خوێناویەوە کەوتم زۆر ئاگام لەخۆم نەبوو، توانام نەبوو هەلسم هەموگیانم بریندارببوو . سەربازەکان چوونە دەروە ودەرگاکەیان لە سەرمداخست ، ئیتر دوای ماوەیەک لە ژورەکەدا هەناسەیەکمدا وفرسەتێک بوو پشوویەک بدەم دوایی کە تۆزێک بەئاگابوومەوە سەیری دەورووپشتمکرد چەند کەسێکم دی ، پیاوێکی لاوی تێکسمڕاوی قەڵەو و چاوکزم دی چاویلکەیەکی ئەستوری لە چاودابوو دەستێک چاکەت وپانتۆلێ خۆڵیمێشی لە بەردابوو ،کەوتبوو ئەیناڵاند .

ئەوەندە سەرم لێشیوابوو وامزانی هەمووماں لەوجلە وەرئەگرین وتایبەتە بەزیندانی کراوەکانی ئینزیباتخانە ، دیم ئەوپیاوە ئەناڵێنێت و بەدەم ناڵێنەوە لەسەرخۆ ورتە ورتیبوو ، نەم ئەزانی چیئەلێت ، دوگەنجم دی لەلایەکی ژورەکەوە هەڵتروشکابوون ، دەم وچاویان لەوە نەئەچوو کە کوردبن خۆیان متکردبوو گوایە لێیان دراوە لەش بەئازارن واخۆیان دەرئەخست کە زۆریان لێدراوە ، لەولاشەوە پیاوێکی بەهەیبەتی جلٚ کوردی ڕێک وپێکم دی مشکی بەسەر لەوە ئەچوو کەسێکی ناودارو دەوڵەمەندی شارەکەبیت ، بەڕاستی کەسیانم نەئەناسی ئەتوانم بڵیم لەژیانمدا کەسیانم بەرچاو نەکەوتبوو نەمئەزانی ئەودو کەسە گیراوانە کێن وبۆچی گیراون ،،،؟.

پیاوە چاوکزەکە هەرئەیناڵاند لە سەرخۆڵی ژورەکە ئەتلایەوە وبەبیانووی خۆتلانەوە لێم نزیکبووەوە سەری نزیک کردەوە ، بەهێواشی وتی : وریابە ئەودوانە سەربازن سیخوڕن، منیش تێگەیشتم وریابوومەوە کەسەیری پیاوە جل کوردیەکەم کرد سینیەک کەبابی لە بەردەستدابوو ، تۆزێکی لێخواردبوو کەبابەکە وەکخۆی مابوو دوایی دەرکەوت سەربازەکان بەپارەی زۆر بۆیان هێنابوو بەپیاوەکەم وت : بۆنانەکەت ناخۆیت وەرامیدامەوە : بۆچی هیچم بۆ ئەخورێت، ژەمێک لێدانی خۆڕاییم خواردوە ونازانم لەسەرچی گیراوم ماڵەکەم پڕە لە عەبا بەسەر ، تەنها من هۆی ژیان وپەیداکەری ڕزقیانم ، ویستم بەهۆی خواردنەوە ڕاپۆرتەکانی ناو گیرفانم لەناو سینیەکەدا بشارمەوە ، پێم وت : لەبەیانیەوە نانم نەخواردوە لەقوتابخانەلەپڕ

گرتمیان سەرم نەپەرژاوە نانبخۆم ، ئەتـوانم تۆزێـک بخـۆم ، وەرامیـدامەوە فەرمـوو ئەگەر نەیخۆیت ئیستا دین سینیەکە ئەبەنەوە ، خواردنەکە فرِی ئـەدرێـت ، منـیش پـشتمکردە دو سـەربازەکەو سـینیەکەم ڕاکێـشایە بەردەمـم وامپێـشاندا کەبـاب ئەخـۆم فریـاکەوتم نـامە پێچراوەکانی ناوگیرفانم دەرهێنا ولەناو قەراغی کولێرەکاندا شاردمەوە وخۆم ڕزگارکرد لێیان ، بێئەوەی دو سەربازەکە پێـم بزانن سینیەکەم بردەدواوە برادەرەکە وتی وابزانم هیچت نەخوارد ، وتم سوپاست ئەکەم ئەوەندە لێدانم خـواردوە تێربـووم هـیچم پێناخورێـت بەڕاسـتی هەل وفرسەتێکی باشبوو لەوکاتەدا بۆم ڕەخسا .

لەدواییدا لەپیاوە چاوکزەکەم پرسی ئەوجلانە هی بەندیخانەیە وەرتگرتوە سەری بادوا وتـی ئەوە تۆ ئەڵێی چی وباسی چیئەکەیت

.. ؟ وتم بەزەحمەتی نەزانیت ناوت چیە ...؟ وتی : قادر ، پێم ئەڵێن ( قادر برسی ) وتم : وەزع چـۆنە وتـی هەتـا ئیـستا ئەولێـدانەی تـۆ خواردوتـە خـوێی چێـشتە ، شـەولێدان دەستپێئەکات ،لەو قسانەدابووین کات بەرەوئێوارە ئەچوو لەپڕ دەرگا کرایەوە کۆمەڵێک سەرباز خۆیانکرد بەژوردا وبەپەڵە هاتنە سەرم ، هەریەکە پەلێکی ڕاکێشام و ئەوانی کەێش بەلەقەو دارو کێبل کەوتنە لێدانم بەدەم لێدان وڕاکێشانەوە بەرەو دەرەوە برام .



عەبدوڵی حاجی محەمەدی سلۆ

# پشکنینیماڵەکەم

کۆمەڵێک سەبازی تر هاتن دەستیان دایە پەلم بەلێدان لەقەو ڕاکێشان بۆناو حەوشەکەو نزیک ڕارەوی دەرەوە بردمیان ، کەلپچەیان کردە دەستم و بەرەو دالآنی دەروەیان بردم چاویان بەستمەوە ، هەردولایان گرگتبووم بەرەو دەرەوە بردمیان ، خستمیانە ناو پشتی پیکابێکەوە ، ڕایانکێشام لەبنی پیکابەکەدا کۆمەڵێک سەرباز لە هەردولای پیکابەکە لەسەر کورسیەکان دانیشتبوون پوستالەکانیان لەسەر ورگ و سنگ و لەشمدا دانابوو جار جارەش لەقەیان پیائەدام توندیانئەکرد لە سەر لەشم ، پیکابەکە بۆشوێنێک بەڕێکەوت نەم زانی بۆکوێ ئەڕوات ،،،؟ ، دوای ماوەیەک لە شووێنێک وەستان نەمزانی کوێیە ، هەموو دابەزین تەنها چواریان بەدیارمەوە وەستان ، دوای ماوەیەک یەکێک لە سەربازەکان گەڕایەوە هاتەلای هاوڕێکانی وتی ( گەواد عندە غورفە مثل الوزیر ) یانی ژورەکەی لەهی وەزیر ئەچێت ، ئەوسا تێگەیشتم کەلە بەردەرگای خۆماندا وەستاون وڕایانگرتووم بۆ گەڕان و پشکنینی ماڵی ئێمە هاتوون ، لەگەڕانەوەدا کۆمەڵێک شت لەگۆنیەدابوو لەسەرقاچم دانا لەوەئەچوو شتی ناو ماڵی من بێت ، کە تەوابوون دەستیانکرد بەلێدان وجنێودان پێم وتیان لەسایەی حکومەتدا لەونیعمەتەدا ئەژیت ناکر الجمیلیت ، بەلەقە کەوتنە گیانم و دەستیانکرد بە جنێودان بەکوردو سەرکردەو ڕابەران و پیرۆزیەکانی نەتەوەی کورد ، ساتەنەساتێک بەدەم لێدان و لەقەوە بەمنیان ئەوت تۆ موتەمەڕدیت ئینفیسالیت ، تۆ پێشمەرگەیت ، حەقی ژیانت نیە

خۆشبەختانە ماڵەکەم نزیک قوتابخانەکەم بوو کە لە نزیک مزگەوتی تەکیە ڕوتەبوو کە کرێچی بووین ، لە خانووی (حەمە نوری حاجی عەبدوڵڵە) دا بووین .

دوای ئەوەی لەقوتابخانەدا منیان گرتبوو شێخەی فەڕاش خێرا ڕایکردبوو بۆماڵی ئێمە ئاگاداری دایکم وخوشکمی کردبوو وتبووی وریابن چیتان هەیە لە ناو ماڵدا شکی لێئەکرێت ومەمنوعە خێرا لای بەرن بیگوێزنەوە ، نەوەک بێن ماڵەکەتان بپشکنن ، دوایی شتێک بدۆزنەوە ببێتەبەڵگەلە سەرتان ، بەوهۆیەوە ئازاری مامۆستا ئەدەن زیاتر توش ئەبێت ، بەسوپاسەوە خێرا (عومەر مەعروفی مامۆستاو نووسەر لەگەڵ ڕەئوف حەسەنی نووسەر ) کە هەردەکیان دراوسێمان بوون هاتبوون بۆماڵمان فریاکەوتبوون لەگەڵ دایکم وخوشکم هەرچی کتێب ونووسراو هەبوو ئەوەی شکی لێئەکرا ببێتەبەڵگە لە سەرم لایاندابوو ، گوێزابوویانەوە بۆ ماڵی خۆیان وهەندێک دراوسێ .

کتێبخانەکەم کۆمەڵێک کتێبی نایابی تیابوو مێژوویی کۆن و سیاسی وبیری پێشکەوتن خوازو سۆشیالیستی و چیرۆک بەکوردی وعەرەبی و دیوانی شاعیران کە بەهەموو ژمارەیەکی زۆربوون

بەدرێژایی ژیانم کۆم کردبوونەوە، ئەوەی شکی لێ نەئەکرا هێشتبوویانەوە ، کاتێک منیان هێنا بۆ بەردەم ماڵەوە گەڕابوون هیچیان دەستنەکەوتبوو بیکەنە بەڵگە لە سەرم کاتیک کارەکەیان ئەنجامدا یەکێک لە سەر بازەکان بە هاوڕێکانی وت هێچمان نەدۆزیەوە (مالگینا شی )، سەربازەکان چەند گونیەکیان سەرخست لەپشتی پیکابەکە دایان نا کەلە ماڵی ئێمە دەریانهێنابوو هەستمکرد کتێبی تیابوو لەگەڵ هەندێک شتیکە ، تومەز ئەوکتێبانەبوون کەلە کتێبخانەکەدا مابوون جێگەی گومان نەبوون کۆیانکردبووەوە لەگەڵ شتیکەی بەعەمەل هاتوو کەوەک تالآنی لەگەڵ خۆیاندا لەناو گۆنیەدا هێنابوویان گۆنێیەکیان لەسەر قاچم دانابوو ، هەموو سواری پیکابەکەبوونەوە و بەرەو ئینزیباتخانە گەڕانەوە ، لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا فرێدرام چاوێان کردمەوە ، عادەتی سەربازەکان وابوو هەرکەسێکیان بهانیایە بۆناو حەوشەکە تێیئەئالآن بەلیدان وشەق وزللەو لەقە وبەکێبل، بەوشێوەیە دەستیانکردەوە بەلێدانم وئازاردانم لە پێ کەوتم هێلاکبووم زۆر بێهیزبووم برسیبووم توانای ئەوەم نەمابوو هەڵسمەوە لەبەدەستیاندا ڕاکەم لەنێووان دوفەردەدا کەوتبووم ، دوای ئەوەی هیلاکبوون دورکەوتنەوەلێم ، سەیرمکرد پێاوێکی کەڵەگەت لەولامەوە کەتوە وەک بۆمدەرکەوت لە هۆش خۆی چووبێت وابوو لە جوڵانەوەیەکیدا کەدەم و چاوێم دی (حەمە ڕەشید ئەحمەد شانەبوو)، دنیا بەرەو تاریکی ئەچوو، هاتنەوە سەرم هەمیسان بەڕاکێشان و لێدان بەرەو ئەوژورەیان بردم کەلەتەنیشتی سەروی ئەوژورەوەبوو کەیەکەم جاربردمیان بۆی کە پیاوە قەڵەوە چاو کزەکەی لێبوو، کەتیغەیەکی تەنک هەبوو لەنێوان هەردو ژورەکەدا ، ئەگەریەکێک گوێی بنایە بەدیوارەکەوە، گوێی لە قسەی هەردو ژورەکەئەبوو. بەنیوە مردوویی بردمیانە ژورەوکەوە لەسەر ئەرزەکە فرێدرام لەنزیک دەرگای ژورەکە کەوتبووم ، تومەز برابووم بۆ ژوری تەحقیق بۆلێکۆڵێنەوە هەرچی جلەکانم هەبوو لەبەرم دایانکەند تەنها بەشی ژێرەوە مایەوە هەموویان پشکنی هیچیان دەستنەکەوت کە سەیرمکرد لە سەرمێزەکە سێکەس دانیشتبوون ، ئەو پیاوەم ناسیەوە کە لە قوتابخانە گرتمی ، دوکەسەکەی تر یەکیکیان پلەدار بوو عەقید خەلیل بوو کەلەدواییدا زانیم ئەوی تر نائب زابتێک بوو هەرکە فرێدرامە ناوژورەکە، لەبەردەمیاندا کەوتبووم ، ئەوانەی کەلێکۆڵینەوەیان ئەکرد ، ئەفسەرو ئەمن و ئیستیخبارات بوون ، دەستیانکرد بە جنێودانم وهەردەم دوبارەیان ئەکردەوە (کە ژورەکەمیان دیوە چەند خۆش ڕازاوەو پڕ فەرشبووە ، کەچی من ڕازینیم ودژی ئەم حکومەتە هەستاوم شۆڕشئەکەم ، بەپارەی حکومەت ئەژیم ، چاکەیم لە بەرچاو نیە ، جنێوی دوەمیان ئەوەبوو پرسیان ئەو هەموو کتێبەی (مەحکەمەی شەعب ) کەهەمە بۆچێمەوە بۆچێ دامناوە ؟وەرامم دانەوە ( محکمەی شەعب) ڕەسمیە ئیستالە بەغداد مەحکەمەئەکەن ومەهداوێ گەورە بەرپرسی حکومەتەو سەرۆکی ئەودادگایەیە ونزیکی ( زەعیم عەبدولکەریم قاسمە ) ئیتر بۆچی مەمنوعە ، یەکێکیان بە تورییەوە دەستی بەجنێودان کردو

وتی : ( انعل المحكمه ولابو المحكمەو رئیسها   واللی یوئیده ) یانی نەعلەت لەمەحکەمەو خاوەنەکەی وسەرۆکەکەی و ئەوەی لایەنگیریەتی . تومەز  کاتێک لە ماڵەوە دایکم و خوشکم لەگەڵ کاک عومەرو کاک ڕەئوف گەڕابوون و کتێبیان لادابوو ، کتێبەکانی مەحکەمەی شەعبیان بەگرنگ نەزانیبوو لانەدرابوون وایان زانیبوو هیچیان لەسەر نیە .

یەکێک لەو کەسانەی بۆ لێکۆڵینەوە  دانیشتبوو ئەوکەسەبوو کەهات بۆگرتنم ، پرسیاری لێکردم : ناوت چیە،،،؟ ،  دوایی وتی تۆ تاوان باریت تۆ تەنزیمیت ولەموتەمڕدینی (پێشمەرگەیت ) حەقە بتکوژین وهەر ئەمشەو ئەتکوژین ، تۆدژی ڕژێمیت ، پێمان بڵی شێوەی کارەکانت چێە لە ناو موتەمەڕیدیندا و کێ ئەناسیت پێمان بڵێ ناوەکانیان چیەو کێن ،،؟، لەوەرامدا وتم :  کەس ناناسم من مامۆستام ، پەیوەندیم بە هیچ لایەکەوە نیە ، وتی مانای ئەوەیە تۆ ڕاستیمان پێنالێیت ، دیارە تۆ یارنەتیمان نادەیت ، لەوکاتەدا کە لە سەر زەویەکە کەوتبووم  ، بەعەرەبی وتی وادیارە تینوویەتی (شەربو شویەکۆلا ) یانی تۆزێک کۆلای بدەنێ بابیخواتەوە ، ڕویتێکردم وتی حەز ئەکەیت تۆزێ کۆلابخۆیتەوە ، منیش لە قسەکانیدا تێگەیشتم کە مەبەستی لێدانبوو ، هێشتا لەقسەکانی نەبووەوە ئەوەندەم لاخۆشبوو ، کۆمەڵێک سەرباز پڕیانکرد بە هەردو قاچما وبەڕاکێشان بردمیانە دەرەو بۆ ژوری سزادانی بەرامبەر ، سەربازەکان تێمئالان  وەک مەسەلە کوردیەکە دەلێت (شەل وکوێرم ناپارێزم ) بەزللەوشەقی پۆستاڵ وکێبڵ و دار ولەقە بۆ سەرم ولەش وگیانم  هەر ئەوەندەم خۆشبوو یەکێک لە سەربازەکان بەپۆستاڵەکەی شەقێکی هەڵدا لە سەرم ، خوێن فیچقەیکرد و ئەوناوە پڕبوو لەخوین ، بورامەوە ئاگام لەخۆم نەما ،نازانم دوایی چیاًن لێکردوم ، کە هاتمەوە سەرخۆ لەناو ئاودەستەکەدا خۆم بینیەوە سەرم لە ناو سیفۆنی ئاودەستەکەدابوو ، دەوروپشتم خوێنی پێوە دیاربوو سەرم تەڕبوو ئاوکرابوو بەسەرمدا بینیم دو سەرباز لەبەردەم ئاودەستەکەدا بەدیارمەوە وەستاون دەستمبرد بۆسەرم دیم پەڕۆیەکی پیسی لەسەربوو کەدەستم لێدا بەگەورەیی سەری پەنجەیەک جێی شەقەکە ئێسکی کەللە سەرم شکابوو چاڵکرا بوو .

[ لە ئاسەوارو کاریگەری شەقی پۆستاڵەکە وئەو شکاوی وچاڵەی سەرم لەنزیک ناوچەوانم لەژێر مووەکانەوە بوو جێگەی نۆکێکی تیائەبێتەوە ، کاریکردە سەر ژیانم کەجاری واهەیە بۆماوەی چەند خولەکێک (یەک دوو دەقیقە) ئاگام لەخۆم نامێنێت شتم لەبیر ئەچێت لە وانەیە لە نووسینیشدا کە ئەنووسم وەک وڕێنە شتی ئەوتۆی تێکەلاوبکەم کە پەیوەندی بە مەبەستی نووسینەوە نەبێت  . وەک گۆڕانێک بەسەرمدا هاتبێت وابوو ، بەدرێژای ژیانم  کاریگەری بەردەوامی خراپی تێکردم ، هەربەردەوام بوو ، دوای بەربوونم کەئەچوومەلای دوکتور چارینەبوو ، پێم ئەوترا چاری نیە  برادەرەکانم زۆر جاریش هەستیان بەو(زاهیرەیە ) بەو دیاردەیە کردبوو کەزۆر جار توشی هەڵەو زیان وبیرچونەوەی کاتی بووم] .

کاتێک بەهۆش هاتمەوە سەرم کاسبوو ووژەی لێوەئەهات ورپووم. لەش بەئازاربووم، سەبازەکان کاتێک دیان هاتوومەتەوە سەرخۆ هەردو پەلیانگرتم ڕآیانکێشام سەریان دەرهێنام لەناو ئاودەستەکەدا بەرەو بەیانی بوو ،بردمیانەوە ناو ژورەکەی دوێنی بۆلای ئەو دوکەسەی خەڵکی سلێمانی ، ڕۆژبووەوە، پیاوەچاوکزەکە زۆر بەدەورما هات خوێنی بۆسڕێم و دڵخوشیدامەوە وتی پێاو ئەمەی بەسەردێت ، ئەبێت بەرگەبگرین مردن خۆشترە لەوەی قبوڵی ئەم زوڵمە بکەین وببینە پیاویان ، ئەوەندەی پێنەچوو هاتنەوەسەرم بۆ ناوحەوشەکە بەرەو ژورێکی کە بردمیان ، بەدەم ڕاکێشان ولیدانەوە بردمیانە ژۆرێکی نیوەتاریکەوە ، دیم تارمایی لاشەیەکی کەتەو گەورە کەوتبوو لە ئادەمیزاد ئەچوو.

***





ڕەئوف و محەمەدی حاجی فەرەجە فەندی

# گرتنی بەیان لەناو لۆریەکی گەراجەکەی
# خێڵی حاجی فەرەجە فەندی

وەک باسمکرد کەبردمیانە ژورەکەی سەردالآنەکەی دەروە بەڵام دەرگاکەی لەلاوەبوو بەسەرتەنوورەکەدا ئەیڕوانی بەلێدان وڕاکێشان بردمیانە ناوەڕاستی ژورەکە لە نزیک تارماییەک لەو ژورە تاریکەدا فرێیاندام ، هێزی ئەژنۆم نەمابوو نەم ئەتوانی بەپێوە بووەستم دوسەرباز پەلیان گرتبووم ، دوایی کەچاوم بەتاریکیەکە ڕاهات دیم پیاوێکی کەتەی زلی کەڵەگەتی زۆر قەڵەو لەسەرخۆڵی ژورەکەدا کەوتبوو وەک بورابێتەوە وابوو جل لەبەریدا نەمابوو دڕابوو ،خوێنی مەییو لەم لاوئەولای دیاربوو بەسەر خۆڵەکدا بڵاوبوو، دوسەربازەکە لەگەڵ ئەمنێک ،دەستیان دایە دەستم وتیان ڕاوەستە بەپێوە ، دوسەرباز بەدارەوە لە پیاوەکە چوونەپێشەوە ویەکێکیان دەمی دارەکەی ئەکرد بەورگیدا ویەکێکیان بەلەقە تێی بەربوو وتی هەڵسە ، پیاوە کەوتوەکە بەئاگابووەوە سەری هەڵبڕی ، هەمیسان داوایانلێکرد کە هەڵسێت ، هەوڵیدا نەیتوانی ، نرکە نرکی بوو بەدەم ئازارەوە ئینالآند دەنگی دەرنەئەهات ، وتی ناتوانم هەڵسم هەر بەدانیشتنەوە سەیرێکی منی کرد دیم هەردو چاوی لەبەرخوێن بەحاڵ دیاربوو هەڵنەئەهاتن و ئاوسابوون هەموو گیانی خەڵتانی خوێن بوو .

ئەمنەکە پرسیاری لێکرد : وتی ئەمە ئەناسیت بەزەحمەت قسەی بۆئەکرا لەوەرامدا وتی : من نایناسم و قورئانی خوارد کە قەت منی نەدیوە، منیش لەدورەوە ئەمناسی کە ( ڕەئوفی حاجی فەرەجە فەندی )بوو ، لەگەڵ براکانی خاوەنی گەراجی فەرەجە فەندیە، یان یەکێکی تریانە ، بەڵام قەت بواری ئەوەمنەبووە لەژیاندا قسەی لە گەڵبکەم ، بیناسم هێچ کەسێکم لەو خێزانە بەبینین نە ناسیوە، یان، بیان دوێنم لەدواییدا پرسیاریان لێکردم : تۆ ئەم پیاوە ئەناسیت وتم من نایناسم ، داوایان لێکرد هەڵسێت بە پێوە ڕاوەستێ زۆر هەوڵیدا نەیتوانی ، دوایی دو سەرباز چوونە ژێر باڵی بەزەحەت بەرزیانکردەوە ، پشتیدا بەدیوارەکەوە بەوهۆیەوە توانی ڕابووەستێت، هەردەم خەریکبوو بکەوێت سەربازەکان نەیان ئەهێشت بەلادابێت، لەولاشەوە منیان گرتبوو نەکەوم .

وتیان لەشی خۆتی پیشانبدە ، ئەویش زۆر شوێنی لەشی بەدەرەوە بوو جلەکان لەبەریدا دڕابوون تەنها ئەوانەی ژێرەوەی بە نیوە دڕاوی مابوون ، کە زۆر نزیککرامەوە لێی دیم بەهۆی لێدانی زۆرەوە قاچ ودەستی یەک پارچە شینە و ئاوساوە و بەلای ڕەشدا ئەیانڕوانی خوێن قەتماغەی کردبوو لە سەریان ، لەدواییدا سەربازەکان ورگیان وپشتیان هەڵدایەوە پیشانیان

دام ،  دیم به شێوەی قاچ وقولی شین ورەش تێکەڵاوە بستێک له لەشی بەساغیٚ نەماوە خوێن لەسەری قەتماغەیکردوە ، سەرم سوڕما ئەم پیاوە چۆن لەژیاندا ماوە ، ئەم وێنەیە بەڕاستی کاریتێکردم کارەساتێکی مرۆڤایەتی بوو ، پیاوێکی زەلیل بوو بەدەست ئەم دراندانەوە ئەیناڵاند وچەرمەسەری وئازار ئەدرا. موچرکە یەکم پیاداهات لەموچرکەی سەیرکردنی برین وخوێن ئەچوو ، بێهێزبووم ، خەریک بوو بەتەواوی ببورێمەوە ، لەسەر پشتی ورگی پێست وخوێن تێکەڵاوبوو خوێن بەسەریدا مەییبوو تائەوکاتە له ژیامندا وێنەی ترسناک وسامناکی پڕبە بەزەیی و پڕتاوانی لەو جۆرەم نەدیبوو کەمروڤ لەوکاتەدا هەموو ناخۆشیەکانی  مردنی بەبیردا ئەهات، هەرکەسێک ئەوپیاوەی ببینیایە  دەرونی بەزەیی جۆشی ئەخوارد  نەفرەتی لەهەموو تاوان بارو تیرۆریست خوێن ڕێژ ئەکرد ،  لەدڵمدا پرسیارم ئەکرد ئایا مرۆڤی واهەیە ئەوەندە تیرۆریست وتاوانکار بێت ، مرۆڤی وا هەبێت وا له مرۆڤێک بکات ، ئەوەی بەسەر بهێنێت تـا وشـەیـەک بـدرکێنی وڕاستی بڵێت دان بنێت بەتاوانێکدا  ئەگەر ئەنجامی دابێت یان نا .  ئێمە چـۆن گیـرۆدەی دەستی ئەم عەرەبە نەژاد پرست و جاهیلانە بووین که هەرگیز گیانی بەزەییو مرۆڤایەتی لەناو خـوێن هـەناویاندانیـەوە مێـشکیان لـەبیـری تـاوان و پیـاو کوشـتن هـیچ بـاوەڕێکـی کـەی تیاجێگەنابێتەوە

یەکێک له ئەمنەکان ڕوی تێکردم و زللەیەکی لێدام و وتی :

ئێـمە لەوە خراپترت لێئەکەین ، ئەگەر ڕاستی نەلێێت وناوی برادەرکانت نەلێیت بەپێچەوانەوە ئەوسا خۆت ئەبینیتەوە ، دوایی وتیان :  دەی بۆی باسبکە چیت لێکراوە ، کاک ڕەئوف بەدەم ناڵە و نرکەو ئازارەوە که دەمی گۆی نەئەکرد تا وشەیەک دەرئـەچـوو لـەدەمـی مـاوەیـەکـی ئەخایاند  وتی : کۆڕم بەخوا ،،، لەمن خراپترت ،،،، لێئەکەن ، دەبینیت ،،،،  منیان بەچی دەردێک  ،،، گەیاندوە ، بەخۆڕایی و بێگوناه و بێتاوان گیراوین ، نازانین ،،، کیٚ کۆمەڵێـک بەیانی  ،،، فرێداوەتە ناو لـۆری بـارەکەوە کەلە گەراجەکەی  ،،، ئـێمەوە بەنیـازبووە بەرەو قەڵادزیٚ بچێت ،،، ئێمە ئاگامان لێینەبووە  ،،، له ئەنجامدا ئێمەیان گرتوە ،،، بەم دەردەیان گەیاندووین ،،، ، ئاگامان لەهیچ نیە وکەس ناناسین  . وتم بەڕاستی منیش ئاگام لەهیچنیەوە بەخۆڕایی گیراوم  باوەڕ بکە ساڵێکیش زیاترە بەلای گەراجی ئێوەدا نەڕۆیشتوم  و نەمدیوە ، وتیٚ : ئیتر تاوانەکە ملی ئێمەی گرتوەتەوە ، بەسەر ئێمەدا ساغکراوەتەوە .

کەلە دەم و چاوی نزیک بوومەوە  دیم پێستی ئاسایی پێوەنەماوە  هەمووی شێنەو ئاوساوە خوێنی بەسەرەوەیە هەردو چاوی خەڵتانی خوێنە  ، سەری له چەند لایەوکەوە شکاوە هەمووی خوێنی بەسەردا مەییوە  وتی : ئەوە چەند ڕۆژە لێمئەدەن ،،،  وەڵله کەس ناناسین ، ئەڵێن باوەڕمان بەم قسانە نیە ، ئێوە یارمەتی پێشمەرگەئەدەن ، ئەبیٚ هەریەکێـک بناسـن ،،، له

پارتی و پێشمەرگە ناویان پێمان بڵێن ، دواجار بە ناچاری ئێمەیش ،،، وتمـان کەسـێکمان ئەناسی لەم گوزەرەدا باسی کوردایەتی ئەکرد ناوی ( عەباسـی ئیبـراهیم دەروێـش ) بـوو ، ساڵێک زیاترە مردوە ، دوکانی براکەی کەناوی عەلیە [مەبەستی عەلی ئیبراهیم دەروێش بوو ] لەژێر ئوتێلەکەی ئەوقافە نزیک گەراجەکەمانە ، دوای ئەمە خۆی بەپێوە ڕانەگیراکەوت

# له بێئاگایی عەبدولکەریم قاسم
# و هێزە سیاسیە نیشتمانیەکان

لەتەحقیقدا لەژوری لێکۆڵینەوەدا لێدانی زۆرم خوارد کەبۆچی کتێبی مەحکەمەی شەعب لە کتێبخانەکەمدا هەیە ووجنیویاندا بە مەحکەمەو ئەوەی لایەنگیریانە و ئەوەی مەحکەمە ئەکات و گەورەکەی ، دەرکەوت زەعیم سدیق ودارو دەستەکەی ونەژاد پەرستانی عەرەب و بەعسیەکان وعونسوریەکان دژی هەموو دەستکەوتەکانی گەلی عێراقن بەتایبەت گەلی کوردمـان ، دژی حکـومەت بـوون هەردەم لەژێـرەوە خەریکـی کـاری دژایەتـی و پلانگێـڕی بـوون بـەنیـازی کۆدەتایەک و هاتنەسەر کورسی حوکم بوون دژی عەبدوالکریم قاسم ، هەموو کارەکانیان دژ بەحکومەت و گەڵی عێراقبوو بەوهۆیانەوە دژی مەحکەمەی شەعب و دژی عەبدولکەریم قاسمیش بوون ، لە پەناو سێبەری حـوکمی عەبدولکەریمـدا ئیـشیان بۆمەبەسـت و ئامـانجی بەعـس و نەژادپەرستانی عەرەب ئەکرد، لە ژێرەوە و بەنهێنی، کە زۆرجاریش ئێمە بێئاگابووین لەکارو چالاکیان و پیلان و ڕەفتاری نامرۆڤانەیان بەرامبەر بەکوردو گەلی عێراق .
شوێنە فەرمی و فرمانگەکانی میریان کردبووە بنکەو مۆڵگە ودار دەستێک بـۆ بەرژەوەنـدی وراپەڕاندن و ئەنجامدانی کارەکانی نەتەوەپەرستیان بەتایبەت دژی نەتەوەی کورد وبەرامبەر هەموو بیری پێشکەوتنخواز ودیموکراتی وکاربەدەستانی نیشتمانپەروەر لەعێراقدا .
من لێرەدا ئەلێم ئەبووایە سەرکردەکانی کورد وخاوەن ئەزموونەکان و سیاسەتمەداران و پارتی کۆمۆنیـست و دڵـسۆزانی دەوری عەبـدولکەریم قاسـم ئاگـادار بوونـایە لە هەڵـس وکەوتیـان ،هەستیان بکردایە و وەک پێویست هەستانایە بەکاری پێویست دژیان ، سـنورێکیان دابنایـە بۆخراپەکـاری و پیلانگێریـان تـا گەشـەنەکەن و بەهێـزنەبن و ڕەگـی خراپەکـاری دانەکـوتن وسەرنەکەون ، ئەبوو ڕێگە لەسەرکەوتن وپیلانگێڕیان بگیرایە ، ئەبووایە نوێنەرانی کورد هەر بەردەوامبوونـایە لە پەیوەنـدی و دیـالۆک ونەیەڵـن مەیـدان چۆڵببێـت بـۆ ئەونەژاد پەرسـت وشۆڤێنیانە کە کاروکردارو پیلانیان زۆر ئاشکراو ڕونبوو ، کەئەبـووایە عەبـدولکەریم ئاگـادار بکرایەتەوە لێیان . کۆمۆنیستەکان دەوریان چۆڵکردبوو ، عەبدولکەریمیش خۆی تاککردبووەوە دەوری چوڵبوو لە دڵسۆزان و نیشتمانپەروەران .
ئـێمەی زینـدانیانی ئینزیباتخـانە دەرکمـانکردبوو ڕۆژانە ئەمانـدی و ئەبیـست خراپەکـاری ودژایەتیان، لەماوەیەکدا ڕۆژانە نامەمان ئەناردە دەرەوە ئاگـاداری ڕێکخستنەکانی پارتیمـان

ئەكردەوە  بۆ ئەم دیاردە نەخوازراوە ، داوامانئەكرد كە ئاشكرا بكرێن وگەلـی كـوردو عێـراق ئاگاداربكرێنەوە لەدوژمنایەتیان  وبەئاگابن لەمەترسی هەنگاوەكانیان { هەردەم و هەمووكات وسات ، لەسەر دەستی عەرەبی جاهیل و ڕەگەز پەرست ئەم كارە هەر لەناودایە هەموو كات بەردەوامە و چاوەڕوانكراوە وریایی ئەوێت كورد نەهێڵێت ئەوبیرە ڕەگەز پەرستیە لە ناوكۆمەڵدا گەشەبكات وكارەساتی كۆدەتاكەیان وكەوتنی عەبدولكەریم قاسم هاتنی بەعس دوبارەنەبێتەوە . كە هەمیسان جارێكی كە دوبارە بەعس لەساڵی ١٩٦٨دا هاتنەوە سەركورسی  ئەو هەموو تاوانە بێوێنانەیان  دژی گەلی كوردستان ئەنجامدا ، كەنابێت هەرگیز تاوانەكانیـان لـەبیـر بكـەیـن هەردەم وەک گیاكەڵە لەبندا بیانبرێنەوە نەهێڵین  دوبارە تۆویان سەر هەڵنەدەنەوە .

وەک باسكرا لەكاتی خۆیدا بەنامە هەموو ڕۆژێک لەڕێگەی تایبەتیەوە  لەناو ئینزیباتخانەوە نامەمان ئەناردە دەرەوە  ئاگادارمان ئەكردنەوە لەكاری دوژمنانەی كاربەدەستانی ئینزیباتخانە كەنمونەی پیلان گێڕیبوون بۆ هەموو عێراق  دام و دەستگاكانی كەی عێراق}.

بۆ جاری دووەم بردمیانەوە بۆژوری لێكۆڵینەوە لەوەپێش باسمكرد لەسەركتێبەكان زۆریـان لێدام چەند دانەیەكیان  بەدەستەوەبوو  هەمیسان ناویان نووسیمەوە ودۆسێیەكیان لەبەدەمدا بوو وتیان : چی ئەزانیت بیڵی ، لەگەڵ ناوی ئەو كەسانەی لەگەڵت ئیشئەكەن ،كێن ؟ وتـم من فرمانبەرم مامۆستام  پەیوەندیم بەكەسەوەنیەو  هیچ نازانم  كەسناناسم  لەگەڵ كەس ئیشم نەكردوە و باسی سیاسەت ناكەم دورم لێی، تۆزێک ڕاوەستان وئیشارەتیان بۆ سەربازەكان كرد كە كۆلام   دەرخوارد بدەنەوە ، هەرئەوەندەی بڵێیت  یەک ودوو هەردوپەلیان ڕاكێشام بۆژوری و ئەشكەنجەدان پاڵە پەستۆیان بوو بۆلێدانم  لێدانیان بەجۆرێكبوو ئەو دنیام  بەچاوی خۆمدی وەک جارەكانی تر لێدانی خەست ڕاكێشان لەقەو زللەی چاكم خوارد ، كۆلاكـەیـان ئـەوەنـدە خەست بوو هەر خواردنی لەبیربردبوومەوە.، بێهۆشبووم  ئاگام لەخۆم نەمـا نەم زانـی ئیتـر چەندیتریان لێداوم كەبەئاگابوومەوە هەستم كرد هەمیـسان سـەرم لە نـاو ئاودەسـتـەكەدایە و بەمەزەنە چەند سەعاتێک تێپەڕبووە  دوایی ڕایانكێشام  بۆناو حەوشەكە لەبەینی فەردەكاندا فرێدرام  لەگەڵ ئەوهەموو فەقیرو هەژارو گیراو و گیرۆدانە كەلە حەوشەكەدا كەوتبوون  ، گوێم لە نوزەو هەناسە ئازارو ناڵەیان بوو ، ئەوشەوە هەتابەیانی مامەوە لە نزیكمەوە زۆركەسی كە كەوتبوون هیلاک وپەرێشان و بێتوانا نوزەی ئازاریـان ئەهـات  یەكتەخـتە هەمـوو كەوتبـوون زۆریان ئاگایان لە خۆیان نەبوو بورابوونەوە ، بەیانی تاریک ڕونی (حەمە ڕەشێد ئەحە شانەم ) بەدیكرد لە نزیكمەوەیە  یەک تەختە كەوتبوو، وەک بورابێتەوە وابوو ، ویستم قسەی لەگەڵ بكەم بانگمكرد بەئاگابووەوە تۆزێک جوولا ، سەری لێم نزیكبوو  چاوی كـردەوە كە سـەیری ڕویمكرد هەمووی بریبداربوو شینبوو خـوێنی پێوەبـوو چـاوی بەزەحـمەت بـۆئەكرایەوە  لەبەر

ئازارولێدان ئاوسابوون زۆر دیارنەبوو ، وتم کاک حەمە ڕیشێد ئاگات لەخۆتە ، وەرامی دامەوە : ئەوەتەی گیراوم بەلێدان و ئازاردان وئەشکەنجەدانمەوە خەریکن بوارم نادەن ، وتم : ئەرێ کاک حەمە ڕەشێد پێم ناڵێیت ئەمە چۆنە چۆنبوو و چۆن ڕویدا ، چۆن ئێمە تێووەی گلاوین ، وابەئاسانی کەوتینە بەردەستیان گیراین ، کەسێک نەبوو ئاگادارمان بکاتەوە تافریای خۆمان بکەوین و نەکەوینە بەردەستیان وداویان ...؟ وادیارە من دوای هەموتان گیراوم ، وتی من دەوری بەیانی گیرام ، لە نانەواخانەکەدا کارم ئەکرد لەپڕجێبێک هات کۆمەڵێک سەرازی تیابوو یەکێک لە ناویدابوو ئیشارەتی کردبۆ دوکانەکەم ، پرسیان حەمەڕەشید کێیە و پەلاماریان دام کەلەپچەیان کردە دەستم ، ئیتر چۆن ئەمبینیت فریای هیچ نەکەوتم ، وتم : ئەیچۆن من نەمزانی ئەی کەسێک نەبوو ، ئاگادارم بکاتەوە تافریای خۆم بکەوتمایەو چارێکی خۆمبکردایە کەچەند سەعاتێک بەسەرگرتنی ئێوەدا تێپەڕیوە !! ؟. وتی : ڕوداوی لەوجۆرە پیاو وکەسوکار پەشێوئەکات بیری نامێنێت ئاگای لەخۆی نابێ شپرزە ئەبێت سەری لێئە شێوێت وشتی لە بیرئەچێتەوە ، ئیتر کار لەکار ترازاو کەوتینە داویانەوە ، ئەبینی هەموو گیانم برین وخوێنە ،توانای جوڵانم نەماوە نیوە مردو کراوم هەرساتە نەساتێک دێنەوەگیانم ئەمبەن بۆلێدان وکاروانە ، دو ڕۆژە لەم حەوشەیەدا کەوتوم لەبەر سەرما ، برسی تینوو بەدەم بەئازارەوە هەردەم ئەناڵێنم و توانای هەڵسانم نیە ، ئەنوەر دارتاش عەلی ئیبراهیم دەر وێش لەولای منەوە کەوتون عەلی هەر قسە ئەکات وەک وڕێنە بکات وایە .

***



. تۆفیق حاجی عەلی **حەمامچی هەر نەیزانی لەسەر چیی گیراوە ،؟.**

# ژورەکەی قادربرسی

دوای ئەوەی دنیا ڕوناکبووەوە ڕۆژهەڵات  سەربازەکان بڵاوبوونەوە هەریەکەیان بەشی خۆی بەلەقەو کێبڵ ودار  لێدانیان بەرکەوت کە پاڵەپەستۆیانبوو بۆلێدانمان . لەدوای ماوەیەک لە لێدانی زۆر کۆمەڵێک سەرباز بەرەوڕوم هاتن بەدەم لێدانەوە ڕایانکێشام بۆ ئەو ژوری یەکەمجار کە پیاوە چاوکزەکەی لێبوو دوای ماوەیەک کە هاتمەوە سەرخۆ سەیری  دەورووپشتی خۆمم کرد بینیم لایەکی ژوورەکە پڕکراوە لە فەردە (نوقڵی) ترش وشێرین و کارتۆنی گەوەرە کە لەسەریان نووسرابوو  (ڕۆثمان و مارلبۆرۆ) وتیان ئەم نوقڵ وپاکەتانە هی (مستەفای شێڕە) دوکانی هەیە لە قەیسەریەکدا ، نەمئەناسی  وتیان برای کەمال قادری حاکمە ..لەژورەکەدا دیم کە چوارکەسی لێیە، دوسەربازە سیخوڕەکانی لێنەمابوو ، داویی هەرچوارکەسەکەم ناسی وباسی خۆیانکرد بۆم لەو چوار کەسە یەکەمیان  ئەوپیاوە چاویلکە لە چاوەی دوێنێبوو  کە وتی ناوم قادر برسیە  (دوایی زانیم کە پیاوێکی هەڵکەوتوی شآرەکەبوو ناوداربوو بەقسەی خۆش ونەستەق ناوی دەرکردبوو وشآعیربوو  برای عەبدولرەحان بوو کە شەل بوو لەپێکەوتبوو لە ناوعەرەبانەدا هات وچۆی ئەکرد کۆمۆنیستێکی ناوداری شآرەکەبوو پیاوچاکبوو ) کە زوترنەم ناسیبوو . کەسی دووەم عەبدولی حآجی محەمەدی سلۆ )بوو لەوەپێش نەم ناسیبوو بەڵام برای حەمەڕەشێدی حاجی محەمەدی  سلۆ )بوو کە هاوڕێی قوتابخانەم بوو ئەندازیاربووماڵێان لە گەڕەکی قەزازەکانبوو بنەماڵیەکی بووەو ناوداری شآرەکەبوون .

کەسی سێیەم  کاکە ( حەمەی فەرەجە فەندی )بوو خاوەنی گەراجی فەرەجەفەندی کەلۆریە پڕلە بەیانەکەی تیاگیرابوو ، کەسی چوارەم  (ئەنوەر سەعید دارتاش) بوو کەهاوڕێم بوو لەهەمووکارێکی ڕێکخستن  و ئیش وکارمان لەڕێزەکانێ پارتیدا بەیەکەوە بووین  وەک براو هاوبیر بووین کەوتبوو نیوەبوراوە بوو.

لەبەردەم ژورەکەماندا سەربازێک بەچەکەوە هەردەم لە بەردەرگاکەدا وەستابوو ، دوای ماوەیەک فرسەتم هێنا و ڕومکردە ئەنوەر وپێم وت : پێم ناڵێیت ئەم کارە چۆنبوو بۆچێ ئێمە گیراوین . کەسنەبوو لەپێشەوە ئاگادارمانبکاتەوە ،تافریای خۆمان بکەوتینایە ...؟   ئەنوەر وتی : منیش بێئاگابووم لەمەکتەب سەرلەبەیانی لەپڕ گیرام فریایخۆم نەکەوتم ، کاک عەلی ئیبراهیم دەروێش ڕۆژێک پێش ئێمە گیرابوو من و حەمەڕەشێد بەیەکەوە سەرلەبەیانی گیراین ، وتم : ئێوە لەپێش منداگیراون  ئەیچۆن ئاگادار نەکرامەوە کەچەند سەعاتێک دوای ئێوەگیرام... ؟ ، وتی ئیتر کارەکە واهات بەیانەکانی ناو لۆریەکە کەلە گەراجەکەدا گیراوە کە

بەهیچ شێوەیەک پەیوەندی بەئێمەوە نەبووە ،گڕی ئاگرەکەی ئێمەشێ گرتەوە ، وتی جاری واهەیە کەپیاو بەرگەی لێدان وئازاردان وئەشکەنجە ناگرێت لەتاو گیانی خۆی شتی وا ئەڵێت وئەدرکێنێت کەپەیوەندی بەو موشکیلەوە نیە ، ئیتر کارەکەواهاتووە ئەبێت شانی بدەینە بەر ئارام و بێدەنگ و خۆڕاگربین ئێمەیش تاگیان لە لەشماندابێت ئەبێت بەرگەبگرین ، نەیەلێن خەڵکی تر وەک ئێمە بەخۆڕایی و بەوشەیە توشی ئەم ئازارو ئەشکەنجەو لێدان وستەمکاریە ببن.

ئە و ڕۆژەمان تانیوەڕۆ بردەسەر بەرلێدانی ئەوتۆ نەکەوتین دوای نیوەڕۆ دەستیان کردەوە بەکاروانەو لیدان ، کەشەوداهات بەنۆرە ئەبراین بۆلێدان وکاروانەو لێکۆڵێنەوە وپرسیار هەردەم داوای ئەوەیان لێئەکردین کەناوی کەسانی کە بڵێین خەڵکی بەدەمە بدەین ، ئەوشەوە هەریەکەمان بەشی خۆمان خوارد لەلیدان و ئازاردان. هەر ئەو شەوە ئیمەێش پەیمانماندا و ، بەخاکی کوردستان سویدمان خوارد ،ئەگەر کوژراوین ناوی کەس نەبەین و بەرگەبگرین ،ئەوکاتەمان بەفرسەت زانی ، کەزیاتر وباشتر یەکتر بناسین لەیەکتر دڵنیابین ، شەوانە لەتاریکیدا قسەبکەین بەسەربەستی ،ڕێوشوێنی گونجاو بگرینەبەر بەرامبەر بەم کارەساتەی ئینزیباتخانە .

بەراستی کاک قادربرسی ڕۆڵ وهەڵوێستی مەردانەو ئازایانەی هەبوو و خاوەن بیری بەهێزو بەتین بوو خۆڕاگر بوو ڕۆژ بەڕۆژ نرخ و ڕێزی لە لامان زیاتر ئەبوو دەرکەوت بەحەق کەپیاویکی کورد پەروەرە.

هەریەکەمان ئەوشەوە لەسەر زەویەکە سەرمان نایەوە پێڵاوەکانمان کرد بەسەرین بەدەم ئازارو هاوارەوە تلاوتلمان ئەکرد هێشتا چاومان نەچووبووە خەو ،کات بەرەو بەیان ئەچوو ، لەپڕ هاوارو ناڵەو غەڵبە غەڵب پەیدابوو ، لەپەنجەرەکەوە دیمان کۆمەڵێک سەرباز پیاوێکیان بەدەستەوەبوو قاچ ودەستیان گرتبوو وەک مردوی دارەمەیت هەلیان گرتبوو ، جارجارەش لەسەرزەوی دایانئەناو ڕایانئەکێشا لە مردو ئەچوو بەرەو ژوورەکەی بەرامبەرمان هێنایان لە ناو ژورەکەدا فرێیاندا ودەرگاکەیان داخست کە هەردو وژورەکە لە سەر دالانێک بوو دەرگاکانمان بەرامبەر یەکبوو ئەگەر دەرگای هەردو ژورەکان کراوەبوونایە یەکترمان ئەبینی ، کە دالانەکەی بەینمان دومەتر ئەبوو. بەیانی زانیمان ئەوپیاوە (کاک حەمەڕەشێد ئەحمەد شانەیە) ، لە ناو دالانەکەدا خوێنمان بینی ڕژابوو ڕێچکەی کردبوو تاناو ژورەکە ، لەدواییدا زانیمان کە شەو بردویانە بۆکارێزەوشک بەستویانە بەپشتی دەبابەوە ڕایانکێشاوە ، بەوهۆیەوە پشتی هەمووی بریندارببووە پێستی پێوەنەماوە خوێنی پیادێتە خوارەوە لەژورەکەدا نیوەمردو کەوتوە لەتاو ئازار ئەناڵێنێت بەحاڵ نوزەی تیایە ، دوای دەڕۆژێک بینیمان پێستی پشتی هەڵداوە و لێی

بووەتەوە لە (کەوڵ )وچەرم ئەچوو ، ژورەکەی ئێمە هەروەک خۆیمابوو پێکهاتبوو لە قادر برسی ئەنوەر دارتاش و عەبدولی حآجی محەمەد سلۆ و کاکە حەمەی فەرەجەفەندی ومن . قادر برسی وەک باش ناسیمان پیاوێکی ورە بەزو قسەخۆش و شآعیربوو نەکتەو سەرگوزەشتەی زۆری لابوو ، بووە ئەستێرەی گەشێ ژورەکەمان ، بەقسەوکرداری و برِووای بەرزی بە نەتەوەکەی ئێش وئازارەکانی لەشمانی کەم ئەکردەوە وزەو برِواو ورەیەکی نوێی پێ بەخشێن ، ئەوشەوە بارانێکی زۆر باری سەرماشی لەگەڵخۆی هێنا هەتابەیانی هەڵئەلەرزین ،لەبەربرین ئازارو وزامەکانی لەشمان ئارامامان نەبوو لەبەر برسێتی و ئازاری زۆری برینەکانمان هێزمان نەمابوو ، زەویەکە روتە و هەمووی خۆڵەو ساردە ، راخەرمان نەبوو جڵ بەرگ لەبەرماندا درِابوو نیوەی لەشمان بەدەرەوەبوو سەرینمان چووتەپێڵاوەکەی پێمانبوو بەوشێوەیە شەوانەمان بەسەرئەبرد ، لەبەر فەردە نوقوڵ و کارتۆنە جگەرە شوێنی راکشآنمان نەبوو ، هەر لە مەلابانگدانەوە هەڵیان ئەکوتایە سەرمان بەلەقەو لێدان ودار تاهیلاک ئەبوون ، کە ئەبێت هەڵسین هەریەکەمان ئەبێت هەڵتروشکێت ، لەبەر سەرماو برسێتی وئازاری لەشمان و برینەکانمان هەڵ ئەلەرزین ئاگامان لە خۆمان نەمابوو خواردنیشمان لەبیر چووبووەوە ،لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا دوسەرباز ئەهاتن دەستیان ئەگرتین وبەرزیان ئەکردینەوە ئەیان زانی ناتوانین خێرا هەڵسین لەگەڵ وهەڵساندا ئەبووایە لەماوەی چەند دەقیقەیەک بچوینایە بۆ توالێت ودەستشتن لەچوون و گەرِانەوەدا سەربازەکان بەرِیز خەریکی لێدانمان بوون ، بەشەقی بەر ئەژنۆ ودار کێبڵ بەسەرو پشت وگیانماندا لەهەردو سەر بەرێ ئەکراین .

دوای چەند رۆژێک هەریەکە بەتانیەکی پیسی درِاویان پێدان ، شەوانە ئەبراین بۆلێدان هەرکەسە بە جۆرێک و هەموو رۆژێک بەشی خۆمان هەبوو لە ئەشکەنجەو ئازاردان و لێدان هەموو بەیانیەک لە مەلانابگدانەوە ئەبووایە دابنیشینایە ، خۆمان بەتاکە بەتانیەکەمان بپێچایەتەوە ،چاوەرِوانبین بۆرِۆژێکی نووی چێ روئەدات ئەمجارە کێ میوانی نوێ ئەبێت فلیمی تازەی ئومرِۆمان چیە ،کەی ، دەستپێئەکات ...؟ ..

**لە ژورەکەماندا پەنجەرەیەک هەبوو بە سەر حەوشەکەدا ئەیرِوانی ، هەرچێ رِوییدایە لە بەرچاومانبوو ئەماندی. هەرکەسێکیش بهاتایە ئەماندی .**

# عەبدی مەگۆل چارە...!

## حەمەڕەئوفی سیخن ...!

پرۆگرامی ڕۆژانەی ناو ئینزیباتخانە بەم شێوەیە دەستی پێئەکرد ئینزیباتەکانی ناوشاری سلێمانی لێرەوە دابەشئەکران لێرەوە دەست بەکارئەبوون ، هەندیکێان حەزیانئەکرد پێش ئەوەی بەرەو شاربینەوە بۆ ڕاوڕوت و ئازاردانی خەڵکی ناو شار ئەهاتن بۆ ئەم بەشە تاهەوەس و ئارەزویان تێر بکەن ، بەخۆخەرێک کردن بە لێدان ئازاردانی بەندکراوەکانەوە ، هەموو بەیانیەک لەپڕ خویان ئەکرد بە ژورەکاندا دەستیانئەکرد بە داپڵۆسینمان ولێدانمان بەدارەکانی دەستیان تاهیلاکئەبوون، یەکێک لەو سەبازە تاوانکارانەی ئینزیباتخانە کە هەموو ڕۆژێک ئەبووایە بهاتایە تێری لێبداینایە و دارەکەشێ لای ئێمە دائەنا ئەیوت ئەگەر دارەکە ونببێت ئەتانکوژم لەسەری.

ئەوسەربازە ناوی (عەبد ) بوو گەنجێک بوو تەمەنی هەر بە٢٠ بیست ساڵ مەزەنە ئەکرا ، سەرێکی تاشراوی خڕی پیووەبوو باڵای مام ناوەندی وپڕبوو ، دەم و چاوی خڕ وشێووەی تەتەرو مەگۆلی تیابەدی ئەکرا ، لەسەر کەتەلۆک ئەڕۆیشت جل وبەرگی سەربازی ڕێک وپێکی لەبەردابوو خۆی ڕازاندبووە وە، بەیانیەک لە پڕ دەرگاکرایەوە عەبد خۆیکرد بەژوردا دارێکی بەدەستەوەبوو یەکسەر بەرەو ڕووی (حەمەی فەرەجەفەندی )چوو دەستیکرد بەلێدانی دارەکەی ئەبرد بۆ سەر ودەم و چاو وگیانی وبەشەق بۆ لەشی و بەدەم لێدانەوە ئەیوت و دوبارەی ئەکردەوە بەڕاستی میوانی چاک وچەورمان بۆهاتوە، کەتێربوو لە لێدانی داوای لێکرد هەلسێت بە پێووە بووەستێت ، بواریشی نەئەدا بەدارەکەی ئەیماڵی بەسەریدا لەبەر ئەوەی کاکە حەمە زۆر قەڵەوبوو نەی ئەتوانی هەڵسێت بەناچاری ، هەوڵێئەدا هەڵسێتە سەرپێ وئەکەوتەوە بەزەحمت هەڵسا ئەم هەڵسان و دانیشتنەوەیەی چەندجار دوبارەپێکردەوە ، کەئەویش لەبەرلێدان ناچاربوو ، ئێمە زۆر بەزەییمان هاتەوە بەو پیاوە بەویقارەدا کەبێدەگ بوو بەناچاری بەقسەی ئەکرد .

ئەم کارەی عەبدی مەگۆل چارە بووە مایەی دڵتەنگی ودڵگرانی و ماتەمینی بۆ ئێمە کەناخوشترین ستەم وزۆر بوو لەوپیاوە ولە ئێمەکرا ، ئەوپیاوەی بەو دەردەبرد کە بەلای ئێمەوە گەورەترین سزابوو بۆی ، دوایی بەدار هاتەوێزەی هەموومان ، دوای هیلاکبوون دارەکەی دایە دەستی ( کاکە حەمە ) وتی : ئەوداره بالای تۆبێت ئەگەر فەوتا لەسەری ئەتکوژم ، هەربۆ لێدانی تۆمداناوە بۆ ئەوەی ڕۆژانە تێر لێتبدەم ، خێراچووە دەرەوە .

فلیمی دوەمی ئەو ڕۆژەمان کاکە حەمە ڕەئوفی کورد بوو ،گسکدەری (کەنناسی ) ئینزیباتخانە و بەردەستی ئەفسەرو سەربازەکان بوو ، کەسەربازبوو دانرابوو بۆپاککردنەوە وکەناسی وکسکدانی ئینزیباتخانە ، گەنجێکی سیخن ورێوەڵەو بچکۆلەبوو بەرگی شڕو پڕو ناڕێکبوو، دەم وچاوی وێنەی مرۆڤی ئاسایی تیابەدی نەئەکرا تووڕەبوو بەسەرماندا خۆی ئەنواند ، ڕقی زۆری لێمانبوو دەم پێسبوو جنێو فروشبوو ڕقی زۆری لە کوردبوو بێتەربیەتبوو ، دوایی زانیمان خەڵکی (سەید سادقە )، دوای تەواو بوونی فلیمی عەبدی ئینزیبات دەمەو نیوەڕۆ بوو حەمەڕەئوف خۆیکرد بەژورەکەماندا ئەویش چوو پەلاماری کاکە حەمەی فەرەجەفەندیدا کێبلێکی بەدەستەوە بوو ماڵی بەسەری کاکە حەمەدا وتی : بە خوا ئەمڕۆ میوانی چاکمان بۆهاتوە دستیکرد بە جنێودان بەکورد و سەرۆکەکانی و بەکێبڵەکەی کەوتە وێزەمان دوایی ئەویش کێبڵەکەی لای کاکە حەمە داناو وتی بائەم کێبڵە لای تۆبێت ، تاڕوژانە بێم لێتانبدەم پێی، خۆت ئەزانیت چیت لێئەکەم ئەگەر ونبێت . دوای جنێودانی ناشێرین و هەڕەشە چووە دەرەوە . وەک بۆمان دەرکەوت عەبدو حەمە ڕەئوف بەیەکەوە تەگبیریان کردبوو بەنۆرە بێنەگیانمان بەئارەزوی خۆیان تاهیلاک ئەبن بەداروکێبڵ لێمان بدەن .

لەدوای نیوەڕۆوە دەستیانکردەوە بەبانگکردن و لێکۆڵێنەوەو لێدان و ئەشکەنجەو ئازار ، یەکە یەکە بانگیان ئەکردین تا ئەیان گەیاندین بۆ ژوری لێپرسینەوە شڵکوتی مەرگیان ئەکردین سەربازەکانی ناو حەوشەکە تێمان ئە ئالآن ، لە تاوگیانی خۆمان ئەمانەویست هەڵسینەوە پێیان ئەدایە بەر پێمان بەدەمدا ئەکەوتین گیانمان بریندا ئەبووە پڕخوێن ئەبووین . کەمەبەستی سەرکیان هەر ئەوەبوو وکاروانەیەکی لێدان بخوین بەڵکو ناوێک بدرکێنین. ئەوڕۆژە لێدانێکی خەست و خۆڵم خوارد ،لە ژوری لێکۆڵینەوە هەردەم دوبارەیان ئەکردەوە کە ئەمڕۆ دواڕۆژی ژیانتە ئەتکوژین ڕاستیمان پێبڵێ ، لەگەڵ کێ ئیش ئەکەیت و هاوڕێکانت کێن ،؟ لەدوای بێدەنگی و وەرام نەدانەوە ،ژەمێکی کۆلای خەستوخۆڵیان دەرخوارد ئەدام .

لەوکاتانەدا لەبێ شانسی ئێمە (ئەمن و ئیستخبارات ) یەکیانگرتبوو بەیەکەوە تەحقیقیان ئەکرد کە پێکهاتبوون لە ئەفسەرێکی سوپاو ئەفسەرێکی ئەمن هەریەکەیان مفەوەزێکی لەبەردەستدابوو بۆنووسین .هێشتا لە لێدانم نەبوونەوە لەحەوشەکدا هاوارو دەنگەدەنگ ولێدان پەیدابوو هەموو هەستان بەرو دالانەکە چوون ، منێش لەژورەکەدا کەوتبووم بەتەنیامامەوە ، چەند سەربازێک هاتن منیان بەرەو ژورەکەم ڕاکێشا .

لەحەوشەکەدا بینیم پیاوێکی گەنجی شارەکەیان بە دەستەوەبوو سەربازەکان تێیئالآبوون لەسەر زەویەکە تەختیان کردبوو خەریکی لێدانی بوون ئەوێش هاواری ئەکرد بۆ لێم ئەدەن من هێچم نەکردوە ، لەژورەوە زانیم کە ئەوپیاوە ( تۆفیقی حاجی عەلی حەمامچی ) بوو کە

دوكانى پێڵاو فرۆشتنى هەبوو لە جادەی مەولەوى تەنيشت حسەڕەشى خەيات ، دواى ئەوەى بەشى خۆى لێدانى خوارد دواى ماوەيەک هێنايان بۆ ژوورەكەى ئێمە . بەخێرهاتنمان كرد . ڕۆژانە ئەماندى چوارمشقى دانيشتوە بەجلى ڕێک و پێكى كورديەوە كە پياوێكى ڕێک وپێک و شێكى شاڕەكەبوو هەردەم حازرو ئامادە دانيشتبوو وەک چاوەڕونى شتێک بكات وائەهاتە بەرچاو هەردەم لەبەرخۆيەوە بۆڵە بۆڵيبوو ، ئەيوت نازانم لە سەرچى گيراوم منيان بۆچێ گرتوە...؟ ، ئەو هەر بەشێک لێدانى خوارد وەک ئێمە نەبوو هەر ئەو جارەبوو ئەوژەمە لەحەوشەكەدا لێدانى خوارد ،كە كرابووە نەريتێكى ئينزيباتخانە هەركەسێک بهێنرايە ئەبووايە لەحەوشەكەدا ژەمێک لێدان بخوات ، كەبۆ بەخێرهاتن و پێشوازى پێشكەشيان ئەكرد .دواى چەند ڕۆژێک قادربرسى باسيئەكردو دوبارەى ئەكردەوە چى تاوانێک و غەدرێک لەم پياوەكراوە بێهيچ تاوانێک گيراوە ، هەر بۆقسەى خۆش ڕۆژێک وتى ئەم چەند ڕۆژە سەيرمئەكرد كاک تۆفيق دانيشتەوە و چاوەڕوانە ، دانيشتوە حازرو ئامادەيە ، ئەو هەموو كاتانە بێدەنگ چوارمشقى ڕێک وپێک دانيشتوە، بێئەوەى لە جێيخۆى بجوڵێت و هەردودەستى لە سەرڕانى داناوە وتى : ئەم ديمەنەى چەند دێڕێک لە سرودە نيشتمانيەكەم دێنێتەوە ياد ( ئەى ڕەقيب ) كەئەڵێت : ( لاوى كوردى حازرو ئامادەيە گيانفيدايە گيانفيدا هەرگيانفيدا ) دواى ماوەيەک بەرەڵڵە كراو هەر نەيزانى لەسەرچى گرتويانە ،،؟ يادێكى خوشێ لەدڵماندا بەجێهێشت ، هەروەها لەدواى چەند ڕۆژێكيش (عەبدولى حاجى محەمەدى سلۆ ) بەربوو ئەويش تا بەربوو نەيزانى بۆچى و لە سەرچى گرتوويانە ...؟ هەردەم دوبارەى ئەكردەوە كە پێم ئەڵێن تۆ يارمەتى پێشمەرگەتداوە ، كەسێک ناناسم كە پێشمەرگەبێت كاتێک بەربوو دواى خواحافيزى ، وتى دوعاى خێرو هيواى بەربوونتان بۆ ئەخوازم ، كاتێک ئەيوت نازانم بۆچى منيان گرتوە شيعرەكەى عومەرخيامى ئەهێنايەوە بير كەئەڵێت : (نازانم بۆچى هاتوومەتە دنياو ژيام كەڕۆيشتم نەمزانى بۆئەڕۆم ) هيچ تێنەگەيشتم .

***

# پێشمەرگەی ناوشار

لەوە پێش باسکرا لەگەڵ هەلگیرسانی مەشخەڵانی ئاگری شۆڕشی ئەیلول ، پێشمەرگەی ناو شار دروستبوو کە ڕێکخراوێکی تایبەت و زۆرنهێنی بوو، لاوی خوێنگەرم وتایبەت ئەندامیبوون کەدڵسۆزو ئازاو بەجەرگبوون .

دەمەو ئێوارەبوو لە حەوشەکەدا دەنگبەرزبووەوە بەهاوار ولێدان زریکە کاتێک لە سوچێکی پەنجەرەکەوە سەیرمانکرد لە دە سەرباز زیاتر لە گەنجێک ئاڵاون بەربوونەتە گیانی بەدەردی مەرگیان بردوە لەوباوەڕەدا نەبووین کەمابێت، بەعەرەبی هاواریان ئەکرد (بیش مورگە)مان گرتوە دوبارەیان ئەکردەوە وهاواریان ئەکرد بیش مورگەمان گرتوە عەسکەرەکان پاڵە پەستۆیان بوو بۆلێدانی، هەریەکە بەشی خۆی بەرکەوت وایان لەوگەنجەکرد نوزەی لێبڕاو بۆرابووەوە، دیمان لە حەوشەکەدا چوارپەلی شل و بڵاوبوو بێهۆش کەوتبوو، دنیاساردی کردبوو حەوشەکە قوڕاوبوو لەو سەرمایەدا لەناو ئەو قوڕاوەدا بەبووراوەیی تابەیانی هێشتیانەوە دوایی زانیمان کە: (عەبدوڵلە عەلی دەروێش ئەمین) بوو کە موچەخۆری خەستەخانەبوو پێشمەرگەی ناو شاربوو. لەدوای ماوەیەکی کەم لاوێکی کەیان بەچاوبەستراوی کردبە حەوشەکەدا تاگەیندبوویانە ئینزیباتخانە، لە ڕێگا ئەوەندەیان لێدابوو بەشی لێدانی ناو حەوشەکەی پێوەنەمابوو، نیوەمردوکرابوو جوڵەی لێبڕابوو یەک تەختە لەحەشەکدا بەبووراوەیی خستیان دوای ئەوەی لەڕێگە لێدانی چاکی خوارد بوو ئەوەندەی لێدرابوو بورابووەوە ئاگای لە لێدان نەمابوو لەدواییدا زانیمان ئەلاوە تازەیە ناوی (نامیق حسەین ئەمین ).




**(نامیق حسەین ئەمین )**

پێشمەرگەی ناوشارە ، کەفەرمانبەری پوست و بەرید و تەلەفۆنی سلێمانیە . هەر جارێک ئەگەر ڕوداوێک هەبووایە ئێمە بەدزیەوە لە سوچێکی پەنجەرەکەوە سەیرماندەکرد لە حەوشەکدا هەرچیەک بکرایە وەک لە بەرچاومان بێت وابوو . ئەوەندەی پێنەچوو لاوێکێ کەیان کرد بە ئینزیباتخانەدا هەر دو چاوی بەسترابووەوە هیشتا نەیانگەیاندبووە ناو حەوشی ئینزیباتخانە لەرێگە ئەوەندەیان لێدابوو ئەویش لەهۆشچووبوو ، لەسەرو ئەوەوە سەربازەکان وازیان لێنەهێنا تێیئالان بەدەردی مردنیان برد تێیکەوتبوون بە داروکێبڵ شەقی پۆستاڵ زیاتر لە پەڵ و پۆیانخست بەدەم لێدانەوە هاواریان بوو بێش مورگەیە و موتەمەڕدە ، لەدواییدا زانیمان ئەو گەنجە ناوی :( جەزای عەلی کاتب ) بوو کەماڵیان نزیک مزگەوتی هەمزە ئاغایە، باوکی بەرامبەر ئەسحابەسپی دوکانی عەتاری و وردەفرۆشی هەبوو .

ئێمە هیچیانمان نەئەناسی ، دوایی زانیمان کە هەموو پێشمەرگەی ناو شاربوون کە لە دوای چەند ڕۆژیش ئەو سێ لاوە نەهاتنەوە سەر خۆ ورو گێژیان کردبوون . بەنۆرەئەیان بردن بۆ ژوری لێکۆڵینەوە وئازارو ئەشکەنجە ولێدان بەمەبەستی وەرگرتنی وشەیەک و دان نان بەتاواندا. ئێمە هەرچەندە وردمان کردەوە نەمان زانی بۆچی و لەسەرچی گیراون؟ چۆن ئەم کۆمەڵە دوا بەدوای یەک گیراون تادوای ماوەیەکی زۆر هەرنەمان زانی هۆی چیبوو؟

کاک قادر برسی وتی کورێنە وابزانم ئێمە لە بیر چوینەوە کەمیوانی گرنگ و چەوریان بۆهاتوە پێوەیان خەریکن، لە ڕاستیدا وادەرچوو ئێمە پشویەکمان داو زۆر لە برینەکانی لەشمان ساڕێژ بوو .

لەم ڕۆوە ڕۆژی سەموونێکی کۆنیان بۆ فرێ ئەدایین بەوشکی بیخۆین. بواری ئەوەمان هەبوو ئەگەر لە ژوری لێکۆڵینەوە تەحقیق بکرایە گوێمان لە هەموو قسەکان ئەبوو لە بەرئەوەی لەبەینی ژورەکەمان لەگەڵ ژوری لێکۆڵینەوە دیوارێک هەبوو ( تیغەبوو ) بوو( تەنک )بوو گوێمان لەپرسیارو لێکۆڵینەوەکان قسەکان ئەبوو.

[بەڕاستی ڕۆژانێکی ترسناک و ناهەموارو کارەساتبوو، ئەم کوشتن و برین ولێدان و سزادان وئەشکەنجەدانە و بێوێنەو بێبەزەییانەی ئینزیباتخانە لە دەرەوە لە ناخەڵکیدا دەنگیدابووەوە ، ترسێکی وای دروستکردبوو لە ناو دڵ ودەرونی خەڵکیدا، کاتێک یەکێک خۆی لێرە ئەبینێتەوە کەلە ئینزیباتخانە توندکراوە و بیستویەتی خەڵکی چۆن و بەچی شێوەیەک ئازارو ئەشکەنجە ئەدرێن، وبەتایبەت دوای لێدان وتێهەڵدان کە ئەبینێت لە حەوشەی ئینزیباتخانەدا فڕێدراوە نیوە مردو کەوتوە یان بوراوەتەوە هەردەم بەدەم شەق و تێهەڵدان دارو کێبڵ نیوەمەرگ ئەکرێت، یەکسەر هەست و بیری ئەچێت بۆ ڕۆژانێکی ڕەش و ناخۆش و دژوار و نادیار کەچاوەڕوانی ئەکات قەڵەمی ئەژنۆی ئەشکێت، بیر ئەکاتەوە چیلێ ئەکەن وچی بەسەردێت؟بەوهۆیانەوە

ورەی هەندێک کەس دێتە خوارەوە و هەندێک قەڵەمی ئەژنۆی ئەشکێت شپرزە ئەبێت ئەپەشۆکێت و ئەڕوخێت، یان جاری واهەبووە بارە ترسناکەکە وایلێکردوە تێکبچێت ببزرکێنێت ، هەندێک شەوانە وڕێنەیئەکرد ، بەڕاستی ڕۆژانێکی ناسک ومەترسیدارو سەخت و کارەسات وپڕلەمەینەتی بوو]

. بەهۆی شۆڕشی ١٤ تەموزەوە ساڵی ١٩٥٨ ، ڕژێمی پاشایەتی ( تەختی پاشایەتی )لەعێراقدا ڕوخاو لەناو چوو ، هیوایەک و ئومێدی دواڕۆژێکی پڕلەخۆشی و ئازادی و دیموکراتی وبیری سەربەستی و مرۆڤایەتی ، دابەگەلانی عێراق بەتایبەت گەلی کوردستان کەروژانێکی ڕوناک لە ئاسۆدایەو بەڕێوەیە مژدەی بەیانیەکی خوشی و سەرفرازی ئەدات بە نەتەوەکەمان ، هەموو مەینەتی و کارەسات وبێبەشی لەمافی نەتەوەیی دواییدێت ، نەتەوەی کورد بەئاواتی خۆی ئەگات ، عێراق ئەبێتە مەڵبەندی ئازادی و سەربەستی ودیموکراتی وخۆشی ، کورد هەموو کارەسات و مەینەتی کوشتن و بڕین وماڵ تالآنکردن ڕەوپێکردن و تەعریبکردن و زوڵم و زۆری لەبیر ئەچێتەوە ، شۆڕشی تەمووز هی هەموو گەلانی عێراقە و بەرەو دیموکراتی و ئازدی و سەربەستی و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ ئەیانبات ، کەچی بە پێچەوانەی هەموو ئەمانە دەرچوو ، ئەمڕۆ هەموو خۆشی و ئاوات و هیوای ودواڕۆژی لەسەر دەستی کۆمەڵێک دڕندەو ڕەگەزپەرستی شوۆفێنیزمی عەرەب بێتە سەرکوشتن و بڕین ماڵ تالآنکردن و کاولکردن ڕەوپێکردن و بۆردومانکردنی کوردستان ، ڕۆڵەکانی گەلی کورد بەکۆمەڵ بکوژرێن و هەڵواسرێن و ئە شکەنجەو ئازار بدرێن ، لیبدرین بکەونە ژێر زەبری پۆستاڵ و لەقەوە ، و بەدەست چەند سەرکردەیەکی خوێنرێژ وخوانەناس و بێبەزەیی وەک زەعیم سدیقی تاوانبار ودارودەستەکەیەوە وەک گورگ بکەونەگیانی خەڵکی بەئازورو ئەشکەنجە بدرێن.

کورد لە زەمانی پاشایەتیدا ( مەلیکی ) بەوجۆرەی ئیستای لێنەکرابوو ئەوجۆرە ستەم و ئازارو ئەشکەنجەو تاوانکاریانەی نەدیبوو وابەکۆمەڵ وەک ئەوەی ئەمڕۆیان بەسەریدا نەهاتبوو و نەیان بیستبوو ، ئەمە یەکەم جارەو ئەزموونێکی نوێیە کەڕۆڵەکانی کورد لە عێڕاقدا لەسایەی شۆڕشی نوێووە توشێئەبن .

ئەم بارە نوێیەو بەسەرهاتانە ومەینەتیە ، هەڵوێستەی ئەوێت بیرکردنەوەی وردی ئەوێت ، کارێک و کارەساتێکی وائاسان نیە کە ئەمڕۆ گەلی کورد بەدەست ئەو خوا نەناسانەوە بەسەریدێت، ڕۆڵەکانی بەوشێووەیە بکەونە بەردەستی ئەودڕندانە ، بێبەزەیی و دەرلە یاسا و مافی مرۆڤایەتی و دیانەت و ویژدان .

تاوانکاران و دوژمنان بەکینەو ڕقەوە وئارەزوکاریەوە ئەمڕۆ لە ڕیی ئەوتاوانانەوە دەرونی نەخۆشی خۆیان تێر بکەن .

ئەمانە بە هەمووی بەرگەگرتنی ئەوێت و پێویستی بە خاوەنی بیرو باوەڕی پۆڵایین هەیە بەکەسێ هەیە بەرگەگربێت ،خۆڕاگربێت مێشک و دەماری بەهێزبێت . ئەو کە سانەی بەر ئەو شاڵاوە چاوەڕواننەکراو وبێبەزەییانەی هێزەکانی سەربازی و ئەمنەکانی ڕژێم کەوتن بەڕاستی پاڵەوان و نمونەی بەرگەگرتن و خاوەن بڕوای بەهێزبوون ، کورد پەروەرو بەوەفاو گیان لەسەردەستبوون هەرچی لە توانایاندا هەبووکردیان ، خۆیانپاراست ، بۆ ئەوەی پارێزگاری لەکەسانی تربکەن نەیەڵن وەک ئەوان کەسانی کە ڕاکێش بکرێن ، بکەونە بەردەستی ئەو زاڵمانە ئەوانیش بەوهۆیانەوە توشێ سزاو تاڵاوببن ، یان یەک وشە بدرکێنن وبیدەنە دەستی دوژمن .

ئەم سێ لاوە پێشمەرگەیان ئەهێناو ئەبرد بواریان نەئەدان بەلێدان و کاروانە یەک لە دوای یەک لە ناوحەوشەکداو لە ژوری لێکۆڵێنەوە ئەشکەنجەدران بەم شێوەیە ئەوڕۆژەیان بردەسەر هەرکەتاریک بوو بردیانن بۆ دەروەی ئینزیباتخانە ، نەمانزانی بۆ کوێبران ، لە نیوەشیودا هێنایاننەوە ، هەر یەکەیان بە چواردەستە هەڵگرتبوو وەک مردو لە حەوشەکەدا بێپەڵ وپۆ و بوراوە فڕێدران .

وەک لە دواییدا بۆماندەرکەوت بۆ کارێزەوشک برابوون لای حامیە ( کە ئەمڕۆ پارکی ئازادیە ) بۆلێدان و بەدوای دەبابەدا ڕاکێشران ، کە سەیرمانکرد بەهۆی ڕاکێشانەوە گیانیان هەموو خوێناویە بەتایبەت پشتیان ، هەتا بەیانی جوڵەیان لێبڕابوو لە نێوان فەردە ئاردو گەنم و گوڵە بەڕۆژەکاندا بەوسەرمایە لەحەوشەکەدا کەوتبوون ئاگایان لە خۆیان نەبوو ، سەرلەبەیانی هەمیسان لە ژوری ئەشکەنجەدان دەستیانکردەوە بە لێدان و کاروانەو لێکۆڵێنەوە و ئازاردانیان ، داوای ئەوەیان لێئەکردن کە ناو بڵێن .

هەر کە شەوداهات ( زەعیم سدیق ) لەپڕ خۆیکرد بە حەوشەکدا و خێرا بەرەو ژوری لێکۆڵێنەوەچوو (حێمایە)کانی بەهەموولایەکی حەوشەکەدا بڵاوبوونەوە ، سەربازەکان بەرەو لاوەکان چوون دەستیان کرد بە شەق تێهەڵدان و لێدانیان دوایی (جەزای عەلی کاتب )یان بەڕاکێشان و لیدان بەرەو ژوری لێکۆڵێنەوە برد ، حیمایەکان ڕاهاتبوون ئەگەر یەکێک بانگبکرایە ، بەڕاکێشان یان بەپێی خۆی بڕۆشتایە لە هەردولاوە ڕێزئەبوون بەلێدان و شەق بۆ یەکتر ئەیان ئەسەندەوە بەڕێیانئەکرد تا ئەگەیشتە شووێنی مەبەست ،

یان بۆ بەرپێی زەعیم سدیق ، ئەمجارە جەزا لە بەردەم زەعیم سەدیق دا لە ژوری لێکۆڵێنەوە فڕێدرا ، ئێمە کە گوێمان بەتیغەکەوە نووسان گوێمان لە قسەکانی زەعیم سدیق بوو هەڕەشەی ئەکرد جنێووی ناشێرینی ئەداو بەزللەو شەق لەجەزای عەلی کاتبی ئەدا و پێی ئەوت : تۆ پێشمەرگەیت وازت لێ ناهێنین تاناوی برادەرەکانت نەلێیت بەپێچەوانەوە ئەت

کوژم ، لەدوای ماوەیەک گوێمان لە تەقەی دەمانچەبوو ئێمە وامانزانی کوشتویەتی ، تومەز زەعیم سدیق ڕوی دەمانچەکەی کردبووە نزیک سەری جەزاو ترساندبووی و تەقەی بەسەریدا کردبوو ، دوایی زانیمان بەلای سەریدا تەقاندبووی بۆ ترساندنی کەپێشمەرگەی ناوشارە ئەبێت ناوبڵێت .

وەک کاک قادربرسی وتی ئێمە بەهۆی ئەو سێ لاوە ، کەبەناوی پێشمەرگەوە گیراون بۆماوەیەک لەبیر چووینەوە . بەڵام بەیانیان بێبەش نەبووین لە کەرەمی کاکە حەمە ڕەئوفی سیخن و عەبدی مەگۆلی هەتاهیلاک ئەبوون داریان ئەدابەسەر و گوێلاکماندا و ئەوسا ئەهاتنە وێزەی کاکە حەمەی فەرەجە فەندی هەڵیان ئەساندو دانیشتنەوەیان پێئەکرد ئەگەر زوو هەڵنەسایە دار ئامادەبوو بۆسەری.

***



عوسمانی حاجی کەریم

(پەرستیار)

## عوسمان حاجی کەریم

**پێشمەرگەی ناو شار:** بۆڕۆژی دوایی لای نیوەڕۆبوو گەنجێکی کەڵەگەتی پان و پۆڕیان کرد بەحەوشەکدا وەک دەرئەکەوت ، پەرێشانبوو بەدەست سەربازەکانەوە زۆریان لێدابوو لە حەوشەکدا بەرەڵایانکرد لەبن دیوارێکدا وەستاو بەسەرسامیەوە سەیری ئەم لاو ئەولای خۆی ئەکرد هەر ئەوەندەی لاخۆشبوو سەربازەکان بەڕاکردن تێێئاڵان هاواریان ئەکرد بیش مورگەیەکی خەتەریان هێناوە میوانە.

لە دەسەرباز زیاتر بە لێدانیەوە خەریکبوون ، یەکێ بەدار یەکێک بەکێبڵ ئەوی کە بەشەقی پوستاڵ بەشێکیان بە بۆکز کاک عوسمان لە بەردمیاندا ڕایئەکرد ئەکەوت و هەڵئەسایەوە

بەهەردو دەستی دەم و چاوی خۆی گرتبوو دوایی ، کفت بوو توانای هەڵسانەوەی نەما سەری پڕلەخوێنبوو خوێن بەدەم وچاوێدا ئەهاتەخوار بێهێزبوو جوڵەی لێبڕا، زوزو سەربازەکانیش ئەیان وت (بیش مورگە )مان گرتوە ، بەمەزەنەی ئێمە بورایەوە ، لێدانەکەی ئەو بەشێوویەکبوو ، یەکێک لە ژێرپیدا دەرنەچێت گیان لەدەستبدات ، ماوەی دوڕۆژ بەلێدانیەوە خەرێک بوون شەوانە ئەیانبرد بۆ دەرەوە بۆ کارێزەوشک ، دوایی وادەر ئەکەوت وایلێهاتبوو وەک سەقەت و شەل بووبێت وابوو توانای ڕۆشتنی نەبوو چەند شەوێک لە حەوشەکەدا لەبەرسەرماو ناو قوڕاو و باران هێشتیانەوە ، دوایی بردیانە ژورەکەی حەمە پیشید ئەحە شآنە کە بەرامبەر ژورەکەی ئێمەبوو کە هەردو ژورەکە لە سەر داڵانێک بوون ، ئەگەر دەرگاکە کراوەبووایە یەکترمان ئەدی و قسەمان لەگەڵ یەکتر ئەکرد ، دوایی کە ناسیمان وتیانماڵی لە گەڕەکی قەسابەکانە و نزیک ماڵی عەواشی سەروپێ فرۆشە برایەکی هەیە ناوی عوسمانە بەرگ دروە لەناو بازاڕ ، دەرکەوت کە لە خەستەخانە پەرستیاربووە وەک خۆی لەدواییدا باسیکرد بەنهێنی پێشمەرگەی ناو شاربووە ، کاتێک سەرۆک جاشێک بریندار ئەکرێت هێنرابوو بۆ خەستە خانە وتی : من ڕاسپێررام کەدەرمانی بکەم ودەرزی لێبدەم ، من وەک هەموو بریندارێک نەخۆشێکی ئاسایی بێجیاوازی تیمارمکرد ، لەپڕ منیانگرت گوایە من هەوڵمداوە دەرزی لێبدەم کە جارێکی تر ( هەڵنەسێتەوە ، ڕاستنەبێتەوە ) من بەبێتاون گیراوم و ئەڵێن تۆ پێشمەرگەیت بەخۆڕایی ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازارەم دراوە. هەر ئەو دوانیوەڕۆیە یەک لە دوای یەک دوگەنجی تریان کرد بە حەوشەکەدا .

**یەکەم/ ناوی عومەر محەمەد سەعید بوو.**

**دوەم / ناوی عومەر عەبدوڵڵە بوو.**

لەدوای نیوەڕۆوە سەبازەکان بەلێدانی ئەمانەوە خەرێکبوون ، ئەیانوت پێشمەرگەمان گرتوە ،، ئەم لاوانەیان ئەبرد بۆ ژوری لێکۆڵێنەوەو ئەشکەنجەو ئازاردان ئەوەی لەحەوشەکدابمایە بەلێدانیەوە خەریکبوون ، شەو ئەیانبردنە دەرەوە بەڕۆژیش لە حەوشەکەدانیوە مردو کەوتبوون ساتە نەساتێک لێدانیان ئەخوارد گوێیان لەوەنەبوو بەئاگان بوراوەن مردون یان نا .

عوسمانی حاجی کەریم یەکێکبوو لەو گیراوانە کە لەهەموو زیاتر لێدانی خوارد ، وای لێکرابوو لەدوای ماوەیەکیش نەی ئەتوانی هەڵسێت ، بەدارە دارە ئەچوو بۆ دەست شتن وەک سەقەت بووبێت وابوو .

***

## ژورەکەی ئێمە دوژمنایەتی زەعیم سدیق

گیراوەکانی ژوری ئێـمە پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە: قادر برسی، ئەنوەر دارتاش، (بەندە) محەمەد باقی سەعید، عەبدول حاجی محەمەد سلۆ، محەمەد حـاجی فەرەج ئەفەنـدی، تۆفیـق عەلـی دەروێش ئەمین ، کەهەموو سوێندمان خواردبوو نهێنی ئەم ژورە بپارێزین وشەیەک نەدرکێنێن ، ڕۆژانە من و ئەنوەر دارتاش گوێـمان ئەنابە دیوارەکەوە ( تیغەکەوە)،بزانین لەژوری لێکۆڵێنەوە چێ باسەو چی ڕوودەدات ئەوانەی کە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا ئەکرێت هەڵوێست و وەرامیان چیە ؟ گوێـمان لە هەموو قسەکان بوو بەڕونی .

جار جارەش کە ئێمەیان بیرئەکەوتەوە یەکەیەکە ئەبـراین بـۆ لێکـۆڵێنەوە و کـاروانەو لێـدان کەلایان بووە کارێکی ڕۆتینی ڕۆژانەیان .زەعیم سدیق کەئەهات بۆ ئینزیباتخانە ، ئەمانزانی هاتوە دوای ئەوەی سەبازێکی زۆر بە حەوشەکەدا بڵاو ئەبوونەوە .

ئەوشەوە دەوری سەعات دەبوو ١٠ حەوشەکە پڕبوو لە سەرباز هەریەکە بەلایەکدا بڵاوبوونەوە بەوەدا زانیمان زەعیم سدیق بۆ سەردانی ئینزتباتخـانە هـاتووە ،دەنگـی پۆسـتاڵ وسـەربازو ئامادەکاری بۆ پێشوازی بەرز بووەوە ، خێڕاهەموومان ڕاکشاین و خۆمـانکرد بەنووسـتوو ، نەوەک زەعیم سدیق بۆ ژورەکەمان بێت.

لەپڕ زەعیم سدیق خویکرد بەژورداو کۆمەڵێک سەباز بەدوایەوە ، دو سەرباز ئەملاو ئەولایان گرتبوو ، دەستیکرد بە شـەق تێهەڵـدانی ئەوەی لە ڕێـزەکەدا نووسـتبوو لەبەردەمیـدابوو ، هاواریکرد هەڵسن سەبازەکان پەلاماریان داین و ڕێزیـانکردین یەکەیەکـە دەسـتیکرد بە زڵـلە لێدانمان کەسی نەپەڕاند، دوایی ئامر ئینزیبات هات لەبەینی سەربازەکاندا وەستا.

زەعیم سدیق دوایی بەچاوێکی تورەیی و پڕ لەکینەوە وتی: کۆا مامۆستاکان ، من و ئەنوەر دارتاشیان جیاکردەوە دەستیکرد بە لێدان وجنێودان پێمان ، تاتوانی بەپۆستاڵەکانیِ شەقی هەڵئەدا لەبەر ئەژنۆمان، جنێوی ناشێرینی بەکوردو سەرۆکەکانی و پیرۆزیەکانی کورد ئەداو و دوبارەی ئەکردەوە ، کەحەقە هەمووتان بکوژین ، ئێوە حەقی ژیانتان نیە لەم جەمهوریەت و شۆڕشەدا، ئێوە نانی جەمهوریەت ئەخۆن (ناکر الجمیلن)، چاکەی شۆڕشی ١٤ تەموزتـان لە بەرچاو نیە ناوی هەریەکێکمانی پرسی ،دوای پرسین لەناوەکانمان ، تۆزیک وەستاو ، هاتە وێزەی قادربرسی کە لێی نزیکبوو، دەستیکرد بەلێدانی و ڕاکێشایە بەردەمی وپرسی: ( انـت شێسمەک) یانی ناوت چـێە، کـاک قـادر وەرامیـدایەوە وتـی: (قـادر برسـی ) زەعـیم سـدیق لێیپرسی (شنو مەعنا برسی ،،،؟، ) وتی : وشەی برسی مانای چیە ، کاک قادر وەرامیدایەوە

(یەعنی جوعان)، زەعیم سدیق شێتگیربوو لێی تورەبوو ڕاستبووەوە شەپازللەیەکی لێداو چاویلکەی لە چاو خستە خوارێ بەسەریدا نەڕاندی وبەدەم جنێوی ناشیرێنەوە و تی: ("یعنی انت جوعان" لێش؟ ) (لێش انت جوعان ،،،) لەگەڵ جنێوداندا وتی ئەتۆ برسیت ،،،؟، کاک قادر هەر بەچاوێلکەکەیەوە خەریک بوو بەعەرەبی وەرامی دایەوە و وتی : ( لابێگ بسایەت الجمهوریە ئانی کولش شبعان) یانی لە سایەی جەمهوریەتدا من زۆر تێرم.

زەعیم سدیق وازی لەو هێنا ، هەر بەچاوی ڕک و کینەوە سەیری ئەکردین و لەوەئەچوو زۆرنیازی خراپبێت، هەڕەشەی کوشتنی لێمان کرد ،دوای تۆزێک بەبێدەنگی و وەستان چووە وێزەی ئەوانی کە دەستیکردەوە بەلێدانمان کەتێربوو هیلاکبوو ، لەپڕ ژورەکەی بەجێهێشت و چووە دەرەوە .

کردبووی بەعادەت ، هەرکاتێک بە شەو بهاتایە ، سەردانی ئەکردین بەشەق و زللە تێمان ئەکەوت ، هەرکەس بەشی خۆی لیدان جنێوی ئەخوارد هەرجارە بەمەجازێک بوو بە جۆرێکبوو بەتایبەت ئەگەر پێشمەرگە زەبرێکی گورچک بڕیان بگەیاندایە بەهێزەکانی سەربازی ،ئەو شەوە ئەهات داخی دڵی ڕقی وکینەی بە ئێمە ئەڕشت .

هەموو بەیانیەک بەتاریکی هەرلە مەلابانگدانەوە سەربازەکەی بەردەرگا هاواریئەکرد ( یاالله خێر گوموو ) خەبەری ئەکردینەوە ئەبووایە ئێمە خێرا هەڵساینایە ڕاستبووینایەوە و تاکە بەتانیەکەمان بپێچایەتەوە چوار مشقی دابنیشتینایە چاوەڕووانی ڕەحمەتی ئەو سەربازەبین کەی ئیزنمانبدا هەریەکە بۆ دەقیقەیەک یان زیاتر ڕێگەمان بدات دەم و چاو بشۆین و دەستبەئاو بگەیەنین ، شانسدار ئەوەبوو تائەڕوات و دێتەوە سەرباز لەوناوەدا نەبن لێدان و شەقی زۆر نەخوات ، ئەوبەیانیە ئەو سێکەسەکەمان دی کەدوێنی گیرابوون هەریەکە یەک تەختە لەحەوشەکەدا لەبەینی فەردەگیراوەکاندا کەوتبوون ، دیمان حەوشەکە پڕە لە خەڵکی لادێ ، شەو هێناویانن زۆریان کەواو سەڵتەیان لەبەردابوو هەندێکیان لە سەر فەردەکان هەڵتروشکابوون لە خەڵکی ناوچەی گەرمیان یان شارەزور ئەچوون ، کە زۆربوون وادیاربوو زۆریان لێ نەدرابوو ، پیاوێکێ گردیلەی بەتەمەن سەڵتەو کەوا لەبەر لە نزیک پەنجەرەکەی ئێمە وە لە سەر فەردەیەک دانیشتبوو ، لەناو پەنجەرەکەدا ئێمەی ئەدی کەلەناو ژورەکەدا هات وچۆمان بوو ئەجولاین ، زیاتر لە پەنجەرەکە نزیکبووەوە زانی ئێمە لەگیراوە ئازار دراوەکانین بەفرسەتی زانی وتی :{وەقوروانتان بم، کوڕە شیرینەکانم خوادەست وە باڵتانەوەگرێت، پیاو ،، توشی ئەم بەڵایە ئەبێت ،،،یاخوا کەس پێی لە (،،،، ) ئەم زاڵمانەوەنەچێت ،،، هەر پیاوبن بەرگەی ئەم زاڵمانەگرن ،،،سەرمان بەرز کەنەوە ،،، ناوتان بەئازایەتی بۆ هەر حەوت دەوڵەتەکە ئەڕوات ،،، ئەزانین ئێوە دەمێکە گیراون}. کاک قادر

برسی به پێوەبوو وەرامیدایەوە وتی:{مامەگیان بەو ڕێشە سپیەت قەسەم ،سوێند ئەخۆین کە بەرگەبگرین و بەرگەمانگرتوە پشت بەخواو گەڵ وئێووە سەربەرزتان ئەکەین ،،، نایەڵین دوژمن زەفەرمان پێببات ، خەمتان نەبێت ،،، هەرسەرئەکەوین ،،، هەوڵ و ڕێزمان بگەیەنە بەکەسان و ناچەو هۆزەکەت } .

دوای ماوەیەک ئەو هەموو کەسە کەگیرابوون یەکی ژەمێک لێدانیان خواردو کرانەدەرەوە .

هەرئەم بەیانیە ( دیم عەبدوڵڵەی حەمە بانەیی ) کەیەکێک بوو لەبەناو بەڵێندەرەکانی شارەکە لەگەڵ (نائیب زابتێک) بەحەوشەکەدا ئەسوڕێنەوە ، وادەرکەوت هاتبوو بۆ گرتنی ئیش و چاککردنی هەندێک شووێنی ئینزیباتخانە ، بەڵام شآنسی هەبوو کە نائیب زابتەکەی لە گەڵدابوو ، کەسەبازەکان بەرەو ڕوی هاتن بۆلێدانی وریایکردنەوە، کە بەنایە بۆ ئیش هاتوە نەی هێشت پەلاماریبدەن، کاک عەبدوڵڵە کە بەناو حەوشەکەدا گەڕا وردە وردە لەپەنجەرەکەمان نزیک بووەوە، (عەبدوڵلە دراوسێی چەندەها ساڵەمانبوو هاوڕێمبوو هاوڕێی منداڵێم بوو لە برا چەپرەوەکان بوو کەنائیب زابتەکە لێی دورکەوتەوە ، لەپەنجەرەکەوە پێموت بوەستەو گوێبگرە، چێ ڕاسپاردەیەکمان هەیە تکایە بۆمان بگەیەنە ، سەیری هەموومانی کردو، ئەویش لای تێکردین وەستا گوێێگرت، وتم بچورە ماڵەو ئاگاداریان بکە کە تەندروستی هەموومان باشەو خەمتان نەبێت، لەڕیی خۆتانەوە ئەم ڕاسپاردانەش بەبرادەران بگەێەنە، وتی بەسەرچاو خەمتان نەبێت، هەمووی وەک خۆی ئەگەیەنم .

هەرکەسێکم دیوە هەواڵی ئەگەیەنم ، بۆ هەموو ئەڵێم هەموو سەلامەتن و قسەم لەگەڵ هەموویان کردوە ، ڕاسپاردەکانیشتان ئەگەیەنم ، دوای ئەوە لەپەنجەرەکە دورکەوتەوە و ئەو ناوەی بەجێ هێشت ).

***

# حەمید القازی مدیری ئەمنی سلێمانی

رۆژی دوایی لای نیوەڕۆبوو بۆ یەکەم جار  پیاوێکی کەڵەگەتی چاکەت وپانتۆڵ لەبەری ڕێک وپێک و نوێ ،بەهەیبەت خۆیکرد بە ژورەکەماندا دوپیاوی چاکەت وپانتۆڵ لەبەری بەدواوە بوو له دواییدا زانیمان ئەو پیاوە (حـمید القازی بوو  مودیری ئەمن) ی سلێمانیه ،  پێش ئەوەی ئەوپیاوە بێتەژورەوە پیاوەکانی  لەگەڵ دوسەربازدا هاتن بەدەم هەڕەشە و لێدانەوە ئێمەیان بەپێوەڕاگرت ڕێزیان کردین .

کەهاتە ژورەوە دەستیکرد بەپرسیار لێمان  لەپێشدا ئەویش داوای  ناوی مامۆستایانی کرد هەریەکەمان ناوی خۆی وت ، دوایی  یەکەیەک لە هەمووی پرسی و لەگەڵ ئەوەشـدا لەهـۆی گرتنی  هەریەکێکی ئەپرسی ، کە هۆی گرتنمان چیە،،،؟.

هەمـوو وەرامەکانمـان ئەوەبـوو کە بەخـۆڕایی گیـراوین هـیچ گونـاه وتاوانمـان نەکـردوە ، سەیرمانکرد ئەم ئەهۆەنترە لە ئەفسەرە سەربازی وعەسکەرەیەکان،  خۆی لێینەدابن جنێوی ناشیرینی نەدا، بەدەستی پیاوەکانی لێدانێکێ ئەوتۆمان نەخوارد ، تۆزیک بێدەنگبوو  ڕاوەستاو سەیری فەردە نوقوڵ وکارتۆنە جگەرەکانی کردو ژورەکەی بەجێهێشت .

**بەنایەکی مەڵکەنـدی :**    هەر ئەوڕۆژە پیاوێـک هـاتە نـاو حەوشـەکەوە ویـستی بـەنـاو حەوشەکەدا  بگەڕیت کەسەیرمکرد ناسیم کە بەنایە وابزانم خەڵکی گەڕەکی مەڵکەندیبوو ، کە خۆیان بانگیانکردبوو لەسەربان قەلەی سەربازی دروست بکات بۆپاڕاستن ، نەی زانیبوو کەخە تەرناکە بۆ یەکێک بێتە ژورەوە  ئەگەر کەسێکی ئەوانی لەگەڵ نەبێت  بێتە ناو حەوشەکە  ، ، هەتابیپارێزێت لە گورگەکانی ئینزیباتخانەو و ئاگاداریان بکات ، کەبۆکارێـک هـاتوە تـالێی نەئاڵێن و دەستنەکەن بەلێدانی، لەبەر ئەوەی هەر کەسێک لە حەوشەکەدا ببینرێت پەلاماری ئەدەن ، ئەوەندەی پێنەچوو کاکەی  بەنا  هاتە ناوەڕاستی حەوشەکەوە ، تاسەیری سەربان بکات بزانێت ئیشەکە لەکوێیە، هەر کە سەربازەکان دیان بەحەوشەکدا ئەسورێتەوە هێرشیان بۆهێناوپەلاماریاندا، بەلێدان کەوتنە سەرو گوێلاکی  لەسەر زەوی تەختیـانکرد وبەلەقە تێـی بەربوون لە سەرسنگ و ورگی، هەتا فریای کەوتن، لە ژێر چنگی سەربازەکانیان دەرهێنا کفتیان کردبوو پەکیان خستبوو، هاواریبوو بۆئیش هاتوم من بەنام  ئێووە ناردوتانە بەشوێنمـدا، وەک پەندە کوردیەکە ئەڵێت (تارێوی قەواڵەی خۆی خوێندەوە پێستیان کـەنـد )  وەک لەدواییـدا فریای کەوتن  هەڵیانساندەوە پەلێکی لەدەستدابوو بۆی ڕاستنەئەکرایەوە  بەمەزەنەی ئێمە یان شکابوو یان لە جێچووبوو ،ئیتر کابرای بەنا بەدەستێکی سەقەت و شکاوەوە و بەگیـانی پـڕ لەئازارەوە خێراچووە دەروە بۆ ئێش نەوەستا.

هەر ئەوڕۆژە حـەمید القازی بۆچاری دوەم هاتەوە بۆناو ژورەکەمان  پیاوێکی لەگەڵ بـوو کۆمەڵێک  گڵۆسەجگەرەی لەکارتۆنەکان دەرهێنا  خستیە ناو کیسەیەکەوە، هەردوکیـان بـێ ئەوەی قسەبکەن لەگەڵمان . چوونەدەرەوە، دوای ئەوە ئەوڕۆژە دەستیانکرد بە کێـشکردنی گڵۆسە جگەرە. هەرجارە قسەیەکیان ئەکـردو بیانوویەکیـان ئەهێنـایەوە بـۆچی ئەوگڵۆسـانە ئەبەنەدەرەوە، لەگەڵ جگەرەکاندا کیسەیەکیان پڕئەکرد لە نوقڵی تـرش و شـیرین،  هیـرش کردنە سەر جگەرەو نوقوڵی ترش و شیرین  بووە خێرپۆمان  هەریەکەیان بەدزی ئەوانی ترەوە بەشی خۆیان دەرئەهێناو ئەیانبرد بەوهۆیەوە لەژورەکەماندا لێدان کەمبووەوە .
ئەوڕۆژە پێیان ڕاگەیاندین کە ئەوان خواردنیان نیە  هەریەکە بۆخۆتان  خواردن بهێنن ، کێشە ئەوەبوو چۆن هەواڵ بنێرین بۆ خێزانەکانمان ، سەربازێک وتی ڕۆژانە کەسوکارتان لەبەردەرگاو کۆلانەکەدا کۆئەبنەوە هەرچاوەڕوانن خەبەری ئێوەبزانن، ئاگاداریان ئەکەین. لێرەدامـن بیـری ئەوەم ئەکەوێتەوە ئەوچەند ڕۆژە چۆن ژیاوین خواردنی ڕۆژانەمان  تەنها سەموونە ڕەقێک بوو، بەهیچ شیوەیەک خواردنی کەمان نەدیوە ، وەک قادر برسی بە زەعیم سدیقی وت :ئێمـە لـە سایەی جەمهوریەتەوە زۆرتێربووین ، بەکەماڵی ئیستراحەت لەژێر سایەیدا ئـەژیـن ، کـەچـی سەموونە ڕەقەکەیشیان  پێمان ڕەوانەبینی.

** *

# حاجی فەرەجی سوسێ

دوانیوەر بوو بەرەو ئێوارە ئەچوو دەرگای ژورەکەیان کردەوە پیاوێکیان کرد بەژوردا، بینیمان پیاوێکی گردەڵەی بچکۆلەی لاوازی سورو سپێبوو سمێڵ زل وچاوشینبوو ،دەستێک کەواو سەڵتەی لە بەردایە لەگەڵ جامانەیەک لەسەریدا، وتیان ئەوە (حاجی فەرەجی سوسێ )یە لەخێزانە دەوڵەمەندەکانی سلێمانیە کوڕو کوڕەزای زۆری هەیە ، ناسراوی شارەکەیە ، کە هێنایانە ژورەکەوە سەلامیکرد ، دوای بەخێر هاتنی ، هەربەپێوە بوو جێگەی بەخۆی نەئەگرت ئەجولا هاتوچوی بوو جێگەگۆڕکێی بوو جارجارە لەپەنجەرەکەوە سەیری دەروەی ئەکرد .
وتمان : حاجی ئەوە چاوەڕووانی چیت ،،،؟، لەسەرچێ گیراوێت ،،،؟، وتی:( چاوەڕوانی چێم ، لەسەرچی گیراوم، نازانم ، بۆچی ، بۆپیاوی زاڵم پێویستی بە بەڵگە هەیە بۆ ئەنجامدانی جەور و ستەم و خراپەکاری ، زاڵم پێویستی بە بەڵگە نیە ،،، ؟ ، کێی ئارەزوبێت ئەیگرێت و ئەیکوژێت ،،،! بۆکەس هەیە لێی بپرسێتەوە) دەرکەوت کە پیاوێکی قسەخۆش وڕێک وپێک بوو، وادەرئەکەوت ئازار نەدرابوو هەندێک ئامۆژگاری کردین و ( ئەخباری ) ناوشاری بۆباسکردین کەچۆن خەڵکی بیزارن ودڵیان لەلامانە، دەنگ و باسی ئەم قەسابخانەیە ئەزانن ئەم گرتن و ئازارو ئەشکەنجەیەی ئینزیباتخانە لەناو خەڵکیدا ولەدەرەوە دەنگی داوەتەوە ، بەتایبەت کەس وکاری گیراوەکان خۆپیشاندانیان ئەنجامداوە دژیان بەتایبەت لەبەردەم ئینزیباتخانەدا ڕۆژانە کۆئەبنەوە و ناڕەزایی بەرامبەر ئەم زاڵمانە دەرئەبڕن ، ڕۆژانە بەردەوامن بەتایبەت ژنان کۆلانی ئینزیباتخانە چۆڵ ناکەن هەردەم لەوێن ، لەوانەیە ئێوە نەتان بیستبێت هەرنەمانزانی حاجی فەرەج لەسەرچی گیراوە، بەلام ئەوکەسانەی کە بەتەمەن بوون زۆرجار گومان و تۆمەتی ئەوەیان دراوەتەپاڵ کە یارمەتی شۆڕش و پێشمەرگەیان داوە .
لای ئێوارەبوو هەموو بێتاقەت و بێزاربووین هەر یەکە بە ئازار زامێکەوە ئەینالاند یەکێک لاقی زامداربوو ئەوی کە هاواری دەست و پەنجەی بوو یەکێک پشتی زامداربوو جێگەی ڕاکشانی تەواومان نەبوو ، دنیا ساردبوو لەسەرماو لەسەر ئەوخۆڵە هەڵ ئەلەرزین و لە برسی و تینوودا سکمان قۆڕەی ئەهات، حاجی فەرەجیش پاڵێ دابووەوە، چاوەشینەکانی ئەهێناو ئەیگێرا بێزاری زۆری تیابەدی ئەکراو لەوەئەچوو زۆری پێبێت بیڵێت ، وناچارە ، منیش وەک وڕێنەبکەم وابوو هەردەم شێعرەکەی مەلا ( حەمدون)ی هەڵەبجەییم ئەهاتەوە بیر کە لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا وتبووی کە پێیان ئەوت سەفەر بەر( سەفەربەگلک )، زۆرجاریش تاوتوێم ئەکرد هەرچەندە بە هەمووی هەموو ماناو ڕوداوەکەی ئەمڕۆی نەئەگرتەوە بەهەرحاڵ هەر بێئیرادە ئەم وتەوە .

ئەمڕۆ چی ڕۆژێکە کەعالەم شڵەژاوە

هەرکەس بە جەخارێک دڵی پارەکراوە

کەر زەوقی زەوقی زەڕینی نیە هەتا لەبەهارا

ترسی هەیە نەک بیخەنەژێر باری غەزاوە

لەو ڕۆژانەداو لە وبارە ترسناک و خراپەکاریاندا هەرکەسێک لە ئێمە یادەوریەکانی خۆی ئەگێڕایەوە لەگەڵ گیروگرفتی خێزانی و ژیانی ڕابووردوی لەگەڵ باسی ژیانی وگیروگرفتی ئەمڕۆی بەراوردی ئەکرد قادر برسی و خاڵەحاجی هەرەدم سەرگوزەشتەی خۆش و پێکەنینیان بۆ ئەگێراینەوە یەک بۆ یەکیان ئەسەندەوە.

***

# كاكە حەمەی لالەئەمین

قادر برسی بەپێوە ڕاوەستابوو لەپڕ هاواری کرد: (ئەرێ وەڵڵە حەمەی لالە ئەمینیان هێنا) منیش وتم کاکەقادر تۆ ئەڵێی موختاری هەموو سلێمانیت، هەرکەسێک هات تۆناسیت کێیە ،کەهەڵساین وتیان ڕاستە ئەوە حەمەی لالەمینە ،لەلایەکەوە ڕاوەستابوو پشتی بەدیوارەکەوە کردبوو، سەبازەکان ڕایانگرتبوو چەند سەربازێک بەدیاریەوە ڕاوەستابوون، لەپڕ پەلامارایاندا هەر بەپێووە دەستیانکرد بەلێدان و تێهەڵدانی، لەسەرخۆڵەکە خستیان تلانیانەوە.
کاکە حەمەی لالە ئەمین لە لاوە ناسراوەکانی شاری سلێمانی بوو ژنی نەهێنابوو هەردەم جل وبەرگی چاک وپاک وتەمیزی لەبەردابوو بەکوردی (بە پەلەپیتکە خۆی ئەتەکاند)، کە سەربازەکان وەک چاوەڕاونی ئەمرێکبن وابوو لێی دورکەوتنەوە کاکە حەمە هەڵسایەوە و دستیکرد بەتەکاندن و پاککردنەوەی جلەکانی گوایە پێس وخۆڵاوییبوون .
. کاتێک سەربازەکان ئەمەیان دی ، پەلاماریان دایەوە بەشەق ولەقەو دارو کێبڵ بگرەو بەردەیان بوو، بەربوونە هەموو گیانی تا شلکوتی عەمریان نەکردو گێژو نیوە بوراوەیان نەکرد وازیان لێ نەهێنا ، خستیان ، بەمە بەست لە ناوخۆڵەکدا تلانیانەوە جلەکانی قوڕاوییبوو ، بەدەم لێدان و ڕاکردنەوە ئەکەوت و هەڵ ئەسایەوە تاگەیشتە ئاستی پەنجەرەکەی ژورەی ئێمە کەوت وبێهێز بوو لێی دورکەوتنەوە تۆزێک پشویدا هەڵسایەوە بەپێووەڕاوەستا زۆر شڵەژابوو دەرکەوت کە قاچێکی و دەستی ئازاریان پێگەیبوو ئەشەلی سەیری ئەم لاو ئەولای خۆیئەکرد وەک تێکچوویێت وسام گرتبێتی وائەهاتە بەرچاو ، دوایی کەسەیری ناو پەنجەرەکەیکرد ، ئێەیش خۆمان پێشاندا ، دڵێ تۆزێککرایەوە هاتە قسە وتی: ( کوڕینە برایینە دیتان بێبەزەییانە چەندیان لێدام خۆمنیان کوشت ،،، پێم ناڵێن وەزع چۆنە ،،،؟، بەزاتی خوا نازانم منیان بۆچێ گرتوە و لەسەرچی ،،، ؟، بەحەیاتم داخڵ بە سیاسەت نەبووم ).
وەرامەان دایەوە، ئەوەهیچ نەبوو باشەوبێت ئەوسا تێهەڵدان و ئازاردان و ئەشکەنجەو لێکۆڵێنەوە دەستپێئەکات ، پیاو ئەو پیاوەیە بەرگە بگرێت کە خۆی ڕابگرێت ، یەک وشە نەدرکێنی ولەدەمی دەر نەچێت ، کاکە حەمە بەم وشانە شڵەژاو ، وتی : ئەی چی بکەم باشە ،،، ئەی نابێت هیچ بڵێم ،،، ؟، قادربرسی وەڵامی دایەوە وتی : کەداوای ناویان لێکردیت (یەک کەلیمەت وت دوای ئەوە داوای سەدی ترت لێئەکەن . کاکە حەمەی لالە ئەمین وتی: ئەی چارە ،،،؟
قادر برسی وتی : ( ئەگەرهاتن بۆ لێدانت هەتا ئەتوانیت هاواربکە ) ئەم قسەیەی قادربرسی لە دوایدا بووە نوکتەیەک ، لەدواییدا دیمان هەرکە ئەهاتن بۆ لێدانی کاکە حەمە ، هێشتا

مەترێكیان مابوو بگەنە لای ، بەدەنگی بەرز هاواریئەكرد سەبازەكانیش تورە ئەبوون و جنێویانئەدا ، ئەیانوت بۆهاوار ئەكەیت،،،؟ ، خۆلێمان نەداویت ، بەم جۆرە خۆشبەختانە لە لێدان ڕزگاریبوو ، ئەوشەوە بردبوویان بۆ لێكۆڵێنەوە ولەدواییدا لە حەوشەكەدا لەبەر سەرما هێشتبوویانەوە ، ئیتر لێدانی نەخوارد.

كاك محەمەد پیاوێكی كەم دوو بوو قسە خۆش بوو هاوسەرگیری نەكردبوو ، جل و بەرگی كوردی لە بەردابوو شێك و ڕێك و پێك بوو پاك و تەمیزبوو ، بەپەلە پیتكە خۆی ئەتەكاند ئەمەبوو بەهۆی ئەوەی لەناو خۆڵ و قوڕدا بیتلێننەوە لێدانی زۆر بخوات ساتەنەساتێك ئەیوت : من بەحەیاتم سیاسەتم نەكردوە ، دوایی زانیمان ئەندامی پارتی دیموكراتی كوردستان بوو بێگومان ئێمە قسەكەیمان سەلماند ، كەمەبەستی ئەوەبوو، پێویست ناكات هەرچی نهێنیەكی هەیە بیدركێنێت كەزۆرمان ناناسێت.

❋❋❋

## تۆفیقی کەریم خان (تۆفیق ئاغا کەریم خان)

هەرسەر لەوئێوارەدا میوانێکی تازەیانکرد بە ئینزیباتخانەدا کە ناوی : تۆفیقی کەریم خان بوو بووخەڵکی گەڕەکی بەرخانەقا بوو باوکی پیاوێکی قسەخۆش و کەسایەتیەکی ناسراوی شاری سلێمانی بوو لەوەئەچوو لەبنەماڵەیەکی ناودارین بە خان و ئاغا ناویان دەرکردبوو کاتێک لەقوتابخانەی خالدیەی سەرەتایی قوتابی بووم کاک تۆفیقم ئەناسی ، فەرمانبەری خەستەخانە بوو . پیاوێکی بێدەنگ و ڕەوشتبەرزبوو

بەهۆی هاتنی (تۆفیق کەریم خان ) وە کاکە حەمەی لالە ئەمین بیر چووەوە، ئیتر لێدانی ئەوتۆی نەخوارد، پێش ئەوەی تۆفیق بهێنن بۆ ئینزیباتخانە بۆ ناو حەوشەکە لەڕێگەتێریان لێدابوو بێتاقەت و بێزارکرابوو ، وەک ئاگای لە خۆی نەمابێت وا دەرئەکەوت، سەربازەکان لە حەوشەکەدا کەبەرەڵڵایانکرد یەک تەختە کەوتبوو، یەک خولەکی پێنەچوو کۆمەڵێک سەربازیکە لە دەوری کۆبوونەوە دەستیانکرد بە لێدانی بەشەق و زللەو داروکێبڵ لە ناو خۆڵەکەدا تلانیانەوە ، بەدەستیانەوە هاواریئەکرد، کەوتبوو زۆر ئاگای لەخۆنەبوو ، هەروازیان لێنەهێنا بەپۆستاڵ بەپشت و سنگ و ورگیاندا ئەماڵی ، دوای ماوەیەک لێی دورکەوتنەوە هاتەوە هۆشخۆ بەپێووە ڕاوەستابوو بەردەوام هاواریئەکرد، ئاگای لەخۆینەبوو وەک وڕێنەبکات وابوو ، لە بەرئەوەی زۆریان لێدابوو بەتایبەت لەسەری، بێئیرادە بەحەوشەکەدا ئەسوڕایەوە لەبەر خۆیەوە قسەی ئەکرد .

دوایی بردیان بۆژوری لێکۆڵینەوە و ئازاردان ، دوای ماوەیەک بێهۆش بەچوار پەڵ هەڵیانگرتبوو لە حەوشەکەدا فرێیاندا، ئەوشەوە لە بەرسەرماو لەبەر نمە باران لەگەڵ کاکە حەمەی لالە ئەمین لەحەوشەکەدا هێشتیانەوە بۆ بەیانی لێدانیان نەخوارد ، وەک هاتەبیرمان لەوەئەچوو ، لە دەرەوەی ئینزیباتخانە کەسێک هەبێت فریایان کەوتبێت کەئازارنەدرێن ، بەدەردی ئەوانی کە نەبرێن .

ئەو بەیانیە زوو حەمەی لالە ئەمینیان هێنایە ناو ژورەکەمان کاکە حەمە ئەشەلی وهاواری دەستیبوو کەئازاری پێگەییبوو .

فلیمەکەی حەمە رەئوف وعەبدی تەتەرچارە دەستپێکردەوە ئەم بەیانیە کاکە حەمەی لالە ئەمین لێدانی زۆری بەرکەوت لەبەر ئەوەی میوانی تازەبوو ، کاکە حەمە ساتە نەساتێک سوێندی ئەخوارد کە بەخۆڕایی گیراوە و بەحەیاتی سیاسەتی نەکردوە تێوەگلاوە .

تۆفیق کەریم خان برا بۆ ژوری ئەوبەرمان کەناومان نابوو ژوری (حەمە ڕەشێد ئەحەشانە). کەژورەکەمان کراوە بووایە ئەماتوانی قسەلەگەڵ یەکتر بکەین .

هەر ئەو ڕۆژە کاکەحەمەی فەرەجە فەندی گوێزرایەوە بۆ ژوری عەلی ئیبراهیم دەروێش کەدوربوو لەئێمەوە لەوبەرەوە بوو ، لەتەنیشت ژورەکەی سەردالآنی دەرەوە بوو، دەرگای لەسەری نەبوو، زیندانیەکانی ئەم ژورە پێک هاتبوون لە ڕەئوفی فەرەجەفەندی، حەمەی فەرەجە فەندی ، عەلی ئیبراهیم دەروێش، جەزای عەلی کاتب ،کەمالی حەمەی فەرەجەفەندی، ئێمە ئەوانمان نەئەدی ، لە کاتی هاتنەدەروەدا بۆ توالێت ولێدان لەدورەوە ئەماندین .
ڕۆژانە تەنها بۆلێدان بەسەر ئەکراینەوە پرسیاریان نەئەکرد کەناو بلێێن تەنها لێدانمان ئەخوارد، هەر جارێک یەیکێک بانگبکرایە یان بۆ دەم وچاوشتن بچوایە سەرباز لە وناوە بوونایە بەشەق کاروانەیان پێئەکرد .

## شانۆگەری هات وبردی ناو حەوشەکە :

نزیک نیوەڕۆبوو هاتنە سەرمان وتیان خۆتان ڕێک و پێک بکەن ئامادەبن ، ئێمە لەمەبەستیان تێنەگەیشتین ، یەکە یەکە ئەیانبردین بۆ ناو حەوشەکە پیاسەیان پێئەکردین پێیان ئەوتین لێرەوە تا ئەولایە بڕۆن و سەرتان بەرز بکەنەوە و بگەڕێنەوە ،نەیان هێشت بەکۆمەڵ پیاسەبکەین ، ئێمەیش تاک تاکە ئەهاتین و ئەچووین ، بەڵام لێدانی تیانەبوو ، نەمان زانی ئەم شانوە گەریە هۆی چی بوو بەچی مەبەستێک براینە ناو حەوشەکەوە،،،؟.
لەدواییدا زانیمان ، هۆیەکەی چیبوو ، کەس وکارمان بیستبوویان ئێمە کوژراوین لەبەر ئەوە لە بەردەم ئینزیباتخانە کۆبوونەتەوە ، بەتایبەت ژنان وەک خۆپیشاندانی ناڕەزایی لەبەردەم ئینزیباخانەداو لەسەر شەقامەکاندا گرد بوونەتەوە ، دژی زەعیم سدیق هاواریان کردبوو، داوای بینینی کەس و کاری گیراویان کردبوو ، داوایان کردبوو ئەبێت بەهەر هۆیەک بێت ،هەر بمان بینن ،بەو هۆیەوە، ئێمەیان هێنابووە ناو حەوشەکەوە، لەشووێنێکی دانراودا ئێمەیان پێشانداوە داوایان لێکردوین ماوەیەک ڕاوەستین تاکەس و کارمان لەدەرەوە بمان بینن دڵنیابن کە ماوین ، تومەز کەسوکارمان لە دەرەوە لە بەر دەرگاکە ڕاوەستاون هەرکەسێک لە ناو حەوشەکدا بێت و بچێت ئەیبینن ، بەم هۆیەوە هەموو دڵنیابوون کەماوین بەڵام کزو شێواو ڕێش هاتوو جل و بەرگ دڕاوبووین .
هەر ئەورۆژە کەسوکارمان ئاگادارکرابوون لەبەیانیەوە هەموو ڕۆژێک خواردن بهێنن بۆمان ئیتر هەرکەسێک بەپێی حاڵی خۆی بەسەفەرتاس یان لەناو مەنجەڵی پچوکدا لە ناو چارۆکەدا خواردنی بۆئەهات ، سەربازێک ئەیهێنایە ناو حەوشەکەوە بانگی خاوەنەکەی ئەکردو ئەیدایە دەستی.

***

## قبوڵێەکەی ماڵی حاجی فەرەجی سوسێ :

پاش نیوەڕۆیەکی ڕۆژی دوایی (حاجی فەرەجی سوسێ) لەپڕ بانگکرا لە بەر دەرگای ژورەکەدا وەستا چاوەڕوان بوو .

سەیرمانکرد یەک مەنجەڵی گەورەی پێێە پێچراوەتەوە ، هەموو بەندکراوەکانی ژورەکەمان لە دەوری کۆبوونەوە ، کەکردمانەوە قبوڵی بوو بەگۆشتی سورکراوە بەکشمیشەوە بەسەریەوە بووو، بەبرنجی تازە کرپە کراوی کوردیەوە کە هی ئەمساڵ بوو بەڕۆنی کوردی لێنرابوو ، لینجیەکەی عەلامەتی زۆر تازەییبوو ئێمەێش تامەزرۆ بووین بۆ خواردنی لەوجۆرە جێشتە ،کەماوەیەک بوو خواردنی ئەوتۆمان نەخواردبوو سکمان بەسەوموونە ڕەق سواغ درابوو ، چی جای برنج بەگۆشتی سورەوەلکراوەوە ، هەموو لەدەوری مەنجەڵەکە کە کۆبووینەوە، هەموو بەیەکەوە بەپێنج پەنجە دەستمان کرد بەخواردنی ،کاتێک خواردمان تامی برنجە تازەکەمان کرد ، هەموو وتمان دەک ماڵت ئاوابێت ، حاجی فەرەج بۆخۆت وئەم قبوولیە خۆشەت ، کە تاکە برنج بوو لەوماوە دورو درێژەدا بیخۆین زۆر تامەزرۆی بووین ، برسیش بووین ، تێی ئاڵابووین ئەمان وت ئای چەند بەلەزەت و خۆشە ، کاک قادربرسی ئەی وت و ئەیوتەوە هێواداریین حاجی فەرەج بەم زوانە بەرنەبێت ماوەیەک لەگەڵمان بمێنێتەوە، تا هەموو ڕۆژێک ئەم قبوڵیە خۆشە تەڕوبڕەی ماڵیان بخۆین ، دەستی ئەوە خۆشبێت کەلێیناوە ، حاجی فەرەج فەرمووی : بخۆن عافێتتان بێت ، هەتا لێرەبم هەموو ڕۆژێک هەربۆتان دێت ، لەوە خۆشتریش و باشتریش ئەخۆن ، بەڵام وادیارە کاک قادر دوعای خێرم بۆئەکات ، کاک قادر تۆ دوعای خیرم بۆبکە...!، لەشم ساغ بێت و زوبەربم ، هەموو دەستمانکرد بەپێکەنین ، بەوخواردنە خۆشە ناوازەیە ئاهێک و هێزێکمان پیاهاتەوە کەماوەیەک بوو خواردنی واخۆشمان نەخواردبوو.

***

# سەرەی کۆمۆنیستەکانیش هات

## جەوهەر سدیق شاوەیس

هێشتا هەر نیوەڕۆبوو دیمان د. جەوهەر سدیق شاوەیس هەر پەلێکی بە دەست سەربازێکەوە بوو، هەر یەکەیان لایەکی گرتبوو لە حەوشەکەدا لەبەردەم ژوری ئامر ئینزیباتدا وەستانیان ، دو سەربازەکە ئیشارەتی سەربازیکەیان کرد ، چەند وشەیەکیان بەگوێیاندا چرپاند ، هەموو وەک زەردەواڵە وروژان تێیئاڵان ،وەک مەسەلەکە ئەڵێت بگرەوو بکوتە ، پاڵە پەستۆیان بوو بۆلێدانی، ئاسایی دایانە بەرزللەو شەقی پۆستاڵ و دارە کێبڵ هەندێکیان بە بۆکس بەربوونە سەری و دەم وچاوی دیمان خوێن بەدەم و لوتیداا ئەهاتە خوارێ ، لەحەوشەکەدا پاڵیانخست وپەکیانخست توانای هەڵسانەوەی نەما، نیوە مردویان کردلەپەل ە پۆیانخست لە ژێر دەستیاندا بورایەوە وئێمـە لەپەنجەرەکەوە سەیرمان ئەکرد .

جەوهەر سدیق شاویس برای نوری شاوەیس بوو ، کەبنەماڵەیەکی ناوداری سلێمانی بوون بە ناوی (شاوەیس) ناویان دەرکردبوو پلەو پایەو ناوێکیان هەبوو لە خەبات و کوردایەتیدا ، بەتایبەت مامی کە (ئیسماعیل شاوەیس) بوو لەگەڵ باوکی (سدیق شاوەیس) و براکانی وەکو نوری و نەورۆزو برازاکەی ڕۆژنوری شاوەیس و کەسایەتی کەی ئەوبنەماڵەیە ، کـاک جەوهەر لاوێکی ڕۆشنبیری تێگەیشتووبوو بەهەلوێست بوو زۆر نەرم نەبوو وبەڕێز بوو شارەزای بیـری پێشکەوتوو وسیاسەتبوو ئازادی خوازبوو لەدورەوە ئەمناسی ،لەبردەرانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوو (حیزبی شیوعی عێراقی ) .

کات بەرەو تاریکی ئەچوو بەچواردەستە کاک جەوهەریان هێنایە ناو ژورەکەی ئێمە و فڕییاندا، مـاوەیەک بێهۆشـبوو دوایـی کە شـەو درەنگبـوو هـاتەوە هۆشـخۆی و هـاتە قـسە وتـی : ( ئەوە چیە قەسابخانەیە ، تائەمڕۆ نەمزانیوە شوێنی ترسناک و ئازاردان و ئەشکەنجەدانی واهەیە ، کوڕە پیاو لێرەدا زوو پێستی ئەبرێت بۆ ؛ دەباغخانە ؛، ئەمانە ئینسانن یان کۆمەڵێک دڕندەو پیاوکوژ ،،، ؟،من شتی وام نەبیستوەو و نەدیوە ) . ئێمە وەرامان دایەوە وتمان : کاکە ئەوە شەربەتە هێشتاماوتە، باشەو درەنگ ببێت و نۆرە بێتە سەرت ئەوسا ئەیانبینیـت چین و بارەکە باشتر تێئەگەیت .

هۆی گرتنەکەی کاک جەوهەر ، وەکخۆی گێڕایەوە هەنـدێک بڵاوکـراوە (بەیـان) ی حیزبـی شێوعی عێراقی لەگیرفاندا پێبووە لەکـۆڵانی ئەوقـافەوە بەرەو ژوربـووەتەوە بەرەو کـارێزی ئەحمەد زەنگەنە. لەوکۆڵانەدا توشی مەفرەزەیەکی سەربازی وئەمن بووە کە چون بۆ پشکنین وگرتنی خەڵکی لەوناوەدا ، کە کاک جەوهەر ئەگاتە ئاستیان ، داوای وەسـتان و گەڕانەوەی

لێئەکەن ، وەک خۆی گێڕایەوە بەجۆرێک وەڵامی دابـوونەوە کە، سەربەسـتە ، ئەڕوات ئەوان بۆڕێگەی لێئەگرن ،،،؟. کاک جەوهەر پیاوێکی ڕۆشنبیرو شارەزاو تێکوشەربوو ( مەنازل) بوو ، زۆر بڕوای بەخۆی وبیروباوەڕێ هەبوو لەهەڵوێستیدا زۆرنەرم نەبوو ، هەست وبڕوای وابوو کە ئەمڕۆ زەمانی سەربەستی وئازادیە بۆچی ڕێگەی لێئەگرن ،،،؟، وائەزانم شێوەی جوابدانەوە و هەڵوێستی بەشێوەیەک بوو وای لێکردبوون ئەو دڕندانە بەتوڕەبوونەوە بانگیبکەن وگیانی بگەڕێن ، بڵاوکراوەکانی گیرفانی بگرن ، لە ئەنجامدا بیگرن بەرەو ئینزیباتخانە بیهێنن .

(لەسـاڵی ١٩٩٩دا لەشـاری لایبزیـک لە ئەڵمانیـا دیـم کەبڕوانـامەی دوکتـۆرای وەرگرتبـوو بەتەرجومەوە کاریئەکرد لەژیانی هاوسەریدا کۆڕێکی هەبوو. بۆی گێڕامەوە باسی بۆکردم کە ئەو ماوەیە لەگەڵتان بەندکرابووم منیان نەقڵکرد بۆبەغداد ، لەوێ زۆر ئازاردرام گـوێزرامەوە بـۆ (نوگرەت سەلمان) ماوەیەک لەوێ مامەوە دوای ئەوەی ئازادکرام عێراقم بەجێهێـشت بەرەو ئەلمانیـای ڕۆژهەڵات ، لەوێ نیـشتەجێ بـووم خوێنـدم ،لـە ئـەنجامـدا بڕوانامـەی دوکتـۆرام وەرگرتوە).

وەک باسمان کرد میوانی ئەمڕۆمان کاک جەوهەر سدیق شاوەیس بوو کاتێک هاتەوە هۆش خوی و کەوتەقـسەو لە وتەکـانی بـووەوە هەنـدێک رونکـردنەوە و ئاگاداریمـان دایە دەربـارەی ئینزیباتخانەو لێکۆڵێنەوەو ژوری ئەشکەنجەو ئازاردان .

ئەمنەکان کەزانیبوویان شیوعیە بەدرێژایی ڕۆژ بەر ژورەکەی ئێمەیان بەرنەئەدا ئەیان وت: (ئەمە شێوعیەو خوانەناسە) لەبەرئەوە کوشتنی ڕەوایە، بەڵام سەربازەکان وەک (لەدواییدا بۆماندەرکەوت) باشتربوون لەگەڵ کاک جەوهەردا (لەبەرئەوەی کۆمۆنیست بوو) سەربازەکان ئەیان وت بەسنیە ئەم پێاوە بیروباوەری ئینفیسالی نیە لەئێوە باشترە ئێوە ئینفیسالین نمەک بەحەرامن (ناکر الجمیلن) لەبەر ئەوهۆیانە ئەمنەکـان لەگەڵ ئـێمە باشـتربوون سـەربازەکان لەگەڵ کاک جەوهەر باشتربوون بەڵام هەردولا هەردوژمن بوون .

لەشەوێکی درەنگدا لەپڕ هاتن بۆ کاک جەوهەر ببردیان بۆ لێکۆڵێنەوەو ئازاردانی نەمـازانی بۆکوێیان برد ، دوای نیوەشەو هێنایانەوە بۆلای ئێمە بەبێهۆشی بەگیانی بریندارو خوێناویەوە ئێمەیش بەدەنگیەوە چوین ئەوەی توانیمان برینەکانیمان سڕی و تیمارکرد، کەسەیرمانکرد سەروی سنگی ڕوتکرابوو، هەمووی سوتابوو تومەز بەجگەرە هەموویان سووتانبوو ، شـوێنی سوتاوەکان هێشتا سووتوەکەی پێوە مابوو، بەسەرسنگیەوە دیاربوو بەیانی هاتەوە هۆش خۆی لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەم بەئازاربوو گێژ بوو زۆر ئاگای لەخۆی نەبوو زوربەی لەشی بریندابوو، خوێنی پێووە بوو شێن بوو بووەوە توانای جوڵەو قسەکردنی نەبوو ئەیناڵاند.

# سەردار و سالار قرگەیی

ئەو ڕۆژە ئێمە هەر سەیر کەر بووین کەس بیری ئێمەی نەمابوو . بۆڕۆژی دوای فلیمەکەی عەبدو حەمە ڕەئوف هەر بەردەوام بوو بەکاک جەوهەرەوە خەریکبوون ، لەشەویشدا لەژوری لێکۆڵێنەوە بەئازاردان و پرسیاری کاک جەوهەرەوە خەریکبوون .
دەمەو عەسربوو هەموو سەربازەکانیان کۆکردەوە و ڕیزیانکردن و بەسەریانکردنەوە هاواریان ئەکرد، پێیان ئەوتن خێراکەن ، لەوە ئەچوو کە هیرشێک یان کارێکیان بەدەستەوەبێت ( لەناوشآر یان لەدەررەوەی شار) ئەنجامیبدەن زۆرترینیان بەخێرایی چوونە دەرەوە ئەوناوەیان چۆڵکرد، لە دوای چەند سەعاتێک گەڕانەوە دیمان دوو کەسیان بەدەستەوەیە بەجلی کوردیەوە ، بەدەم لێدانەوە هینایانن بۆ ناوەڕاستی حەوشەکە، دەستیانکرد بەلێدانیان ، تەختی زەویان کردن بەنیوەبوراوەیی کەوتبوون ، سەربازەکان لە خۆشیاندا هاواریانئەکرد بیشمورگەیان گرتوە چەند سەربازێکمان دی چەند فەردەیەکیان بەدەستەوەیە ڕایئەکێشن، لەناو حەوشەکەدا هەڵیانڕشتن هەموو پێڵاوی لاستێکبوون لەماوەیەکی کەمدا سەربازەکان هەموویان ماشێەوە،چەند تاکێکی لەناو حەوشەکەدا لەو ناوەدا مابوو، هەر بۆ پێکەنین: ( کاتێک یەکێک لەسەربازەکان هاتەوە کە لە بازاڕبوو لەگەڵیان نەچووبوو کە هاتە ناو حەوشەکەوە،بۆ ئەوەی وەک هاوڕێکانی پێڵاوی بەربکەوێت، یەک تاکی دۆزیەوە، گەڕا بۆ تاکەکەی کەی نەیدۆزیەوە، گرتبووی بە دەستیەوە جنێویئدا بەسەبازەکان کەبەشی ئەویان نەهێشتوەتەوە ) .
قادر برسی وتی: من ئەو دوو لاوە ئەناسم کە خاوەنی فەردە پێڵاوەکانن (سەردارو سالار قرگەیین ) خەریکی کەسابەتن ، دوای چەندساڵێک هەردوکیانم ناسی و باسم بۆکردن چۆن سەربازەکان پەلاماری پێڵاوەکانیان ئەداو لەماوەیەکی کەمدا دانەیەکی لەوناوەدا نەماو ماشرایەوە، باسیان بۆکردم وتیان: تۆمەتباری ئەوەیان کردین گوایە ئێمە پێشمەرگەین، ئەوپێڵاوانە ئەبەین بۆ ئەوان، بەناوی پێشمەگەوە ماڵەکەیان گرتبوو، هەر ئەو ئێوارەیە بەپاڵ هەردوکیان کردە دەرەوە .

## گوارەی گوێی کچێکی ناوچەی قرگە بەخوێنەوە

هەر ئەو ئێوارەیە دوسەربازمان دی لەوانەی لە پەلامارەکەی قرگەدابوون لەبەر پەنجەرەکەی ئێمەدا ڕاوەستابوون قسەیان بۆ یەکتریئەکرد ، یەکێکیان تاکێک گوارەی ئاڵتونی لە گیرفانی دەرکرد پیشانی برادەرەکەیدا خوێناوییبوو دەستیشی وەکو خوێنی پێوەبێت وابوو ،باسی بۆ ئەکرد چۆن پەلاماری کچێکی داوە ( لە قرگەیان لە کۆزەڕەقە ) وبەزۆر گوارەکەی لە گوێی ڕاکێشاوە برینداری کردوە وگوێیدڕاندوە تا ئەو گوارەیەی دەستکەوتووە ، ئەو ڕەفتارە نامەردیەو وەحشی گەریە کاری زۆر تێکردین .

# چەند سەربازێکی کۆمۆنیست و جەوهەر سدیق شاوەیس

هەروەک باسکرا کاک جەوهەر سدیق زۆر ئازار درابوو لە پەل و پۆ کەوتبـوو ، ئـێمەیش هەر لەدەوری بووین برینەکانی لەشی زۆربوون بەتایبەت سوتاویەکانی سەرسنگی، بۆ شەوی دوایی لەپڕ دەرگاکەمان کرایەوە نائیب زابتێک لە گەڵ دوسەربازدا هاتنەژورەوە پێویستی دەرمـان وبـرین پـێچ وهـۆی تیمارکردنیـان بەدەسـتەوەبوو یەکـسەر هـاتن بـۆلای جەوهەر شـاوەیس بەدەورباهاتن، دەستیانکردبە تیمارکردن و پاککردنەوەی برینەکانی وبۆیان پێچا دەرمانیـان دایە، دیمـان هەرهەناسـەی بـەزەیـی ونارەزاییـان هەڵئەکێـشا و داخـی خۆیـان هەڵئەڕشـت بەرامبەربەو کوشتن وبڕین ئازاردانەی خەڵکـی، لەقـسەکاندا بۆمـان دەرکەوت کەئەم کەسـانە لەبرادەرانی کۆمۆنیستبوون، لە هاوڕێیانی کـاک جەوهەربـوون فرسـەتیان وەرگرتبـوو کەبـێن بۆتیمارکردنی ، بەدەنگ ئێمەشەوە هاتن بەتیمارکردنی برینەکانمان بەپێچانیانەوە خەریک بوون، وهەندێک دەرمانیاندا پێمان، فرسەتێک بوو بۆ حەمەی لالە ئەمین کە دەست و قاچیـان بـۆ پێچاو تیماریان کرد، وتیان ئێوە چی ڕاسپاردەیەکتان هەیە بۆلای برادەرانتان، ئێمە پەیوەندیان پێوە ئەکەین بۆتان ئەگەیەنین ، ئیمەیش هەندێک زانیاری گشیمان پێدان زۆرسوپاسمانکردن کەیارمەتیان داین.

ئەوشەوە دیمان و گوێمـان لێبـوو سـەربازەکەی بەردەرگامـان هەر بـۆڵە بۆڵیبـوو بێزاربـوو ناڕەحەت بوو، لەدواییدازانیمان خەڵکی (کەربەلا )یە (شیعە) بوو لەو زوڵم و زۆرە بێزاربـووە، کەلێمان پرسی بۆچی بێزاریت : کەوتە قسە وداخی دڵی بۆمان هەڵڕشت وتی: ناڕەحـەتـم و بێزارم وچارمنیە کە ناتوانم یارمەتیتان بدەم .

{ بەڕاستی ئەتوانم بڵێم ،کاک قادر بووە ئەستێرەی گەشـی دەروشـاوەی ژورەکە و پاڵپـشت وهاوکاربوو بۆهەموو، دڵخۆشی ئەدواینەوە، قسەی بەجێی ئەکرد ورەی خەڵکی بەرز ئەکردەوە }.

شەوێک لەشەوان لەو شەوە درەنگاندا کاتێک تۆزێک هاتبووینەوە سەرخۆ هەموو دانیشتبووین قسەوباسی دنیاییمان ئەکردو ، قادربرسی قسەی خۆشی بۆ ئەکردین نوکتەی خۆشی ئەگێرایەوە لەگەرمەی پێکەنینـداو گێـڕانەوەی نوکتەدابـووین ، نەمـانزانی کە ئـامر ئینزیبـات لەنزیـک پرنجەرەرەکەوە خوی لێگرتوین لەپەنایەکەوە سەیرمانئەکات گوێیگرتوە ، لەپڕ خـۆیکرد بـە ژووردا و ماڵی بەسەری خویدا وتی: ( ئێوە چەند بێعارن سەرسەختن لەسەرو ئەو هەموو لێدان و تێهەڵدان و ئازاردانەوە ، کەچی دانیشتون پێئەکەنن ) ئەمریکرد ئەوشەوە یەکە یەکە براینە دەروە لێدانی باشمان خوارد حەقی بەرودوای لێکردینەوە هەرچی قسەی ناشێرینی عەربـی و جنێو هەیە پێیداین بەخۆمان و گەورەکانمان .ئەوشەوە بەلێدان کراینە خەو .

## ئامر ئینزیباتی نوێ (ڕەشید المهداوی)

ئەو ئامر ئینزیباتەی کەشەوی ڕابووردو هاتەسەرمان لێیداین تازەهاتبوو (ناوی ڕشید المهداوی ) بوو خاوەنی دو ئەستێرەی سەرشان بوو ، پیاوێکی درێژبوو پێستی بەلای ڕەشدا ئەیڕوانی بێ شەخسیەتبوو زۆر حەزی بەلێدان و ئازاردانمان ئەکرد جنێوفرۆشبوو زۆر ڕقی لەکوردبوو ، هەردەم دارێکی بەدەستەوە بوو بەو ناودا ئەسوڕایەوە ، وەک بەدوای نێچیردابگەڕێت وابوو حەزی بەوەبوو کە بەدارەکەی ، بماڵێت بە هەرکەسێکدا دەستی ئەکەوێت ، لەوە ئەچوو کە نەخۆشی دەرونی هەبێت ،یان بەوشێوەیە پەروەردە کرابێت ، بەوە دڵی ئارام بێتەوە کە لە خەڵکی بدات .

کەپیاو سەیری ئەکرد نمونەی عەرەبێکی پێپەتی ئەهێنایەوە یاد دشداشە لەبەر کە دوای حوشترێک کەوتوە، لەگەڵ عەشیرەتەکەی بۆ تالآنی و شڕەخۆری ، بەدوای لەشکری ئیسلامدا لە دورگەی عەرەبەوە هاتوە ،بۆ نیشتەجێ بوون لەو وڵاتانەدا کە داگیر ئەکرێت ، دەست ئەگرن بەسەر ماڵ و موڵک وزەوی و زارو ژن منداڵی ئەوگەلە بندەست کراوانەدا ، بوونەتە گەورەی ئەومیللەتە بندەستە وڵات داگیرکراوە ، ئەوگەل و نەتەوانە کراونەتە دانیشتوی ژمارە دوون کاریان خزمەتکردنی ئەوعەرەبە جاهیلانەن ،کە پێ پەتی و بەتوێی دشداشەیەکەوە لەدورگەی عەرەبەوە هاتون ،هەرچی شیوەیەکی شارستانیە نیانە وگیانی مرۆڤایەتی و بەزەیی لە دەرونیاندانیە تەنها کوشتن وبڕن نەبێت ، بیروباوەڕی جەهالەتی عەربی لەمێشک و دەرونیاندا ڕۆنگ ئەخواتەوەو چەسپ بووە، بیروباوەڕی جاهیلیەتیان لە مێشکدایەو ، گیانی ئیسلامەتیان ، بەڕواڵەت وەرگرتوە وپەیڕەوی ناکەن .

ئەو نەتەوانەیش بەدەستیانەوە گیرۆدەن، کراونەتە موسوڵمان لەگەڵ ئەوەشدا، ئەبێت سەرانە بدەن بە عەرەنەکان و وەک کۆیلە بەردەستەیان بن. ناوی (موالیان) لێنراوە دانیشتوی پلە دوون و خاوەنی هێچ شتێک نین .



**ئەحمەد عارف فریشتەیەک بوو فریامانکەوت**

**ڕۆژانە هەواڵی ئەهێناو ئەیبردکە بەو هۆیەوە زۆرکەس ڕزگاربوو لەگرتن**

## (ئەحمەد عارف فریشتەیەک)

**ناسراو بە (ئەحمەدی عارفەلو) فرمانبەری شارەوانی، ئەوبەیانیە بەتاریک ڕونی هەموو لە سەرمانا هەڵساین هەڵئەلەرزین مانگ بەرەو کۆتایی ساڵ ئەچوو ، چاوەڕوانی عەبدو حەمە ڕەئوف بووین ، دیمان کاک ئەحمەد عارف لەگەڵ چەند کرێکارێک لەوناوەدایە و بەناو حەوشەکەدا ئەسوڕێتەوە چەند کرێکارێکی شارەوانی لەگەڵە هاتوون بۆ پاککردنەوەی ئینزیباتخانە .**

**ئەوبەیانیە کە دیمان کاک ئەحمەد عارف ناوداربە وناسراو بە (ئەحەی عارفە لو ) کەفرمانبەری شارەوانی سلێمانیبوو ، هاتە حەوشەکەوە دڵمان کرایەوە هیوای ئەوەمان لێکرد بەڵکو هەواڵمان بەدەرەوە بگەیەنێت ،چەند کرێکارێکی لەگەڵدابوو گەسک بەدەست بە حەوشەکەدا ئەسوڕانەوە ، وەک دەرکەوت بۆپاککردنەوەی ئینزیباتخانە هاتبوون ، ،لەگەل نائب زابتەکان وەستاو قسەیانکرد ، دوایی بەدەم ئاڕاستەکردنی کرێکارەکانەوە بۆپاککردنەوە چاویئەگێڕا ، لەوەئەچوو بۆ ئێمە بگەڕێت ، ئێمەی بەدیکرد ، بەناوی پاککردنەوە هاتەناو ژورەکەمانەوە ، دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵمان بەتایبەت لەگەڵ ئەنوەر دارتاش وتی :**

**{ ئیتر هەموو ڕۆژێک دێم بۆ پاککردنەوە چیتان هەیە لە ڕاسپاردە بەدەمی یان بەنووسین ، ئەیگەیەنم بۆتان لەبەرئەوەی ڕاسپێرراوم ، کە بتان بینم و هەوڵتان بگەیەنم .} . بەڕاستی ئەمە مزگێنیەکی خوشبوو فریشتەیەک برەخسێت هەواڵمان بگەیەنێت بەدەرەوە و ئاگاداری زۆر روداوی ناو ئینخزیباتخانە بن ، زۆردڵی خۆشکردین وەک دەرکەوت لە لایەن ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە لەدەرەوە ڕاسپێررابوو ، ئێمە قەڵەممان پەیداکردبوو ، پارچەکاغەزی گلۆسەجگەرەمان بەکار ئەهێنا و هەواڵ و ڕوداو وتێبینی و زانیاری ڕۆژانەمان**

بەکورتی ئەنووسی، و چی ڕوپئەدا لە ژوری لێکۆڵێنەوە و کێ گیراوە وچی وتراوە؟ هەواڵی ڕۆژانە ڕائەگەیەنرا. هەموو رۆژێک نامە ئەنووسرا ، کاک ئەحمەد عارف دوای تەواوبوونی کارەکانی ئەهاتە ژورەوە ڕائەوەستا ئێمەیش نامە نووسراوەکەمان پێجابووەوە ئەمان خستە ناو کڵاشە دۆمیەکانیەوە، کە کردبوویە سەرپێی ، ئەویش کڵاشەکانی هەڵئەکێشا و خێرا ئەچووە دەرەوە .

کاک ئەحمەد پیاوێکی کوردپەروەر و دڵسۆزبوو لە ناو خەڵکیدا خۆشەویستبوو ، ناسراوی شارەکەبوو قسەخۆشبوو ، لەوکەسایەتیانەی سلێمانی بوو هەر بۆپێکەنین لەگەڵ برادەرەکانی جنیویان بەیەکتری ئەدا کەهەمووی جنێوی هەڵبژاردەبوون .

بەوشێوەیە ئێمە حەساینەوە هەموو ڕۆژێک نامەی هەواڵ وڕوداوی ئەبردە دەرەوە، هەندێ جاریش هەواڵ و ڕاسپاردەو ئامۆژگاری لیژنەی ناوچەی بۆ ئەهێنایین، بەکورتی بەسەرپێی وبەدەمی پێی ڕائەگەیاندین .

ئەوەی ڕۆژانە نامەکانی ئەنووسی ئەنوەر سەعید دارتاشبوو، من وقادربرسی یەکێکمان بەپێووە لە بەر پەنجەرەکەدا ڕائەوەستاین بۆچاودێری ، بەڕاستی بەم کارە سوودێکی باشمان گەیاند بەدەرەوەو بە ڕێکخستنەکان و خەڵکی و پاراستنی نهێنی و فریاکەوتنی خەڵکی وکەمکردنەوەی زیانەکان . ئەم کارە بۆماوەیەکی زۆر بەردەوامبوو، سەرکەوتنێکی کاتی گەورەبوو بۆ هەموو ، کەلەو ڕێیەوە بتوانین سنورێک دابنێین بۆخراپەکاری لە ئینزیباتخانە وخەڵکی بپارێزین لەگرتن وفریای خۆیان بکەون. وچەند شوێنی تایبەتی نهێنی بپارێزن و نەهێڵن دەستی میری بگاتە شووێنی گرنگ و نهێنی دەستی بگرێت بەسەرئامرازی چاپەمەنی وشوێنی کەسانی بەرپرس .

***



لوتفی مەحمود (کشمیش) بەجلی پێشمەرگەوە لەگەڵ شەهیدعەلی عەسکەری

# کاک عارف و حەمەسەعید و کشمیش

## پێشمەرگەی ناوشار

بەیانیەک دولاویان بە حەوشەکەدا کرد یەک لە دوای یەک لەحەوشەکدا تییان ئاڵان جاران ئاسایی تاشلکوتی مەرگیان نەکردن وازیاننەهێنا وبەدەردی لاوەکانی پێشویان بردن ، بەدەستیانەوە هەردوکیان هاوارو ناڵەیانبوو ، دوای ئەوەی لەپەل وپۆ کەوتن بێدەنگبوون لەحەوشاکە هەردوکیان لاڵ و پاڵ لێی کەوتبوون هەردوم سەربازەکان هاواریانئەکرد (بیشمورگەمان) گرتوە، کاک قادر برسی وتی هەر دوکیان ئەناسم وەک لەبیرم مابێت یەکێکیان ناوی کاک حەمە سەعیدبوو کەلە (دائیرەی ڕێگەوبان ) فرمانبەر بووە لێخوڕی ( شۆفێری ) شۆفڵ و بلدۆزەربوو ، کاک حەمە سەعید ئەندامێکی کارامەو دڵسۆزی پارتی بوو بەرگەگربوو پێشمەرگەی بەجەرگی ناوشاربوو کورد پەروەرو دڵسۆزو پاکبوو .

تائەم ساڵانەی دواییەش لەڕێگەوباندا ئەمدی و باسی ڕۆژانی سەختی ئینزیباتخانەمان بۆ یەکتری ئەگێرایەوە لەجاران سورتربوو چالاکتر بوو لەڕیزی خەباتی کوردایەتیدا هەر دەم ئامادەبوو.

دووەمیان ناوی کاک عارف بوو دەنگ خۆش بوو پیاوێکی بچکۆلەی لاوازی چاو کزبوو بوو وەک دەرکەوت ئەندامبوو لە ڕێکخستنەکانی پێشمەرگەی ناوشاردا ، لەم دواییەدا هەردەم لە سەرجادەی سابوکەران لە چایخانەیەکدا ئەمدی ، برایەکی قەساب بوو لە وبەر بازاری دۆڵارەکەوە وبەرامبەری، لەسەرسوچێکی شەقامەکەدابوو .

کاک عارف دەنگخۆشبوو(سرودی جەژەجەژنی کوردستانە جەژنی نەورۆزەی لەبەربوو ) هەردەم لەسەر زمانی بوو کەلە ئاوازو هۆنراوەی شاعیری بە ناوبانگ (ع ،ع شەونم) بوو .

دواتر کاک عارف لەبەندیخانەی گشتی سلێمانی هەردەم ئەو سرودە نیشتمانیەی ئەوتەوە، هەردوکیانم ئەدی باسی یادەوەریەکانمان ئەکرد ، هەر بەردەوام لەکاروانی کردایەتیدا لەکاردابوون .

هەردوکیان بەشێوەیک لێان درابوو لەحەوشەکەدا کەوتبوون توانای هەڵسانیان نەبوو ، لەبەر سەرمای زستان و باران چەند شەوێک مانەوە دوایی برانە ژورەکەی حەمە رەشێد ئەحەشانە .ئەوەی ئێمەی سەرسام کردبوو بۆچی ئەم هەموو لاوە والەپڕ ئەگیرێن ، بواری ئەوەمان نەبوو کەزۆر بپرسین لەگەڵیان باسی ئەوهۆیانە بکەین .

***

## (کشمیش)

## لوتفی مەحمود ئەفەندی ڕەسام

دوای چەند ڕۆژێک هەر سەر لەبەیانی کۆمەڵێک سەربازمان دی لاوێکیان بەدەستەوەیە هەردوو دەستیان گرتوە لەوە ئەچوو بورابێتەوە بەدەستیانەوە شل بوو بوو، بەڕاکێشان بەناو قوڕاوەکەدا بەرەو ناوەڕاستی حەوشەکە هاتن فڕێیاندا ، سەربازەکان بەدەنگی بەرز هاواریان ئەکرد ، پێشمەرگەیەکی تازەیان گرتوە، کەدیمان ناسیمانەوە لوتفی (کشمیش ) بوو برای ڕەفیقی وێنەگر، نەیان هێشت هەناسەیەک پشویەک بدات بەلێدانیەوە خەریکبوونەوە ، سەربازەکان بەمەزەنە ٢٠ بیست کەس ئەبوون کە دەورەیان دابوو بەجۆرێکی چاوەڕواننەکراو خەریکی لێدانیبوون بە شەقی پۆستاڵ و تێڵاو دارو کێبڵ ، چەند جار لەتاو لێدان کە بەئاگا ئەبووەوە ئەیویست هەڵسێتەوە ، بەڵام زوو ئەیان خستەوە و بەلەقە تێیبەرئەبوون ، تواناى هەستانەوەی نەما لەژێر پێیانداکەوت هەمیسان بۆرایەوە نیوەمردو کەوت .

{لەدورەوە ئەمناسی کە لە ناوخەلکیدا بە کشمیش ناسرابوو لاوێکی بێوەی وقسەخۆشبوو سادەبوو چاوی زۆرکزبوو خەڵکی خۆشیان ئەویست هاوڕیی خۆشەویستی ( عیزەت یەکپارچەبوو )کشمیش ناوی لوتفی بوو کوڕی مەحمود ئەفەندی ڕەسام بوو برای ڕەفیقی ڕەسام و برای شەهیدی نەمر( محەمەد قودسی ) بوو کە یەکێک بوو لەو چوار ئەفسەرەی لەزەمانی ڕژێمی پاشایەتیدا، لەرۆژی ١٩ / ٥ /١٩٤٧دا لەسێدارەدران. کەلەدوای ڕوخانی کۆماری مەهاباد گەڕابوونەوە عێراق ڕژێمی پاشایەتی هەرچواریانی گرتبوو }.

کشمیش ماوەیەک بەبێهۆشی لە حەوشەکەدا مایەوە کەوتبوو لە ناوگڵ وقوڕودا تلانبویانەوە گیانی خوێناوییبوو بەدرێژایی ئەوڕۆژە هەر نەهاتەوە هۆشخۆی، دەمەو ئێوارەبوو پەلاماریان داو بەچوارپەل هەڵیانگرت هێنایانە ژورەکەی ئێمەوە لەبەردەممماندا بەبۆراوەیی فڕێیان دا، دیمان لە بارێکی زۆر خراپدا بوو خوێین بەلوت دەم وچاویدا ئەهاتە خوارێ .

ئێمە هەندێک دەرمان وپێویستی چارەسەرکردنی برینمان لەلا مابوو کە سەربازە کۆمۆنیستەکان بەجێیان هێشتبوو بۆمان، دەستمانکرد بە پاککردنەوە سڕێنی خوێنی برینەکانی وتیمار کردنی و پێچانی وەک ئەوەی پێویستبوو لە بەردەستدا هەبوو تیمارمانکرد، دوای ماوەیەک وردەوردە هاتەوە هۆشخۆی، دەم و چاوی زۆر بریندار وشێن و ئاوسا بوو، چاوی لەبەرکزی و برینی زۆر دیارنەبوو .

قادر برسی باش ئەیناسی و دەستیکرد بەقسەکردن لەگەڵی و دڵخۆشی دایەوە ، لوتفی لەبەر ئازارو برین دەمی گۆی نەئەکرد وتی : (خۆکوشتمیان ، ئەو هەموو سەربازە تێم ئاڵابوون ،

ئەری لێرە وەزع چۆنە؟) کاک قادر وەڵامی دایەوە: ( ئەوەی ئەیبینیت، جارێ ئەوەڵتە ، ئەولێدانە خوێی چێشتبوو، شەو بانگت ئەکەن بۆتەحقیق و لێکۆڵینەوە ، بۆلیدان و ئازارو ئەشکەنجەدانی بێوێنەوە، داوای ناوت لێئەکەن کە ڕاستی بڵێیت، ئەلێن کێ ئەناسیت و لەپێشمەرگە، کێت لەگەڵە ناویمان پێبڵێ و ئەلێن تۆچیت و لە ناو پێشمەرگەدا کارت چیە؟)
لوتفی وتی: (بۆچی، هیشتا ئەمە لێدان نەبوو؟ بەڕاستی ئەمە زۆر زەحمەتە من بەرگەی وەزعی واناگرم ...!، هەرئەبێت ڕاستی بڵێم وناوی خەڵکی بڵێم؟ ) .
کاک قادر وتی :{بەڵی ،،، پیاو ئەو پیاوەیە ئەمڕۆ بەرگەبگرێت ، خۆ ڕاگربێت ، وەک چۆن کەسێک توشبووە وخوی گیراوە با کەسی کە بەهۆیەوە توشێ ئەم گرتن و ئەم لێدان وسزاو ئازاردانە نەبێت ، لەدواییدا کاک قادر وتی : کاک لوتفی تۆ ئەزانیت ئێمە هەموومان بەچی سوێندمان خواردوە ،،،؟ ،
ئێمە هەموومان بەگیانی پاک و گۆڕی شەهیدی نەمر( محەمەد قودسی ) سوێندمان خواردوە کە هەرگیز ئەم دڕندانە یەک وشەمان لێنەبیستن بەرگەیان بگرین } .
لەپڕ لوتفی ڕاستبووەوە وریایانە سەری بەرزکردەوە بەم لاو لایدا بایدا وچاوەکزەکانی کردەوە سەیرێکی سەرەوەی کردو ملە درێژەکەی باداو لەگەڵ تروکاندنی چاوەکزەکانی وتی :(پەیمان بێت منیش تا گیانم تیا مابێت بەرگەبگرم و مردن لە لام ئاسانتربێت ، یادو ڕێزی گۆڕی ئەو شەهیدە نەمرەی برام نمونەی نەبەزینم بێت ، بەوگۆڕەی سوێند بخۆم ، کە یەک وشەم لێنەبیسن) .
بەڕاستی ئەو پەیمانەی کەدای بەئێمە بردیە سەر وکشمیش بووە ڕۆڵەی بێهاوتاو بەرگەگر ، گاڵتەی بەلێدان و ئازارئەکرد ، شەوبردیان بۆ زۆری پرسیارو لیکۆڵینەوە ، گوێمان لێگرت لەژوری لێکۆڵینەوە ورتەی لەدەمەوە نەهات بەدەستیەوە شێتبوون زۆریان لێدا ، کەهێنایانەوە هەمیسان بورابووەوە ، دیمان بەدەردی مەرگیان بردبوو کەم شوێن هەبوو لە لەشیا شین وبریندار نەبێت ، خوێن بەبرینەکانیدا ئەهاتە خوارێ ، بەوحاڵەوە ماوەیەکی زۆری پێچوو ، کەلە دوای ماوەیەک هاتەوە سەرخۆ شەو درەنگبوو ، لەوە ئەچوو کەچاوەڕوەانی بکەن تادێتەوە هۆش خۆی کەزانیان وریابووەتەوە بەنیازبوون لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەنەوە ، کەهاتەوە سەرخۆ وتمان لەو پەنایەدا پاڵبکەوە تالەپەنجەرەکەوە نەتبینن ، یارمەتیماندا و گوێزامانەوە، لە بن دیواری پەنجەرەکەدا خۆی متکرد لەدەرەوە نەئەبینرا .ئازاری لەش وبرینەکانی کاک لوتفی زۆربوو لەگەڵ ئەوەشدا لەوردە قسەی خۆش نەئەکەت ، کەوتە قسەی خۆش.

***

## ڕەحیم ئوچ قارداش

هەر ئەو ڕۆژە لە نیوەڕۆدا بەلێدان پیاوێکیان کرد بە حەوشەکەدا تێی بەربوون لە ژێردەستیاندا پەلە قاژێیبوو هاواریئەکرد زۆ لەپێکەوت ئەوشەوە بۆلێکۆڵینەوە بـرا، وەک دەرکەوت نەزانـرا بۆچی گیراوە شەو لە دەرەوە مایەوە، وەک کەسانی کە ئەوەندەی لێدان نـەخـوارد، بەیـانی بردیان بۆ ژوری عەلی ئیبراهیم دەروێش، دوایی زانیمـان نـاوی ڕەحـیمە ناسـراو بە ( ڕەحـیم ئوچقارداش ) بەکاری بازرگانی کوتاڵ فرۆشیەوە خەریک بوو ، براکەی کۆتـاڵ فرۆشـبوو لە ڕاستەبازاڕەکەی سەرو پێپلکەکان بەتەنیشت مزگەوتی ناوبازار لای هەنگوین فروشەکان

## چێشتەکەی ماڵی حەمەی لالەئەمین

نیوەڕۆبوو حەمەی لاڵە ئەمین بانگکرا، کە لە ماڵەوە چێشتی بۆ هاتوە (کاکە حەمە باری لەشساغی کۆکبـوو ئـازاری دەسـتی وقـاچی باشـبوو کزبـوو ، بـەڵام وەک چـۆن سـەربـازە کۆمۆنیستەکان بۆیان پێچابوو هەر نەیکردبووەوە) هەر بەستبووی ، بۆ وەرگرتنی خواردنەکەی لەپڕ کە هەستا دەستی وقاچی شەلی بیر چووەوە ، کە کامیان بە ئازارەو ئەشەلێ و کامیان پێچراوە ڕێک وپێک هەڵسا بۆ وەرگرتنی چێشتەکەی کەوتەڕێ ،کە گەڕایەوە کاک قادر برسی هەڵیدایە وتی : کاکە حەمە تۆ خواردنەکەت بەدەستە پێچراوە کەت هەڵگرتوە و لاق شـەلیە کەیشت نەما ، ئیتر بووە قاقای پێکەنین هەموو پێکەنین کاکە حەمە وتی : کاک قادر ، قوربان دە وازمان لێبێنە ، ئیتر ، کاکە حەمە خویشێ دەستیکرد بەپێکەنین و هەردەم قسەی خۆشی بۆ ئەکردین. ئەیوتەوەبەحەیاتم سیاسەتم نەکردوە کاک قادر لەپڕ دێڕە شێعرێکی وت :

هەر داد دادیبوو حەمەی لالەمین  هاوارەبۆ تۆ ڕەب لعالەمین<br>
وەکو لاق سەقەت کەبۆی ئەلەنگی  هاواری ئەکرد ئای باقیە فەندی

دامانە قاقای پێکەنین .

دەمەو ئێوارە بوو ( کاک عارف و کاک حەمەسەعید ) برانە ژوری( کاک حەمە ڕەشێدی ئەحە شانە)کە بەرانبەرمان بوو ، زوربەی ئەوانەی کە بە تۆمەت وگومانی پێشمەرگە گیرابوون لەو ژورەدا کۆکرابوونەوە. وەک لەوەپێش باسمکرد ڕۆژانە کاک عەبدولی حاجی محەمەدی سلۆ و لەگەڵ تۆفیق عەلی دەروێش ئەمینی حەمامچی و حاجی فەرەجی سوسێ یەک لەدوای یەک بەر

ئەبوون کەهەر یەکەیان ماوەیەک لەگەڵماندا مانەوە یادەوەریەکیان بۆمان بەجێ هێشت کەجێی ڕەزامەندی وڕێزی هەمووان بوون .

کاکە حەمەی حاجی فەرەج ئەفەندی وەک لەوەپێش باسمکرد گوێزرایـەوە بـۆ ژووری عەلـی ئیبراهیم دەروێش کە ژورەکەیان لەتەنیشت ژوری سەر دالآنەکەبوو کە لە گەڵیـان ڕەئـوفی فەرەجەفەنــدی ، جەزای عەلــی کاتــب ، کەمــالی حەمەی حــاجی فەرەجە ئەفەنــدی ، لەبەندکراوەکانبوون لەوێ کۆکرابوونەوە .

هەر ئەو ڕۆژە سەربازێک خـۆی نزیکئەکـاتەوە لە ( کەمـالی حەمەی حـاج فەرەج )، واخـۆی دەرئەخات پیاوی چاکەو بەزەیی دێتەوە بەکەمالدا ئەیەوێت یارمەتی بدات ، نامەی بۆ بباتە دەرەوە بۆ ناو کەس وکاری ( کەماڵی محەمەدی حاجی فەرەجەفەندی ) ، بڕوا ئەکـات وەک لەدواییدا باسیکرد بۆمان ، کە لە نامەکدا شتی ئەوتۆی نووسیبوو ببێتە هۆی بەڵگە لە سەری و دیسان ئازاری زۆربدرێت ، سەربازەکەش نامەکەی دابووە دەست ئامر ئینزیبات ،بەوهۆیەوە لێدانی خەست وخۆڵێ کەی خواردو لێکۆڵێنەوە لە سەری دوبارەکرایەوە تۆمەتەکەی خەستتر بوو .

***



**ئەمینی عەبدە**

## بەیانەکانی ناولۆری کارگەی جگەرە

## ئەمینی عەبدە وحەمەی حەمەلاو

دوای نیوەڕۆبوو ئاسمان ساماڵ بوو هەتاوێک و ڕۆژێکی خۆشبوو ، هەوا لەڕۆژان گەرمتر بوو ، فەردە ئاردو گەنم و جۆ و گوڵە بەڕۆژەکان لەناو حەوشەکەدا نەمابوون لابرابوون .

لە پڕ حەوشەو وسەربان وبن بان پڕبوو لە سەربازو ئەفسەر بەڕێکوپێکی بەنیزام بەهەموو لایەکدا دابەشبوون بڵاوبوونەوە هەڵوێستی ئامادە باشیان وەرگرت ، لەپڕ( زەعیم سدیق) هاتە ناو حەوشەکەوە لەلایەکەوە وەستاو چەند سەربازێک بەدەوریدا وەستان ،دوایی بووە هاوارو غەڵبە غەڵب ، کۆمەڵێک سەرباز هاتنە ناو حەوشەکەوە دوکەسیان بە دەستەوەبوو ، پەلی هەریەکێکیان بەدەست چەند سەربازێکەوەبوو وەک مردویان هەڵگرتبێت وابوو ، بەهەڵگرتن و ڕاکێشان بەرەو ناوەڕاستی حەوشەکە هاتن ،کۆمەڵێک لە پشتیانەوە ئەڕۆشتن لێیانئەدان ، لە ناوە ڕاستی حەوشەکەدا فرێیاندان ، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کەوتنە لێدانیان هەردوکیان لە حەوشەکەدا کەوتن بێبەزەییانە بەڵەقە لەسەر سنگ و ورگیانبوون یەکەم جار لنگە فرتێیان بوو ، دوایی نوزەیان لێبڕا، یەک تەختە لە سەر زەوی کەوتن وەک مردو دەست و قاچ بڵاو بێجوڵە مانەوە.

سەگ وگورگەکانی دورکەوتنەوەلێیان، لەولاوە زەعیم سدیق ڕاوەستابوو ، سەیرێئەکرد ، چووە نزیکیان هەتاتوانی بەلەقەو دارەکەی دەستی ، بە لێدان وشەق تێهەڵدانیانەوە خەریکبوو .

ئێمەیش لە پەنایەکی پەنجەرەکەوە بەدزیەوە سەیرمان ئەکرد ، یەکێک لە برادەران وتی من یەکێکیان ئەناسم کە ( ئەمینی عەبدەی شۆفێری کارگەی جگەرەیە) ، ئەوی کەیانمان ناسی ناوی (حەمەی حەمە لاوبوو) خەڵکی خەراجیانە یارمەتی دەری ئەمینی عەبدەیە کە لۆری کارگەی جگەرەیان، بەدەستەوەیە زاوای مەحمودی مەلاعیزەتە.

زەعیم سدیق کە لەلێدان هیلاکبوو ، بەجێی هیشتن چووە ژورەکەی خۆی ، هەردوکیان لە حەوشەکەدا وەک مردو بێهۆش کەوتبوون، کەس لەدەوریان نەما، دوای ماوەیەک جولەیان تێکەوتەوە لەوە ئەچوو کەبێنەوە هۆشخۆ، لە وکاتەدا (شێخ مەحمود بەرزنجی ) کە بەرێوەبەری کارگەی جگەرەی سلێمانی بوو، هاتە حەوشەکەوە ، ئامر ئینزیباتی لەگەڵ بوو هەردوکیانی پێشانداو ، شێخ مەحمود هاتەنزیکیان شەقێکیدا لە لاتەنگەی ئەمینی عەبدەنەڕاندی وتی : [ ئەمینی عەبدەی،....باب من ناردمیت بۆ بەغداد لۆریە جگەرە بەریت، لەوسەر پێویستی مەعمەلەکەم بۆ بهێنیتەوە، کەچی لەوسەرەوە لۆریەکەت پرکرد لە بەیان) چووە لای حەمەی حەمەلاو تێروپڕ لێداو جنێوی پێدا وتی ( تۆیش بوویتە شەریکی ،،،بەپیاوم زانین هەردوکتان بوونە هۆی ئەوەی مەعمەلەکەمان دابخەن ،،، ئەو هەموو فەقیرو هەژارە ماڵوێران ونانبڕاو وبێ ئیشبکەن ]. ئەوڕۆژە هەموو بەم بەزم و وڕوداوە تازەوە خەریکبوون ، ئاگایان لە ئێمە نەمابوو .هەموو لە پەنجەرەکەوە سەیرمانئەکرد هەرچی رویدا لە بەرچاومانبوو .
قادربرسی بەکشمیشی وت : کشمیش تۆ لەبیرچوویتەوە نێچیری لەتۆ باشتریان دۆزیوەتەوە و دەستکەوتوە ، کاک لوتفی ویستی بەرز بێتەوە نەی توانی ودەستیکرد بە پێکەنین ،پێکەنینەکەی بەجۆرێکی سەیربوو، لەگەڵیدا بەرز ئەبووەوە ملی درێژئەکرد ، هەردوچاوی بەجارێ ئەنوقاند و دیارنەئەمان ، پێکەنینەکەی ئاسایی نەبوو زۆر سەیربوو ، دەم و چاوی سور ئەبووەوە و دەنگی پێکەنینەکەی لەقاپلەمەی ئاوی کوڵاو ئەچوو کە قوڵپ و بڵقی ئەدا و هەڵئەچوو ،،، بەتایبەت لە مەنجەڵی یاپراخ ئەچوو کە هێشتا ئاوی تیامابوو، کە سەرەکەی لائەبرا قوڵتەقوڵتی بوو ، ئێمەیش زۆر حەزمان ئەکرد هەردەم پێبکەنێت و قسەی خۆشم ببکات . لەگەرمەی پێکەنین و قسەی خۆشدابووین ، لەپڕ دەرگاکە کرایەوە هاتن بەشوێن کشمیشدا و بەچوار پەڵ گرتیان و بردیان ،بۆژوری لێکۆڵینەوە بۆتەحقیق، ئێمە گوێمان لە هەموو پرسیارو وەڵامەکانبوو لەگەڵ لێدان و ئازاردانی ، بەڕاستی پاڵەوانبوو نمونەی نەبەردی و نەبەزین و بەرگەگرتن و خۆڕاگریبوو ، کەشەو درەنگ بوو بەهەڵگیراوی هێنایانەوە بۆ ناو ژورەکە پەکی کەوتبوو ، ئاگای لەخۆی نەبوو تاچەند ڕۆژێکیش نەیتوانی هەڵسێتە سەرپێ.
ئەو ئیوارەیە زەعیم سدیق هاتە وە بۆ ئینزیباتخانە هاتە وێزەی ئەمینی عەبدەو حەمەی حەمەلاو، سەربازەکان پەلاماری هەردو دەستی هەریەکێکیاندا بەڕاکێشان بردنیانن بۆ دەرەوەی ئینزیباتخانە، لەنیوە شەودا بەڕاکێشان نیوەمردو بەبوراوەیی هێنانەوە ، بەبوراوەیی حەمەی حەمەلاو یان هێنا بۆ ژوری ئێمە و ئەمینی عەبدەیان برد بۆ ژوری عەلی ئیبراهیم دەروێش .
کەزانیمان هەردوکیان لەسەر بەیانەکانی ناو لۆریەکەی کارگەی جگەرەدا گیراون ، لەوانەیە لە ئەنجامی ئیخباریدا بووبێت لە بەغداد ، هەر مەترسی ئەوەمان هەبوو کەسانی کە تێوەبگلێن ،

ئەوشەوە نامەیەکمان نووسی ئامادەمانکرد چاوەڕووان بووین ، شەو خەولە چاومان نەکەوت تابەیانی بەڵکو بەیانی خێرا کاک ئەحمەد عارف بێت خێرا نامەکەمان بگەیەنێت کەزانیاری زۆری تیابوو.

تاریک وروونی بەیانی بوو خەبەریان کردینەوە وەک هەموو بەیانیەکان کە چوارمشقی دابنیشێن چاوەڕوانی ڕۆژانی تری ئاسایی بین ، بزانین چی ڕوئەدات هەواڵی تازەی ئەمڕۆ چێئەبێت .

ئەوبەیانیە پێش دەرچوونی بۆ ناو شار بەدستی عەبد ژەمێک لێدانمان خوارد ، ئەو ڕۆژە عەبد پرسی کوا کاکە حەمە وتمان لێرە نەماوە نەقڵبووە ، خێراڕایکرد بزانێت لە چی ژورێکە تاتۆزێک ئازاری بدات. هەر بەیانی زووبوو بەتایبەت (ئەمنەکان ) هاتن بۆ کاک جەوهەر سدیق شاوەیس ، بەپاڵ و لێدان بردیان بۆدەرووەی ئینزیباتخانە بەمەبەست لێدان و ئازاردانی.شـەو درەنگ هێنایانەوە بەبێهۆشی لە پەڵ و پۆکەوتبوو.

وەک لەوە پێش باسکرا ئەمنەکان زۆر ڕقیان لە شیوعیەکان بوو ئەیانوت ئەمانە دژی دینن خوا ناناسن . سەربازەکان رقیان لە ئێمەبوو ئەیان وت ئەمانە (ئینفیسالین) بەنیازی جیابوونەوەن لەعێراق.شەو دەرنگ بوو کەحەمەی حەمەلاویان هێنا بۆ ژورەکەمـان دیمـان چـی لێکرابـوو دەست وقاچی لەکـار کەوتبـوو لەشـی لە زۆر شـووێندا برینـداربوو سەرسـنگی لە زۆر لاوە بەجگەرە سوتابوو . دڵمان لە مەراقی ئەوەدابوو کەی کاک عـارف دێـت تـا زوو نامەکامـان بگەینێـــت بـــۆ لیـــژنەی نـــاوچەی (پـــارتی دیمـــوکراتی کوردســـتان . لەو خەیاڵەدابووین کاک ئەحمەد عارف لەگەڵ کرێکارەکان گەسک بەدەستەوە پەیدابوون ، کاک ئەحمەد خۆیکرد بە ژورەکەماندا وتمان ئەمڕۆ زۆر چاوەڕوان بووین هەواڵێ گرنگمان پێیە خێرا بیگەیەیەنیت ، نامەکەمان خستە ناو پێڵاوەکانیەوە و هەڵێ کێشاو خێـرا چـووە دەروە بەپەلە ئینزیباتخانەی بە جێهێشت.

سەر لە بەیانی بوو حەمە ڕەئوفمـان دی جلـی کـوردی لەبەرکردبـوو، ویـستی خـۆی پێـوەی بنوێنێت، بەناو حەوشەکەدا ئەسوڕایەوە بەنیاز بوو بەرەو ژورەکەی ئێمە بێت بۆلێدانمان، لەپڕ سەربازێک بانگیکرد وتی وەرە، ئامر ئینزیبات ئیشی پێتە، کـەویـستی بچێـت بـۆلای ئـامر ئینزیبات، ( ڕەشید المهداوی)بەرەوڕوی هات، لەحەمە ڕەئوف تورەبوو زللـەیـەکـی تێـسرەوان وتی: ( گەواد های شی لابس) یـانی گەواد ئەوچیـت لەبەرکـردوە، دەسـتیکرد بەجنێـودانی و زللەیەکی کەی لێداو ، پەلاماری دا بەلێدانی و تێهەڵدانی ، جنێووی زۆری پێدا و بەوانەی کە ئەم جلە کوردیەش لەبەرئەکەن ، ڕەوفە سیخن بە سەر شۆڕیەوە لە بەردەمیدا ڕایکرد تا بڕوا زوو بە زوو جلەکانی بگۆڕێت بەوشێوەیە خێرا جلەکانیان پێگۆڕی .

# ئەمینی عەبدە وحەمەی حەمەلاو چۆن گیران ..؟

حەمەی حەمەلاو وئەمینــی عەبــدە بە هەردوکیــان لــۆری کــارگەی جــگەرەی ســلێمانیان بەدەستەوەبوو ، ئەمینی عەبدە شۆفێربوو کاکە حەمەی حەمەلاو یارمەتی دەری بوو.

حەمەی حەمەلاو برای ئەحمەدی حەمە لاو بوو ماڵێـان لەلای ئاشـەکۆنەکەی مەسـیحێەکانبوو بەرامبەر دواناوەندی کچان نزیک گەڕەکی مەسیحیەکان، کاتی خۆی براکەی پۆلیس بـوو لەم دوایـیەدا خـانووی ئەکـڕێ و ئەفرۆشـت، خـەڵکـی خـەراجیـان بـوون حەمەی حەمە لاو زاوای خوالێخەشبوو (مەحمودی مەلاعیزەت)بوو، پیاوێکی کورد پەروەرو دڵسۆزبوو.

ئەمینی عەبدە کوڕێ (عەبدەی ئۆتۆمبیل چێ) بوو کەپیاوێکی ناودار و ناسـراوی شـارەکەبوو لاوێکی لەسەر خۆو کوردپەروەر بوو ، هەردوکیان ئەندام بوون لەڕیزەکانی ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستاندا لە کارگەی جگەرەی سلێمانیەوە هەردوکیان جگەرەیان بەلۆری ئەبرد بۆ بەغداد ،لە وسەرەوە هەرچی پێویستی کارگە ودروستکردنی جگەرە هەبوو کە وەریانئەگرت لەوی ئەیانهێنایەوە بۆکارگەی جگەرەی سلێمانی .

ئەم کارەیان بە فرسەت زانرا لە لایەن ڕێکخستنەکانی پارتیەوە کە هەرچی بەیان وبڵاوکـراوە وکاری نهێنی و پێویستی حیزب هەیەکە لە چاپخانەی خەبات دەرئەچێت ، بەم لـۆریە و لـە ناوشتەکاندا ئەهێنرانەوە بۆسلێمانی و ئەوکارانە هەمووی بەو شـێوەیـە جێبەجـێ ئەکـران ، هەرچـی کـارو پێویـستی حیـزب هەبـوو هەر بەم لـۆریە ئەبـران بـۆ بەغـداد، زۆر جـار بە بازگەکاندا (سەیتەرەکاندا) بێلێپرسینەوە و پشکنین تێپەڕئەبوون. (کە لە شووێنی ئەمیندا لەناو لۆریـەکـەدا شـاردبوویانەوە بەنهێنــی بەکاریـان ئەهێنـاو لـەسـڵیمانیەوە بۆبـەغـداد ، لـە بەغدادەوەبۆسلێمانی ). هەرچی کاروباری بڵاوکردنەوە وبەیان وئامۆژگاری و نووسراوی نهێنی حێزب هەبوو بەرەو ڕووی (دوکتۆر سەروەری حەمەی دەروێش کەریم ) کرابووەوە کە وەریئەگرت ئەیدا بە ئەمینی عەبدەو حەمەی حەمەلاو بەلۆریەکە بیگەیەنن بۆسلێمانی.

.سەروەر خۆی قوتابی کولێجی پزیشکی بوو وسەرۆکی یەکێتـی قوتانیـانی کوردسـتان بـوو لەبەغداد لە (ئوتێل شەهرەزاد) لەچوار ریانی ڕەسافی کەهی خۆیانبوو ئەم کارانە ئەنجامئەدرا لە بەغداد باوکی دەوڵەمەندبوو (ئوتێڵ چیبوو)هۆتێلی زۆری هەبوو لەبەغدادو کەرکوک و شارەکان .

ئەو ڕۆژەی کەتیاگیران حەمەی حەمە لاو لەگەڵ ئەمینی عەبدە دێن بۆ ئوتێڵ شەهرەزاد لەوێ چاوەڕوانی (دوکتۆر سەروەر ئەکەن لەگەڵ وەستاعومەری برای وەستابەکر ، کە ئاندامێ پارتیبوو ئەوکارانەوە و ئەنجامدانی بەو سپێررابوو کەئەیزانی چاپخانەی خەبـات لـەکوێیـە) کە بەیـانی قوتابیانی کوردستان بهێنن بۆیان بۆ ئەوەی هەر ئەو ڕۆژە بەلۆریەکە بیگەیەننە سلێمانی.

لەوکاتەدا کە ئەمان خەریکی کاری خۆیان ئەبن نابینن و هەستناکەن کەسێک لەولاوە چاوی لەسەریانە وهەستی بەشتێک کارێک وجوڵانەوەیەکی نا ئاسایی کردوەکە کە لەژێر سەریاندایە بەتەمان ئەنجامیبدەن ، زیاتر گومان پەیدائەکات کە ئەبینێت دین و دەچن و قسەئەکەن ودوکتۆر سەروەر بۆلایان هاتوە ، کاتێک لە قسەو باس ئەبنەوە و ئەچنەدەرەوە بۆ وەرگرتنی بەیانەکان ، بەدزیەوە دوایان ئەکەوێت ، کە ئەبینێت لۆریان پێیە ، دین و ئەچن ، چاوی لە سەریان ئەبێت ، هەر خێرا فریا ئەکەوێت دەبارەی ئەمکارە گومان لێکراوە ڕاپۆرتێک ئەنووسێت و خەبەریان لێئەدات، و ئاگاداری لایەنی پەیوەندار ئەکاتەوە کە ئەم دو نەفەرە لۆری میریان پێیەو بەرو سلێمانی ئەچن ، گومانی لێکردون کە، شتێکیان لە ژێر سەردابێت ، لایەنی پەیوەندی دار لەئەمن بازگەکان ئاگادار ئەکەنەوە، دواجار لە بازگەی سلێمانی (سەیتەرەی سلێمانی) بۆیان دائەنیشن لەوێ بۆیان لەبۆسەدا ئەبن کە گەیشتبوونە بازگەی سلێمانی لۆریەکە گەڕابوون بەیانەکانیان دۆزیبووەوە گرتبوویانن . هێنران بۆ ئینزیباتخانە .

زەعیم سدیق گرتنی بەیانەکانی بە سەرکەوتنێکی گەورە دایەقەڵەم بۆ خۆی. ڕۆژانە ئەمینی عەبدەو حەمەی حەمە لاوی بەسەرئەکردە ، کردبوویە کاری ڕۆژانەی ، زوو زوو بە سەری ئەکردنەوە، لێدان و ئازاردانیان دوبارە ئەکرایەوە ، هەموو جارێک داوای ئەوەیان لێئەکرا لەکوێ وەرتان گرتووە لە کێتان وەرگرتوە؟ کێ لە بەغداد بەیانەکەی پێتان داون؟ کاتێک بەیانەکانیان گرتبوو لەناو زەرفێکی گەورەدابوو پێچراوەبوو لە سەری نووسرابوو بەهۆی بەڕێز( ئەبووبەکر حەمە سەعیدی ، پێڵاو درو) بگات بەدەستی بەڕێز ( فوئادی مەلا مەحمود )، (بەڕێز ئەبووبەکر حەمە سەعید پێڵاو دروبوو لە ڕاستە بازاڕەکەی خوار حەوزەوشکەکەی ناوبازاڕ بەتەنیشتی ڕۆژئاوای بازاڕێ دوڵارەکەپشتی دوکانەکەی بەپشتی بازاڕی دۆلارەکەوەبوو ، پیاوێکی کوردپەروەر و ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانبوو . بەڕێز فوئادی مەلا مەحمود سەروکی یەکێتی قوتانیانی کوردستان بوو و ئەندامێکی پێشکەوتوی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو ).

فریا کەوتبوون هاواڵ و شوێنی کاک ئەبووبەکر یان زانیبوو لە دوکان گرتبوویان دیمان بەلێدان چنگ لەسەرشان ئەویشیان کرد بەئینزیباتخانەدا ودەستیانکرد بەلێدان و ئازارو ئەشکەنجەدانی و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کرد زۆر ئازاریاندا ، ئەویش بەنا وەرامیدابوونەوە ، لەدوای ئازارو ئەشکەنجەدانی زۆرو دوبارەکردنەوەی چەند جارێک وچەند شەوێک لەدەرەوەمایەوە ، هێنایانە ژورەکەی حەمەڕەشید ئەحەشانە ، هیچ زانیاریەکی نەدابوو .

گەڕابوون بەدوای( فوئاد مەلامەحمود) دا دوایی سۆراخیان نەکردبوو دەستیان نە کەوتبوو باوکیان گرتبوو و هێنایان بۆ ئینزیباتخانە دیمان کەپیاوێکی هەیکەلی ڕێک و پێک بوو، عەبایەکی بەشانەوەبوو لێیان نەدا ، کە بەڕێز(مەلا مەحمودیان) هێنابوو بۆلای کاک ئەبووبەکری

پێڵاودرو ، لێیان پرسی بوو ئایا ئەم پیاوە ئەناسیت؟ مەلامەحمود جوابی دابووەوە :( نەخێر من نایناسم قەت نەمدیوە وەک باوکێک ئاگام لەم شتانە نیە، هیچ پەیوەندیەکی بەمنەوە نیە، وتبووی من بە حەیاتم ئەم پیاوەم نەدیوە و نازانم ناویشی چیە من ئاگام لەم باسەنیە) لەپێشدا داوای کوڕەکەیان کردبوو وتبووی من نازانم لەکوێیە! دوای ماوەیەک دیمان بەرەڵلایـانکرد لە ئینزیباتخانە چووەدەرەوە .

[ دەربارەی کۆچکردو فوئادی مەلا مەحمود لە ساڵی ١٩٦٤دا من لە گەڵیدا بووم لە ( ڕێکخراوی باڵای یەکێتیە دیموکراتیەکانی کوردستان) کەئەم بەڕێزانە ئەندام بـوون ونوێنـەری ڕێکخـراوە دیموکراتیەکان بوون کاک فوئاد مەلا مەحمود نوێنەری یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوو.

(بەندە) محەمەدباقی سەعیـد نـوێنەری یەکێتـی مامۆسـتایانی کوردسـتان بـووم . ئەنجـوم عەبدوڵلە زوهدی نوێنەری ئافرەتانی کوردستان بوو . نەوشیروان مستەفا نوێنەری لاوانی دیموکراتی کوردستان بوو .

بەندە محەمەد باقی سەعید کەنوێنەری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان بووم یادەوەری ئەولاوە جوانەمەرگە هەردەم لەبیرمدایە ونمونەی لاوی کورد پەروەرو دڵسۆزبوو خۆنەویست ،وخەبات کەربوو زیرەک و وریابوو]

.

## حەسەنی شێخ سەعیدی سیخوڕ

کاتێک (دوکتۆر سەروەر حەمەی دەروێش کەریم ) دێتەناو ئوتێلەکەی (شەهرەزاد )لەگەڵ وەستا عومەر ، بۆ لای ئەمینی عەبدەو حەمەی حەمەلاو ،تابەیەکەوە بچنە دەرەوە لە شوێنی دیاریکراودا بەیانەکەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان پێیان بدەن، تا ئەوڕۆژە بە لۆریەکە بیبەن بۆ سلێمانی ، نابینن کە کەسیک بەدزیەوە لەولاوە خوی متداوە، بەو گومانەوە بەدوایاندا هاتوە، کە ئەمانە کارێکیان بەدەستەوەیە ئەیانەوێت ئەنجامیبدەن لێیان کەوتبووە (بۆسەوە چاودێری ئەکردن)،کە دوایان کەوتبوو، هەندێک زانیاری هەڵکراندبوو.بۆچوونی وابووە کە میری ئاگاداربکاتەوە لە سەر ئەو دووکەسە خەبەری دابوو کەلە لۆریەکی میریدا بەژمارە،،، بەرەو سلێمانی ئەڕۆن .

لەگەڵ ئەمانیشدا وادەرکەوت ناوی دوکتۆر سەروەری دابوو لەدەمەوە ڕاپۆرتی لەسەر نووسیبوو، بەڵکو لەوڕێگەیەوە ئافەرینێک یان مشتێ پارە وەربگرێت لەپاداشتی ئەم کارەی. دوایی دەرکەوت ئەوکەسە (حەسەنی شێخ سەعید ) بووە لەدواییدا کاک ئەمین عەبدەو حەمەی حەمەلاو لەگەڵ دوکتۆر سەروەر گێڕایانەوە وتیان بێگومان ئەوبوو ، لەبەرئەوەی ئەوکاتە لە ئوتێلەکەدا دانیشتبوو بەلام ئێمە ئەوەندە گوێمان پێنەدا .

{من و هاوڕێکانمان لەدارالمعلمین لەبەغداد حەسەنی شێخ سەعیدمان باش ئەناسی هەر لە ساڵەکانی ١٩٥٢ بەدواوە کە لەبەغداد (لەدارالموعەلمین ) ئەمان خوێند ئەو ئەمن بوو ئەوساپێیان ئەوت ( تەحقیقاتی جینائی ) وەک زەردەواڵە لەگەڕاندابوو بۆ ئەوەی بەیەکێکەوە بدات ملی کەسێک بشکێنی و توشی داوێکی بکات ، کە ئێمە لە شووێنێکدا بماندیایە خومان لێئەشاردەوە لەبەر ئەوەی ئەمانزانی توشێ بەڵایەکمان ئەکات ناومان ئەدا بە ئەمن ، بەبەڵگەو تاوانی ئەوەی کەدژی مەلیک وەستاوین یان لە موزاهەرەدا هاوبەشبووین ، سەیرتر ئەوەبوو ئەگەرلەپڕ لە شوێنێکدا ئێمەی ببینایە داوای پارەی ئەکرد ، ئای بۆ ئەوەی پارەی پێنەبووایە .یان هەندێکی پێنەدایە .

لەوساڵەدا ڕاپەڕێنی ١٩٥٢پەنجاو دو بەرپابوو ڕۆژانە دژی رژێمی پاشایەتی خەڵکی ئەهاتنە سەر شەقامەکان بۆ خۆپیشاندان ، کاک حەسەن هەردەم لەو ناوەدابوو ڕاپۆرتی ئەنووسی ، خەڵکی زۆری دابووبەگرتن و زۆرترین ڕاپۆرتەکانی لە سەر قوتابیانی کورد بوو کە تۆمارکرابوو لە شوێنی تایبەتی ئەمندا پارێزرابوو تادوای شۆڕشی ١٤ تەموزیش ناوەکان هەر مابوو ، لە کاتی پێویستدا ناوەکەیان دەرئەهێنا ، ئەوکەسە ئەکەوتە ژێر باری لێپرسینەوە بەرپرسیارێتی وهەرکارێکی بکەوتایە ئەمن، بەناوی ئەوەی شیوعیە تەگەرەیان ئەخستەبەر بۆیان ئەنجامنەئەدا.

حەسەنی شێخ سەعیدی (سێخوڕ ؛جاسوسی )زەمانی پاشایەتی کۆنبوو تا شۆڕشی ١٤ تەموز وەک باسیانئەکرد مفەوەزی ئەمنبوو ، سیخورو پیاو خراپبوو لە خراپەکاریدا وێنەی نەبوو میکرۆبێک بوو خوابەتایبەت دروستیکردبوو ، زیان بەخشبوو،هەردەم لەکاردابوو بۆ ئازاردانی خەڵکی ، بەدرۆو خوتوخۆڕایی ڕۆژانە خەریکی ڕاپۆرتدانبوو لەسەر خەڵکی ، هەرکۆمەڵە کوردێکی ببینیایە لە شوێنێکدا داوای پارەی لێئەکردن ( بەناوی یارمەتی )ناوی هەرکەسێکی بزانیایە بەیانی ناوی دابوو ( بەئەمن ) شتێکی بۆ ڕێکخست بوو، کوردەکان لە بەغداد لەدورەوە بیاندیایە خۆیان ئەشاردەوە لێی .

لە ساڵی ١٩٥٢دا ڕاپۆرتێکی دابوو لە سەر برادەرێکمان ، کە گوایە لە سینەمای غازی کۆن هوتافی داوە دژی مەلیک ، ئەو ڕاپۆرتە لەئەمن مابوو تا زەمانی شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ لەزەمانی جەمهوریەتدا ، ئەو برادەرە[کەمالی میرزا غەفوری برادەرم بوو] ویستی لەگەڵ وەفد بچێت بۆ دەرەوەی عیراق مەنعیانکرد ، کەگوایە لەزەمانی مەلیک دا هوتافی داوە دژی مەلیک .

حەسەنی شێخ سەعید ناو بانگێکی خراپی هەبوو لە بەغداد، لەدوای شۆڕشی ١٤ تەموز هاتەوە بۆ سلێمانی بۆماوەیەکی کەم مایەوە، لە سەرجادەکان ئەبینرا ،وەک ئەوەی خۆی ئەیویست بەتۆمەتی خراپ ملی خەڵکی بشکێنێت بۆی نەکرابوو بۆی نەچووەسەر گەڕایەوە بۆ بەغداد .

دوای شۆڕشی ١١ ئەیلولی مەزن ساڵێ ١٩٦١ وادیاربوو بازاڕی گەرمبووەوە، دەستیکردەوە بەخراپەکاری ، هەموو مەبەست و بیروکارێکی لەژیانیدا ئازاردان وزیانگەیاندن بوو بەکوردو خەڵکی ، وەک هاتەگوێ و باسئەکرا ئەم پیاوە گیانی لەدەستدابوو نەزانرا بەچێ هۆیەک بێت ، لای خەڵکی ڕووننەبوو .

بەڵام ئەوەندە پیاوێکی بەنرخنەبوو باسبکرێت ، حەسەنی شێخ سەعید پیاوێکی کورتە بالای ڕێوەڵەی چەناگە بارێک ودەم وچاو چرچ بوو بەڕواڵەت وائەهاتە بەرچاو کە پیاوێکی بێوەی هیمن لەسەرخۆ و دڵپاک و پیاوچاک بێت . ماڵی باوکی حەسەنی شێخ سەعید لەکۆڵانی تەنیشت ماڵێ حاجی ساڵحی وەستابستەبوو خوار قاوەخانەی سەرچێمەن بەرامبەر ماڵی حاجی تۆفیقی تازە دەوڵەمەند کەئێستانزیک فوڵکەی نالیە ،لەخێزانێکی لەخواترس وبێوەیبوو باوکی عەبای ئەدا بەشانیداو برایەکی هەبوو مودەریس بوو ، جێگەی ڕێزی خەڵکی بوون} .

***

## دوکتۆر سەروەر محەمەدکەریم (سەروەری حەمەی دەروێش کەریم)



هێشتا دەمەو ئێوارەبوو سەر بازەکان وروژان هاواریان بوو سەرکردەیەکی موتەمڕدیان هێناوە ، دەوری لاوێکیان دا کەبە دەست چەند سەربازێکەوەبوو چوار دەستە هەڵیان گرتبوو لەوەئەچوو کە بورابێتەوە وابوو، لەحەوشەکەدا فڕێیاندا ماوەیەک نەچوون بەلایدا دوای ماوەیەک هاتەوە هۆشخۆی هەستا بەپێوە ڕاوەستا، بەرامبەرمان پاڵیدابوو بەدیوارەکەوە ، دوای ماوەیەک هەرچی سەربازێک لەو ناوەدابوو لە دەوری گردبوونەوە دیسان دەستیانکردەوە بەلێدانی ، لەپڕ وازیان لێ هێنا ودورکەوتنەوە لێی ، دوای تۆزێک ویستی هەڵسێتە سەر پێ ، هەوڵیدا هەڵسێت نەیتوانی .دیمان لاوێکی باڵاکورتی جوانی قژ درێژبوو کەبەملاو ئەولای سەریدا هاتبووە خوارێ دەستێک چاکەت و پانتۆڵی ڕێک وپێکێ لە بەردابوو بەڵام بەقوڕوخۆڵی ناو حەوشەکە سواغ درابوو ژاکابوو.

(کاک ئەنوەر دارتاش وتی من ئەوگەنجە ئەناسم ئەوە ( سەروەری حەمەی دەروێش کەریمی ئوتێلچیە کەلە سلێمانی و کەرکوک و بەغداد ئوتێلیان هەیە و خۆیان لە کەرکوک دائەنیشن ، قوتابی کۆلێچی پزیشکیە لە زانکۆی بەغداد، وتی خزمێکێ دایکم کەناوی عەبدوڵڵەیە ئیستا لەگەڵیان ئیشئەکات، ئوتێلی بەغداد ئەبات بەڕێوە بۆیان).

بەردەوام سەربازەکان دەورەیان دابوو ئامادە و چاوەڕوان بۆلێدانی هاواریانئەکرد دوکتۆرێکمان گرتوە لە بەغدادەوە هێناومانە تاوان بارێک وگەوەرەی موتەمەڕدینە ، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەنەکراو دەستیانکرد بەلێدانی بەهەر شتێک بەدەستیانەوە هەبوو لێیانئەداو کاروانەیان پێکرد لەناوقوڕێ حەوشەکەدا تلانیانەوە ،چوار پەلی شل بووبوو هۆشی نەمابوو ،لەوە ئەچووبورابێتەوە لەحەوشەکەدا کەوتبوو نوزەی لێبڕابوو ، بەلەقەو شەق بەسەریەوە بەردەوامبوون جلەکانیان لەبەریدادڕیبوو ، نم نم بارانیش ئەباری دنیا زۆرساردبوو ، ماوەیەک لێی دورکەوتنەوە لەبەر بارانەکە مایەوە هەموو گیانی یەک پارچە ئاوبوو باراناو بەسەرو لەشیا چۆڕیی ئەکرد ، وەک باڵندەیەکی لەئاو هەڵکێشراوی لێهاتبوو .

دنیابەرەو تاریکی ئەچوو ، هاتنەوە وێزەی هەڵیانگرت وبردیان بۆ دەروەی ئینزیباتخانە ، نەمانزانی بۆکوێ بردیان . لەشەوێکی درەنگدا هێنایانەوە کردیان بەژوری لێکۆڵێنەوەدا ، بەڵام بێهۆشبوو بە چواردەستە هەڵیانگرتبوو، دوای ماوەیەک دیمان بەناو ئاو و قوڕدا بەقاچ ڕایانئەکێشا بەرەوحەوشەکە ، لەناوەڕاستی حەوشەکەدا فرێیاندا .نزیک سەری ساڵی نوێبوو ، دنیا زۆر ساردبوو باران ئەباری هەتابەیانی. لە ناوحەوشەکەدا هێشتیانەوە لە بەر سەرماو باران ، گوێمان لەڕەشید المهداوییبوو ئامر ئینزیبات ، وتی با لە بەرباران وسەرما تابەیانی بمێنێتەوە ،کە دوکتۆرە وباشترین سزایەبووی !!

***

## ڕەشێد المهداوی

پێاوێکی زاڵـمی جـوێن فروشـێ ڕەوشـتنزمی بـێ شەخـسیەتبوو ، خۆشـێ لەوەدا ئەبینـیەوە کەئازاری خەڵکیبدات لەزەتی لەوەدائەبینی کەجنێوبدات و خۆی بە دەستی خۆی لە خەڵکی بدات ، هەردەم دارێکی درێژی بەدەسـتەوە بـوو، زۆر ڕقـی لـەکوردبـوو هـەردەم جنێـوی بـە سەرکردەو پیرۆزیەکانی کورد ئەدا، وا ئەهاتە بەرچاو وەک لەدڵ ودەرونیدا نەخۆشـبێت یـان بەوجۆرە پەروەردە کرابێت لەسەر تـاوان و پیاوکوشـتن وڕاهێنرابێـت ، لـەشـیوەی ڕەفتـارو کرداریدا عەرەبە جاهیلەکانی باو باپیری، ئەهینایەوە یاد کەهەرگیز گیان و بیری جەهالـەتـی عەرەبی کۆن لەمێشکیاندا دەرناچێت ، تائەمڕۆژ هەربوو بیرە دوا کەوتوە ڕەفتار ئـەکـەن ، کەبەدرێژایی مێژوو چیان بەکورد نەکرد.

## چاپخانەی خەبات لە بەغداد

هەرئەوشەوە ڕاپۆرتێکمان ئامادەکرد کە پەلەمانبوو فریای بەغداد بکەون شوێنی ( چاپخانەی خەبات) بگوێزنەوە بۆلایەکی کە کەدەمێکبوو بە نهێنی ولە شوێنی تایبەتدا بەکاریان ئەهێنـا بۆکاروبـاری حیـزب، بـۆ دەسـت پێـشکەری نووسـیمان وریـابن نەک ئـەمـن و ئیـستیخبارات شوێنەکەی بدۆزنەوە و بگەنە سەری دەستی بەسەردابگرن و هـەر کەسێک لەوێ ئیـشئەکات بیگرن ، خوشبەختانە ئەو بەیانیە کاک ئەحمەدعارف زووهات ونامە کەمان بەڕێکردو پێمان وت خێرابیگەیەنە و پەلەمانە ، ئەویش خێرا گەیاندبووی .

ئەم بەیانیە کاک سەروەریان هێنابۆ ژورەکەمان دیمان هەمووگیانی ئاو بوو جلەکانی وسەری ئاوی بارانیان پێائەهاتەخواری هەموو گیانی ئەلەرزی و چۆقە چـۆقی دانیبـوو زۆرهیلاکبـوو سەرما کەسیرەی خستبوو هۆشی پیاهێنابووەوە ، بەڵام پەکیکەوتبوو بەحاڵ قسەی بۆ ئەکرا ، جلەکانیمان گۆڕی هەرچێمان لە بەردەستدابوو کردمان بەبەریدا ، وشکمانکردەوە بەوبەتانیـە شڕانە دامان پۆشی، هەستمانکرد بەحآل هەناسەیئەدا تەنگە نەفەسبوو توشـی کـۆکەیەکی خراپبوو کەئەکۆکی لەگەڵێدا خەریکبوو ببورێتەوە لەهۆشخۆی بچێت ، دەم و چاوی شین ومۆر ئەبووە وە، وەک یەکێک کۆکە ڕەشەیبیت وابوو کۆکەی وامان نەدیبوو لە ژیاندا ، کە ئەکۆکی هەرچی لە ناو سکیدابوو هەڵـێ ئەهێنـایەوە ئەڕشـایەوە کە هەمـووی زەرداوی ناوسـکی بـوو لەگەڵیداشــێنئەبووەوە، چەنــد ڕۆژێکبــوو خــواردنی نەخواردبــوو، وەک دەرکەوت توشـــی سیهەڵئاوسان ( ذات الرئە) بوو، کە ئەنجامێکی خراپی هەبوو لەسەر لەشی بەگشتی ،دوایـی کاریگەری خراپی هەبوو لەسەری ،بەدرێژایی ژیانی، کاری کردەسەر سیەکانی و لەشی بەگشتی

بەدرێژایی ژیانی پێوەیتلایەوە هەر بەوهۆیەوە دوای ماوەیەک بەجوانە مەرگی سەرینایەوە وکۆچی دواییکرد.
بەیانیەکی نوێهات بەوسەرماو سۆڵەوە هەموو هەڵ ئەلەرزین و هەڵتروشکابووین چاوەڕوونی ڕۆژێکی نوی ڕوداوی نوێ بووین ( کآکە حەمە ڕەئوف و عەبدی درندە ) پەیدابوون دەوری ئاسایی خویاندیەوە ، هەریەکەیان هەندێک لێدانیان لەخورێنی دەرخوارد داین ، وسەرو پۆتەڵاکی کاک سەرورەیان تۆزێک کوتایەوە کەمیوانی تازەبوو.
دوکتۆر سەروەر تۆزێک پشوویدابوو بەیانی دوایی بەئاگابوو دی کاک ئەحمەد هاتەژورەوە ، نامەی ڕۆژانەی وەرگرت وچووە دەرەوە ، هەستیکرد کەئێمە نامەمان نووسیوە بەودا ناردمان بۆدەرەوە ، پرسی کە ئێوە نامە ئەنێرنەدەرەوە تکایە یارمەتیم بدەن منیش نامەیەک ئەنووسم هەواڵێ خۆم بۆماڵەوە ئەنێرم ، بەیانی کەهات بابۆم ببات بۆماڵی خزمێکم کە ئەدرەسی شوێنەکەلەسەری ئەنووسم ، بۆماندەرکەوت مەبەستی دەزگیرانەکەی (دەستگیرانەکەی ) بوو ئێمەش فرسەتماندا، دوکتۆر ئەو ڕۆژە هەر بەنامە نووسینەوە خەریکبوو ، یەکدو لاپەڕەی ڕەشکردەوە، کشمیش هەڵیدایە وتی: دوکتۆر ئەوەنامەیە یان ( شانامەیە ) تۆنووسیوتە، زانیمان کە بەتایبەتی بۆ دەزگیرانەکەی نووسیوە ، یەکێکیان وتی ، ڕاستە دڵدارە و، مافی خۆیەتی، وتمان ئەبووایە لەژێر سێبەری ڕژێمی دیموکراتی نوێدا ، ئەمڕۆ لەگەڵ دەزگیرانەکەیدا بەخۆشی و سەر بەستی ژیانی بەسەرببردایە نەک بەوشیوەیە ژیانی لەمەترسیدابێت لەئینزیباتخانە توندبکرا بێت بەو دەردە برابێت، کە کاک ئەحەد هات بۆ وەرگرتنی نامە ، نامەکەی ئەویش خرایە ناو پێڵاوەکانیەوە .

***



مامۆستا عوثمان سەعید

# لۆریەکەی کارگەی جگەرە حەبیب محەمەدکەریم و عوثمان سەعید

شەو بەرەو درەنگی ئەچوو خەریکبوو دەستبکەین بە نووستن لەپڕ لە حوشەکدا غەڵبە غەڵب وهاوار پەیدابوو کۆمەڵێک سەربازمان دی پەلی دوکەسیان بەدەستەوەبوو ، بەدەم لێدان ئازاردان وهاوارو بگرەو بەردەوە و ڕاکرنەوە لەودوکەسە ئالآبوون ، سەربازەکان بەدەم لێدانەوە جنێویان ئەدا ، ئەفسەرەکان داوای ناویان لێئەکردن ، جنێوی ناشیرینیان ئەدا و هاواریان ئەکرد دو سەرکردەی موتەمڕدینیان گرتوە کەدژی جەمهوریرتن بەتەمای پلانی تەخریبی بوون دژی کۆمار ، دنیاتاریک بوو نەمانتوانی بیان بینین تابیان ناسینەوە ، ئەو شەوە نەمانزانی کێن ، بۆلێدان بەنۆرە ئەهاتنەوە سەریان دوایی بردیانن بۆ ژوری لێکۆڵێنەوە لەگەڵ ئەشکەنجەدان ( کە گوێمان گرت هەرباسی چاپخانەبوو) ، دوای ماوەیەک بەچواردەستە هینایانن بۆ ناوەڕاستی حەوشەکەو فرێیاندان ، لەوشەوە ساردەدا لەناو حەوشەکەدا لە ناو قوڕو چلپاودا ، بێهۆش مانەوە تاریک و ڕونی بەیانیبوو یەکێکیان برد بۆ ژوری ئەوبەر تەنیشت ژوری ئامر ئینزیبات کەدەرگای لەسەر حەوشەکەبوو، تەنیا ئەوکەسەی تیابوو نەیانویست لەگەڵ کەس دابینێن کەس بیبینێت و نەزانێت کێیە و لەگەڵی بدوێت ،،، ؟. بەیانی لەگەڵ ڕوناکبوونەوە سەرنجماندا ئەوکەسە بناسینەوە کە بەتەنیا لە حەوشەکەداماوە کەوتوە ، ناسیمانەوە کە مامۆستا {(عوسمان سەعید )ی ناسرواوبوو ،کەبە ( عوسمانی ڕەعنا ) ناوی دەرکردبوو ، زاوای کاک سمکۆ فەتحوڵلە بوو مێردی بەڕێز مامۆستا بەهیە فەتحوڵلەبوو ، کاک عوسمان ماوەیەکی زۆر خزمەتیکردبوو دوایی خۆی خانەنشینکردبوو ، ئەندامی پارتی بوو پیاوێکی کوردپەروەربوو لەناو ڕێزەکانی مامۆستایاندا دەوری هەبوو، وەک کادری پارتی بردبوویان بۆ بەغداد کە لە (چاپخانەی خەبات ) کاری چاپەمەنی بکات ، لە دوای دەستپێکردنی شۆڕشی یازدەی ئەیلول ١٩٦١دا چاپخانەکە گوێزرابووەوە بۆشوێنێکی نادیارو نهێنی ، مامۆستا عوسمان سەعید لەوی مابوو بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری چاپخانەکەو ڕێکخستنەکانی پارتی ، لەبەرئەوە شوێنی چاپخانەکەی ئەزانی ، ئێمە زوتر ئاگاداری دەرەوەمان کردبوو و ڕونکردنەوە و ڕوداوەکانی پەیوەند بەچاپخانکەمان بەنامە گەیاندبووە دەروە ، تاخێرا فریابکەون شوێنی چاپخانەکە بگوێزنەوە بۆ شوێنێکی کەی نهێنی تادەست میری نەکەوێت بەهۆی ئەونامەو ئاگاداریەمان ، خێرا فریاکەوتبوون لایان بردبوو} .

ئەو بەیانیە دوای چەند سەعاتێک ( مامۆستاعوسمان سەعید) یان بەچواردەستە بەبێهۆشی هێنایە ژورەکەی ئێمەوە، لەناو دەرگاکەدا فرێیاندا . من هەر زووتر ئەمناسی ، دیمان کە بەجۆرێکی خراپ لێیدراوە هەمووگیانی برینەو خوێنی پێوەیە شینبونەتەوە دەستێکی بۆ

ڕاستنابێتەوە، دوای نیوەڕۆ کەهاتەوە سەرخۆ ئێمەی ناسیەوە شپرزەیی نەماو دڵیکرایەوە ، پرسیمان ئەوکەسەی دووەم کێیە لەکە گەڵت بوو،،،؟وتی: ئەوە کاک (حەبیب محەمەد کەریمە) ،ئەویش وەک کاک عوسمان لێیدرابوو بەدەردی ئەوبرابوو ، بەڵام لە هەموو جیاکرابووەوە بەتەنها لە ژورێکدا دانرابوو،{ کاک حەبیب محەمەد کەریم ، پیاوێکی هەڵکەوتوبوو فەیلی بوو کەسایەتیەکی پێشکەوتوی پارتی دیموکراتی کوردستانبوو ، ماوەیەک لە بەغداد لە وێستگەی تەلەفزیۆنی بەغداد کاری ئەکرد ، دەنگ و باسی بڵاو ئەکردەوە کە تواناو لێهاتوو بوو بەوهۆیەوە ناوی دەرکرد ،دوایی بووە ( سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستان ) وەک دەرکەوت جلی بەبەرەوە نەمابوو دڕابوو هەموی خوێنبوو، لەدەرەوە جلیان بۆ هێنابوو .

وەک لەدواییدا، زانیم دایکم بۆی باسکردم کاتێک خواردنیان هێنابوو بۆم ، سەربازەکان جلەکانیان دابوو بەماڵی ئێمە کە بیشۆن، وتبویان لەماڵی خۆتان بۆی بشۆن خێرا بۆی بهێننەوە بۆیان گێرامەوە وتیان : دیمان جلەکانی هەموو دڕابوون پارچەبوون بەکەڵکی لەبەرکردن نە ئەهاتن هەمووی خوێنبوو لەوەئەچوو کە خاوەنەکەی بەگوللەکوژرابێت ، وتیان ئێمە جلی تۆمان هەلبژارد بردمان بۆی کە تازەو پاکبوون}. زۆر هەوڵماندا کاک حەبیب ببینین نەمانتوانی و نەیاهێشت ئەگەر بۆ توالێت بچوایە چەند سەربازێک ئەچوونەبن دەستی ، ژورەکەی پەنجەرەی لە سەرحەوشەکە نەبوو. کاک عوسمان وتی بەیانی زوو بوو هەردوکمان بەجیاجیا لەبەغداد لەپڕ گیراین کەسمان ئاگای لەوی ترمان نەبوو .

وەک باسمکرد کاک عوسمان هەمووگیانی خۆیناوی بوو توانای هەلسان و ڕۆیشتنی نەبوو خوێن قەتماغەی کردبوو لە سەردەستی، جلەکانی لە بەردا شڕو وڕکرابوو. ئەوبەیانیە وەک لە سەرئاگربین وابوو نامەمان ئامدەکردبوو ، لەگەڵ نامەیەکی دوکتۆر سەروەر بۆ دەزگیرانەکەی. چاوەڕوان بووین کەکاک ئەحمەد عارف بێت نامەکانی بدەینێ تابە خێرایی بیانگەیەنێت.

ئێمە نامەکانی دوکتۆر سەروەرمان زۆربەئاسایی دانا ئەمان وت ئەبووایە دوکتۆر سەروەر لەگەڵ دەزگیرانەکەیدا لەم تافی لاویەتیەدا لەژێر سیبەری ئازادی وسەربەستیدا بەیەکەوە بەخۆشی ببردایە تە سەر، نەک لە بەندیخانەی ئینزیباتخانە توندکرابێت بەئازارو ئەشکەنجەوە ژیان بەسەربەرێت دور لە خۆشەویستەکەی . بەو هۆیەوە تەندروستی بەگشتی تێکبچێت ،ژیانی بکەوێتە مەترسیەوە، کاک ئەحمەد عارف لەپڕ پەیدابوو نامەو ڕاپۆرت بەڕێکرا .

دوەم بەیانی کە کاک عوسمان زانی ئەتوانین نامە بنێرینە دەرەوە وتی تکایە باناگاداری دەرەوەبکرێت، تا فریابکەوین نەک شوێنی چاپخانەکەو ڕۆژنامەی خەبات و بەیان نامەکان بدۆزنەوە، بابیگوێزنەوە بۆلایەکی تر لەوشوێنە نەیهێڵن . وەرامیان دایەوە خەمت نەبێت دەمێکە ئاگادار کراونەتەوە، وکاتژمێرێکی کەی بپێناچێت هەمیسان ئاگادار ئەکرێنەوە .

**لەوماوەیەدا نامەو ڕاسپاردەی پارتی دیموکراتی کوردستانمان بۆ هات کە ئەنوەر دارتاش و من ( محەمەد باقی سەعید ) و مامۆستاعوسمان سەعید لەسەر فرمانی پارتی بووینە لیـژنەی ڕکخستنی پارتی لەناو ئینزیباتخانەدا بە نهێنی .**




حاجی ڕەسوڵ سێوکانی لەگەڵ براکانی مەحمود ،ئەحمەد هەمووگیران .

## بنەماڵەی سێوکانی... براکان وگەراجی دەبۆکە

دەمەو بەیانی بوو دیمان چەند پیاوێکێ کەڵەگەتی کەتەیان بەپاڵ هێنا بۆناو حەوشی ئینزیباتخانە ، سەربازەکان لە دوەریان کۆبوونەوە دەستیانکرد بە لێدانیان وەک لە لاپەڕەکانی پێشودا شێوەی لێدانمان باسکردوە هەر بەو پێیە ئەمانیشیان بەودەردەبرد،
وەک لە شێوەی جلەکانیاندا و لە بەستنی چامانەکانیاندا دەرئەکەوت لە دانیشتوانی ناوچەی پشدەر ومەرگە بن ، دوایی زانیمان کە خەڵکی ناوچەی بنگرد ومەرگەن بەتایبەت خەڵکی دێی (سێوکان) بوون هەر ئەوبنەماڵەیە بەناوی سێوکانیەوە ناسرابوون ناویان دەرکردبوو ، کە دێیەکی سەربە ناحیەی بنگردە وبەسەرگۆمی دوکاندا ئەڕوانێت، خاوەنی گەراجی گواستنەوەبوون لە گۆڕەپانی دەبۆکە کەئێستاکراوە بە کۆمەڵە دوکانێک ، کە بە ( بازاڕی دەبۆکە) ناو بانگی دەرکردوە، لەوگەراجەوە هەموو ڕۆژێک لۆری بار دەرئەچوو بەرەو پشدەر و ناوچەی بنگرد . {گەراجی دەبۆکە کاتی خۆی سەبازگەی دەوڵەتی عوسمانی بوو ، لەزەمانی ئینگلیز و دەوڵەتی عێراقیدا بۆ هەمان مەبەست بەکار ئەهێنرا سەربازگەیەک بوو بەناوی دەبۆکەوە ناسرابوو، دوایی وەک گۆڕەپانێک بەکار ئەهێنرا لە لایەن لادێییەکانەوە کەبارەدارو خەڵوزو بەرهەمی لادێیان ئەهێنا بۆفرۆشتن لەم شوێنەدا ساغ ئەکرانەوە، دوایی وەک گەراجێک بەکار ئەهێنرا لەلایەن خێڵی سێوکانیە کانەوە بۆگواستەوەی کەل و پەل و ماڵی بازرگانی وخەڵکی بۆ دەرەوی سلێمانی بەتایبەت بۆناوچەکانی سەربەجادەی دوکان .}
ئەم برایانەش برڕێتی بوون لە کاک ئەحمەد ومحەمەد و مەحمود و ڕەسوڵ ( وەک خێڵی حەمەی فەرەجە فەندی )گێرابوون بەبیانووی ئەوە و بەبێ بەڵگە کە بەلۆریەکانیان بەیان و بڵاوکراوەیان گواستوەتەوە و یارمەتی پێشمەرگەیانداوە ( لەسەر زمانی خۆیانەوە بەیان و چەک

لەلۆریەکانیابدا گیرابوو )، ئەم خێزانە دڵسۆزو کورد پەروەرو بێوەی و بەهەڵوێست بوون، خزمەتی شۆڕشیان کردوە وکاتی خۆی لەناو پێشمەرگەدابوون ، لەئینزیباتخانەش بەرگەگرو هیمن و لەسەر خۆبوون ، لەدوای لێدان و لێکۆڵینەوە ناردیانن بۆ ناو ژورەکەی بەرامبەرمان ( ژوری حەمە ڕەشید ئەحەشانە ) .

ماوەیەک لەلامان مانەوە دوایی بەڕەڵلاکران تەنها (ڕەسوڵ سێوکانی) برایان لەگەڵمان مایەوە بەرنەبوو .

ئیتر کاری سەرەکی ڕۆژانەی دڕندەکانی زەعیم سدیق هاتەوە سەر ئەمینی عەبدەو حەمەی حەمەلاو ، ئێمە بیر چووینەوە و پشویەک و ئاهێکمان پیاهاتەوە ، ئازارو برینەکانمان کەم وساڕێژبوونەوە .

رۆژانە وشەوانە بەحەمەی حەمەلاو وئەمینی عەبدەوە خەریکبوون داوایان ئەکرد ڕاستی بڵێن ، ئەیانهێنان ئەیانبردن بەلێدان و ئازارو ئەشکەنجە و بردنەدەرەوە، ئێمەوامان لێهاتبوو ئەمانوت ئەمانە چۆن ماون وبەرگەیانگرتوە وتێک نەچوون ، بەزەییمان پێیاندا ئەهاتەوە .

زۆر جار شەوانە زەعیم سدیق بەسەری ئەکردنەوە بەشی خوی لێدانی بەرئەکەوت . حەمەی حەمەلاو لەپێکەوتبوو . ئەوەندەی لێدرابوو ، شەوانە وڕێنەی ئەکرد .

# کاکەحەمەی خومسار (خونسار )

ئێوارەبوو دنیا هێشتا ڕوناکبوو پیاوێکی جل کوردی کەڵەگەتی ورگنی قەڵەویان کرد بەحەوشەکەدا ، دو سەباز دوای کە وتبوون بەلێدان ، یەکێک بەدار ، یەکێکی کە بەقامچی تێیئاڵابوون لێیان ئەداو ئەمیش لەبەردەمیانەوە بۆ خۆپاراستن ڕاپئەکرد تاخۆی دوربخاتەوە لێیان ئەوانیش بەدواوەی بوون لێیان ئەدا ، کەگەیشتە ناوڕاستی حەوشەک کۆمەڵێک سەربازیکە بۆیهاتن بەدەم لێدآن و ڕآکردنەوە لەژێر دەستیاندا ئەکەت و هەڵئەسایەوە ، هەردودەستی گرتبوو بە سەریەوە تا زەبری بەرنەکەوێت ، گەیاندیانە بەر ژورەکەی ئێمە دیمان تەنها کراسێکی لەبەردایە لەگەڵ شەرواڵێک لە سەرکراسەکەیەوە پشتێنێکێ ئەستوری پانی لە پشتدایە لەهی قەساب ئەچو ورگن وکەڵەگەت بوو دەم و چاوی سورو گەنم ڕەنگبوو ، سەری ساف یەک تاڵ موی پێوەنەبوو وەک مەنجەڵی مس بریقەی ئەدایەوە ، قادربرسی وتی ئەو پیاوە ئەناسم ئەوە (حەمەی خومسارە ) قەسابە مالیان لەگەڕەکی قەسابەکانە لای ماڵی عەواشی سەرووپێ فرۆش .

ماوەیەک سەربازەکان لێی دورکەوتنەوە دەرئەکەوت زۆر شپرزەبوو واقی ورمابوو ، بەترسەوە کە سەری هەڵبڕی ناو ژورەکەی ئێمەی دی ، لە بەرخۆیەوە وتی :بۆخاتری خوا چی ڕۆژێکە ئێمە تێیکەوتوین،،،،؟ ، خۆ بەدەم لێدانەوە نیوە مردوویان کردم ، بەدرێژایی ژیانم ئەم کارەم بەسەرنەهاتوە و نەم دیوە چی زوڵمێکە لێمان ئەکرێت ،،،،؟، قادر برسی کە ئەیناسی وتی : کاکە حەمە کەی ئەوەلێدانە هێشتا ماوتە باشەودرەنگ بێت ئەوسا ئەبینیت ،،،،؟، کاکەحەمەی خومسار پرسی:جا ،،، چارچێە ،،، بۆ خاتری خوا چیبکەم باشە ،،،،؟ ، کاک قادر وتی کاکە حەمە کاتێک دێن بۆلێدانت هەتا ئەتوانیت هاواربکە و بقیژێنە بەو شێوەیە وازت لێئەهینن، لە لێدان ڕزگارت ئەبێت ، توزێکی پێچوو کە هاتنەوە بۆلێدانی هێشتا مابوویان بگەنەلای دەستیان بیگاتێ بەدەنگێکی گڕو بەرز هاوارئەکرد ئەینەڕاند ، ئای باوکە ڕۆ ، سەربازەکان ئەوەستان توڕەئەبوون وجنیویان پێئەدا ، ئەیانوت ، خۆ ئێمە هێشتا لێمان نەداوێت بۆ چی هاوارئەکەیت ، هێشتا لێت دورین . بەم جۆرە وازیان لێئەهێنا ودور ئەکەوتنەوە لێی بۆماوەیەک وازیان لێهینا، لەدواییدا جار جارە کە لەپەنجەرەکەمان نزیک ئەبووەوە ئەی وت: بەوشێوەیە ئاواهاوار بکەم باشە، وەرامان دایەوە:زۆرباشەو عەیبی نیە نەوعی نیە، هەتا ئەتوانیت هاواربکەو بقیژێنە من لەکاتەدا چیرۆکە فۆڵکلۆریەکەی کوڕە کەچەڵەم هاتەوە بیر کە بەکوڕە کەچەلەیان وت هەتاڕاکەیت قەدرت زیاتر ئەبێت و بازەکە بەسەرتەوە ئەنیشێتەوە بەوشیوەیە دەبیتە شا . بەوهۆیەوە هەر وازیان لێنەهێنا و بردیان بۆژوری لێکۆڵینەوە ، کەهیچی نەئەزانی و نەی

ئەزانی لەسەرچی گیراوە ،لەوێ بەشی خۆی لێدانی خوارد و هەروەها لەپێشدا بەشێک لێدانی خۆی خواردبوو  ئەوشەوە لە بەرسەرماو نمەی باران تابەیانی هێشتیانەوە لەگەڵ دەستپێکردنی کاروفرمان لەئینزیباتخانە کردیانەدەرەوە و نەجاتیبوو .

## عیزەت یەکپارچە و کشمیش

(لوتفی مەحمود ئەفەندی ڕەسام ) کشمیش هاتبوەوە سەر خۆو سەری بەملاو ئەولادا بائەداو دەستیئەکرد بەپێکەنین وقسەی خۆش بۆمان ،  ڕۆژێک لەپڕ سەرێکی بەرزکردەوە چاوی نوقاندو سوربووەوە  ( کەخۆی پێستی سورباو بوو زۆرتر سور ئەبووەوە ) ملە درێژەکەی بەرزکردەوە بە قاقای پێکەنینەوە کە لەگەڵیدا بەرز ئەبووەوە ئەوپێکەنینە هەر لە خۆی ئەهات وتی : کۆڕینە گوێم لێبگرن ، من ئەمڕۆ زۆربیری هاوڕێی خۆشەویستم ( عیزەت یەکپارچە ) ئەکەم ،،، !، چۆنە ئەمڕۆ بانگیبکەم بۆ ئێرە، بیکەمە میوانتان ، هەموو دامانە قاقای پێکەنین وتمان کوڕی باش ئەم کارە چۆن ئەبێت؟ کشمیش دوبارەی کردەوە وتی: [ کوڕینە ئەمڕۆ ئەگەر  بانگیانکردم، داوای ناویان لێکردم ناوی عیزەت ئەهێنم ، دەعوەتی ئەکەم بۆ ئێرە، بیری ئەکەم برادەرو خوشەویست و هاوڕێمە، کەهات خزمەتی ئەکەم ] وتمان لوتفی تۆبەڕاستە ، بەپێکەنینەکەیەوە ملی درێژ ئەکردو بایئەداو چاوی ئەنوقان دەم وچاوی سور ئەبووەوە وتی [کوڕینە بەهاتنی کۆڕو دانیشتنەکەی ئێوەش خۆشئەکات ، ئیتر منیش بێتاقەت نابم ، ئێوەش ئەوەندە قسەی خۆش ونوکتەی لێئەبیستن دڵتان ئەکرێتەوە، کە قسەکەی تەواکرد ، تۆزێک وەستاو وتی، جامن چۆن دڵم دێت توشێ ئەم ئازارو ئەشکەنجەیەی بکەم ]

عیزەت یەکپارچە لاوێکی قسەخۆش و بێدەنگ وبێوەی ولەسەرخۆبوو لەکاتی ئاساییدا زۆر ڕەوشتی ناسک وهێمن بوو شەڕانی نەبوو ، بەڵام کەئەیخواردەوە زۆر ئەگۆڕاو شەڕانی دەرئەچوو، پەلاماری ئەداو دەرەقەتی بەرامبەرەکەی نەئەهات ،لاوێکی لاوازو بچکۆلە بوو پەنجاکیلۆ نەئەبوو هەردەم ئەیووت (سیاسەت ئەکەم هەموو کوردان برامن  . یەک پارچە ڕۆحێ منن ) لەم قسەیەوە کەهەردەم دوبارەی ئەکردەوە ئەونـاوەی لێنراو سەپێنرا بەسەریداو پێیناسرا   ئەگەر نەوترایە  (عیزەت یەکپارچە ) کەس عیزەتی نەئەناسی ، لەلایەکی کە وە ، وەک کاک فەهمی برای وتی : دایکم عیزەتی زۆر خۆش ئەویست هەردەم پێی ئەوت عیزەت گیان تۆ یەک پارچە دڵی منیت کەهاوڕێکانی بیستبوویان دایکی وای پێ ئەڵێت ئەوناوەیان لێنا ، عیزەت یەکپارچە لە خێزانێکی مام ناوەندی شارەکەبوو . باوکیان هەر زووکۆچی دوایی کردبوو دایکیان بەرهەمی هێنابوون ، خێزانێکی بێوەی و بەڕێزو خۆشەویست بوون . ماوەیەک دراوسێمان بوون نزێک قوتابخانەی ئیبن خەلەکان لەگەڕەکی گۆیژە، نزیک دواناوەندی کچان. کشمیش و عیزەت یەکپارچە هاوڕێی هەمیشەیی خۆشەویستی یەکتربوون زۆرترینی کات هەر

بەیەکەوەبوون هەردوکیان لای خەڵکی خۆشەویستبوون قسە خۆشبوون ، تەنها زیانیان بۆخۆیانبوو .
زۆر سەرگوزەشتەو قسەیخۆش لە سەریان ئەگێڕنەوە، عیزەت یەکپارچە بەوە لەناو خەڵکیدا ناوی دەرکردبوو کە تووشێ شەڕبووایە ئەگەر جارێک سەرنەکەوتایە بکەوتایەتە سەر زەوی هەڵئەسایەوە بە بەرامبەرەکەی ئەوت ( دەی بخۆ ئاوات لێئەکەم ئەگەر عارتنەناوە با جارێکی کەبێم لەخۆڵەکەدا بتگەوزێنم هەمووگیانت بشکێنم ، دوایی بە کەسانی دەوری ئەوت بەرمدەن باتۆزێکی تری لێبدەم عاقڵی بکەم ) دوای ئەوەی لوتفی ( کشمیش )، قسەکەی تەواوکرد ملی درێژکرد وقوت بووە وتی : باچەند نوکتەوە قسەی خۆشی کاک عیزەتتان بۆ بگێڕمەوە ، بۆیەکەم جار کەعیزەت لێم زویر بوو (عاجز ) بوو وتی : کشمیش گوێم لێبگرە ،،، مادام تۆ ئەوەندە لەگەڵما ناپیاو دەرچوویت شەرتە ئیتر لەمەودوا لەبەرتۆ کفتەش نەخۆم ،،، وتم : کاک عیزەت بۆ لە بەرمن کفتە ناخۆیت ،،،؟، کفتە چی پەیوەندیەکی بەم باسەوە هەیە ،،، ؟ ، وتی :لەبەرئەوەی کفتە کشمیشی تیایە ، هەموو دامانە قاقای پێکەنین . هەروەها وتی : کاک عیزەت لەماوەیەکدا پەیوەندیکردبوو بەپێشمەرگەوە لە ناوچەی (گورگەدەر) بوو (کەدێیەکبوو لەودیو ئەزمڕەوە لە شارباژێڕ) جوابم بۆ نارد وتم: عیزەت تۆلە گورگە دەرچێ ئەکەیت ،،،؟ ، وەلامی بۆ ناردبووم وتبووی :لەوێ گورگ ڕاوئەکەم .
لەوکاتەدا لەپڕ دەرگاکرایەوە ئامر ئینزیبات ڕەشێد المهداوی هاتە ژورەوە ولەناوەڕاستی ژورەکەدا وەستا وریزیکردین ئەوەی نەیتوانی هەڵسێت بەشیخۆی لێدانی خوارد دوایی وتی ( قادربرسی کێیە،،،؟،) قادر برسی وەڵامیدایەوە : وتی : بەڵێ منم ، ئامر ئینزیبات وتی : هەڵسە دوامبکەوە ، کە گەیشتە ناو دەرگاکە ئاوڕی لێدایەوە وتی لەژورەکەی ئەولا داوایانکردویت ، نەقلی لای ئەوانت ئەکەم . مەبەستی لەژوری ئەولا ژورەکەی عەلی ئیبراهیم دەروێش و حەمەی فەرەجەفەندی و کەمالی کوڕی و ڕەئوفی فەرەجەفەندی و جەزای عەلی کاتب بوو ، کەداوایانکردبوو بێت بۆلایان قسەی خۆشیان بۆبکات ورەیان بەرزبکاتەوە . بەم کارە ماتەمینی دایگرتین ، زۆرمان لا ناخۆش بوو چونکە بەڕۆشتنی کاک قادر برسی لە لامان یەکێک لە هەرە قسەخۆش و ورەبەرزو وریاو پاکمان لەدەستچوو. دوای ماوەیەک ، هەموو لەمشت ومڕی ئەوەدابووین . لەپڕ کاک قادر مان دی هێنرایەوە بۆ ژورەکەمان ،لەگەڵ هاتنەوەیدا وتی ، کوڕینە لەوی لەخەمی ئێوەدابووم ئیدارەمنەکرد لەوێ داوای گەڕانەوەم کرد بۆلای ئێوە ،کوڕینە لەوێ فلیمی ڕۆستەمی زاڵ ئیشئەکات (مەبەستی ئەوەبوو هەموو ئەوانەی لەوێن زڵ و کەتەن و قەڵەون ) کاک قادر وتی :ئەو ماوە کەمە کە لەوێبووم دڵم هەر لەلاتان بوو بەرگەمنەگرت.
کاک قادر برسی ، کاک ڕەئوفێ فەرەجە فەندی لەگەڵ خۆی هێنابوو باسی نوقڵی ترش وشێرینی بۆکردبوون ، کاک ڕەئوف زۆرحەزی بەشێرینی بوو کیسەیەکی بەدەستەوەبوو ، کاک

قادربرسی بۆی پڕکرد له نوقوڵ ، کاک ڕەئوف وتی خۆ سەربازەکان ئەیخۆن ئەی ئێمە بۆ نەیخۆین . کاک ڕەئوف بەرەو چاکبوونەوە هاتبوو لەپەنای دیوارەکانەوە دارەدارە گەڕایەوە بۆلای هاوڕێکانی تێهەڵدانی نەخوارد ، هەر ڕۆژە نەڕۆژێک کاک ڕەئوفی حاجی فەرەج ئەهات بۆ نوقوڵی ترش وشیرین ئێمەیش تورەکەیەکمان بۆپڕئەکرد ، جاری وا هەبوو تورەکەیەکمان بۆ ئامادەکردبوو ، بەڵام پێکەنین لەوەدابوو چۆن بەدزیەوە لەبن دیوارەکانەو بە شەلە شەل بۆ نوقوڵدا ئەهات.

وەکو دەرئەکەوت باری ژورەکەی ئەوان باشتربوو لەژورەکەی ئێمە ، ئەوان جۆرە سەربەستیەکیان وەرگرتبوو لێدانیان کەمبوو، وەک بۆمان دەرکەوت ئەوانەی لەو ژورەدابوون ، هەندێکیان حەزیان بەئێمە نەبوو . وایان زانیبوو کەئێمە هەواڵی ناڕێک و دور لەڕاستی ونادروست دەربارەیان ئەنێرینەدەرەوە. کەبووە مایەی دڵگرانیان ،وای لێهات ئەم ڕک وکینەیە ودوژمنایەتیە دژمان و بەرامبەرمان بۆماوەیەکی زۆرلەدڵیانا بمێنێتەوە و لەدەرەوەش بەوهۆیەو بەدەستی هەندێکیانەوە توشی کێشەو زیان ببین، خێڵی حەمەی فەرەجە فەندی کۆمەڵێکی سادەو دڵپاکبوون بێوەی و بێقسە بوون هەموو ڕێزمان لێئەگرتن .

ئەم گرتنەیان لەئینزیباتخانە لەدواییدا بووە مایەی مەینەتی بۆیان ئەوەبوو (کەمالی کوڕی کاکە حەمەی فەرەجە فەندی ) لە مەنعی تەجەولی ٩ /٦ /١٩٦٣ دا دیسان لە ئینزیباتخانە گیرایەوە کەناوەکەیان دیبوو لەلیستی گیراوەکانی چەند مانگێک لەبەوبەر هەرمابوو ، لەگەڵ پۆلە مامۆستایەکانداو و چەند کەسایەتیەکی شارەکە لەحامیە و کارێزەوشک بەگوللە تیرۆرکران.

ڕۆژانە لە ژورەکەی ئێمەوە ڕاپۆرتمان ئەناردە دەرەوە ، هەرچی ڕوداو هەبوو ئەنێررا بۆ شاردنەوەی هەواڵ، وەک خۆی ڕاست ودروست بێ گۆڕانکاری بەنامە ئەنووسرا وهەر ئەو ڕۆژە ئەگەیشتە شوێنی مەبەست، هەموو زیندانیانی ژورەکەمان یەک سوێندو یەک باوەڕو پشت بەیەک بەستوو ڕەفتارمان ئەکرد ، هەواڵی برادەرانی کۆمۆنیستمان لەنامەکاندا ئەناردەدەرەوە.



عیزەت یەکپارچە هاوڕێ خۆشەویستی کشمیش



## عومەر کاسترۆ

## بۆڕێش هات سمێڵێشی نا لەبانی

هەر سەرلەبەیانی بوو دیمان گەنجێکی چوارشانەی تێکسمڕاوی گەنم ڕەنگ و باڵا مام ناوەندیبوو، بەسسمێڵێکی گەورەی پانەوە کە بەدەم چاویە دیاربوو لەگەڵ پڕی دەم و چاوی بەوگەورەییەی لێی هاتبوو سمێلی ستالین ئاسایی بوو ، دیمان هاتە ژورەوە لەبەردالانی دەروە و حەوشەکدا وەستا، لەوە ئەچوو داوایەک یان پرسیارێکی هەبێت ، وەک دەرکەوت بەئارەزووی خۆی هاتبوو ، چەند سەبازێک لە دەوری کۆبوونەوە قسەیانئەکرد.

لەئەنجامدا لەدواییدا زانیمان هاتوە داوای وێنەیکی خۆیئەکات کە لە (سەیتەرەکەی ڕێگەی سلێمانی -کەرکوک ) لەناوبارەکانی ماڵەکەیدا لەناو لۆریەکدا گرتبوویان ، کە بەماڵەوە لە کەرکوکەوە هاتبوونەوە بۆ سلێمانی ، خێزانەکەی کەبەتەنها بێ کاک عومەر هاتبوەوە داوای وێنەکەی لە ئینزیباتەکان کردبوو نەیاندابووەوە ، کەوێنەیەکی گەورەکراوی کاک عومەرخۆی بووە ، بەخێزانەکەیان وتبوو : با خاوەنی وینەکە خۆیبێت بۆ ئینزیباتخانە وەریبگرێتەوە ( من کاک عومەرم ناسیەوە کە هاوڕێی قوتابخانەی سەرتاییم بوو ) .

کاک (عومەر وەلی ) کەناوی دەرکردبوو بە (عومەر کاسترۆ ) خۆی پێی ناخۆش نەبوو پێی بوترێت ، هاوڕیی منداڵیم بوو لە قوتابخانەی خالدیەی کوڕان تاساڵی ١٩٤٧ ، لەلام و لای خەڵکی خۆشەویست بوو ،لاوێکی ڕەوشت پاک و خاوەن بیروبڕوای بەهێزبوو چەپڕەوبوو ، بەرگەگرو خۆڕاگرو بەهەڵوێستبوو ،زۆر ڕوخۆشبوو، دەم بەپێکەنین بوو، لەپێناوی بیرو باوەڕێدا لە زەمانی پاشایەتی هەڵوەشاودا ، توشی گرتن و زۆر ئازارو ئەشکەنجەو دەردی سەری بووە.

دوای شۆڕشی ١٤تەموز وای هەستکردبوو بڕوای وابوو ، کە هەموو یەکێک ئەتوانێت بە سەربەستی وئازادی قسەبکات داوای مافی خۆی بکات بەم جۆرە بیرکردنەوەیە هاتبوو داوای وێنەکەی کردبوو .

کاک عومەر دوکانی ئاسنگەری دانابوو لەگوزەری(سەعەی تەهاکۆیی ) چەندجارێک دیم پیاوێکی ڕوخۆشبوو بەداخەوە لەم ساڵاندا کەهەواڵێم پرسی (کۆچیدوایی کردبوو ) کاک عومەر زاوای عومەرو عوسمان و عەبدولڕەزاق و ئەحمەد بوو کەباوکیاّن بەنازناوی( عارف فیتک)
ناسرابوو لەوکاتەدا لەکەرکوک ئەژیا ، ویستبووی بەماڵەوە بێتەوە بۆ سلێمانی لێرە ژیان بەسەربەرێت بەونیازەماڵەکەی ئەخاتە ناو لۆریەکەوە بەرەو سلێمانی بەڕێیان ئەکات ، ماڵ و منداڵەکانی لەناو لۆریەکەدا ئەبن و خۆی لەگەڵیان نایەتەوە دوائەکەوێت ، کاتیک لەسەیتەرەی سلێمانی ناو لۆریەکە ئەگەڕین وێنەیەکی کاک عومەر ئەدۆزنەوە ، کەوێنەکە سەیر ئەکەن ئیبینن ، کاک عومەر بەسمێڵێکی گەورەی ستالین ئاساییەوەیە ، لە خێزانەکەی پرسیار ئەکەن ئەوەڕەسمی کێیە؟ خێزانەکەی ئەڵێت : ئەمە هی مێردەکەمە ، ئەڵێن کواخۆی ، ئەڵێت خۆی لە کەرکوکە دوای چەند ڕۆژێک دێتەوە ، ئەڵێن بائەم وێنەیە لەلای ئێمە بێت کەخۆی هاتەوە بابێت بۆ ئینزیباتخانە وەریبگرێتەوە، وێنەکەی کاک عومەر بەگەورە کراوی بەسمێڵێکی ڕەشی پڕی جوانەوە ،لەگەڵ دەم وچاوی پڕی خڕی لەهی ستالین ئەچوو هەیکەلیبوو لێیهاتبوو .
کاک عومەر کە دێتەوە بۆسلێمانی ، خێزانەکەی باسی بۆ ئەکات ئەویش بە دوای وێنەکەیدا هاتبوو وەریبگرێتەوە ،کەگەیشتبووە ئینزیباتخانە داوای وێنەکەی کردبوو ، کاتێک کەوتبوە قسە لەگەڵ سەربازەکاندا ، هێندە بڕوای بەخۆی بوو ، کەوتبووە قسە لەگەل ئینزیباتەکان کە بەدوای داواکاریەکی ڕەوادا هاتوە وەریبگرێتەوە حەقی خۆیەتی، بڕوای بەوەش بوو کە ئەمڕۆ لەسایەی شۆڕشی ١٤تەموزدا، دیموکراتی بەرپایە و سەربەستین، بەوهۆیەوە هەستی بەجۆرە سەربەستیک کردبوو کە شورشی نوێی ودیموکراتی و ئازادیە، ئەومافەی پێ بەخشیوین ، هەرکەس سەربەستە، ئەمانێش ئەم قسانەیان بەدڵ نەبوو ، کەتروسکاییەکی دیموکراتی و ویژدان ودادپەروەری و مرۆڤایەتی بەزەیی لەدەرون و بیرو مێشکیاندانەبوو بیری تاوان وجاهیلیەتی عەرەبی زاڵبوو جیگەی هەمووی گرتبووەوە، لەئەنجامی قسەکانی لەگەڵیاندا هەستیان کردبوو کەکۆمۆنیستە ..
بۆ شانسی کاک عەمەر لەوکاتەدا زەعیم سدیق دێت بۆ ئینزیباتخانە عەلاوی لەگەڵدابوو (عەلاوی نائب زابتبوو پیاوێکی کەڵەگەتی کەتەو بەهێزبوو هەردەم لەگەڵیدابوو ئەیپاراست ، پیاوێکی دڕندەبوو ) زەعیم سدیق گوێی لەقسەکانی کاک عومەر ئەبێت ، کەکاک عومەر سور ئەبێت لەسەر داواکەی ، وێنەکە وەربگرێتەوە ئەم ڕەفتارەی بەدڵنابێت ، ئیشارەت ئەکات، کەپەلاماری کاک عومەر بدەن .
عەلاوی تێڵایەکی لەسەر تەنورەکە هێنا کەوتە وێزەی کاک عومەر بەقەستی کوشتنی بێڕەحمانە بەتێڵاکە لێیئەدا ئەیماڵی بە هەموو گیانیدا دەستی نە ئەپاراست ئەوەندەی لێدا تا هیلاکبوو

یەکەمجار قاچێکی سەقەتکرد ، دەستی بەجەمام کەوت لە جێ چوو لەشی ئازاری زۆری بەرکەوتبوو ، لەوکاتەدا شپرزەو گێژبوو ئاگای لە خوی نەما وبۆرایەوە، (لە دوای چەند مانگیش عومەر(بەچنگەکرێ) خۆی ئەخشاند قاچێکی تەواو نەبوو نەیئەتوانی هەڵسێت بەپێوەبڕوات ).

زەعیم سدیق لەولاوە ڕاوەستابوو سەیری ئەم دیمەنەی ئەکرد ، بەداروەدەستەکەی ئەڵێت کە وێنەکەی پیشانبدەن، بینیمان سەیری وێنەیەکی گەورەئەکات، سەربازەکان بەدیاریەوە ،چاوەڕوانبوون ، هەربجوڵایەتەوە پەلاماریانئەدایەوە، کاک عومەر مردنی بەچاوی خۆی دی و سەربازەکان هەردەم جنێویان بە ستالین و حیزبی شیوعی (کۆمۆنیست ) ئەدا .

بەتیڵا کە قاچی سەقەتکرابوو نەیانهێشت بچێتە ژورەکانەوە لەسەر تەنوورەکە هێشتیانەوە بەدرێژایی مانەوەی لە ئینزیباتخانە بەوزستانە سارده هەر لە سەر تەنوورەکە لە بەر سەرماو سۆڵەو باران کەوتبوو، سەر تەنوورەکە نزیک دەست شۆرو تواڵێت بوو ، هەریەکێکمان بچووینایە بۆ تواڵێت بەلایدا تێپەڕ ئەبووین قسەمان لەگەڵ ئەکرد .

جارێکیان ماوەم هەبوو قسەم لەگەڵکرد وتی من گرتوخانەی (باقوبە و نوگرەت سەلمانم )دیوە کاروانەی زۆرم پێکراوە لەوێ ئازار دراوم بەڵام ئازارو ئەشکەنجە ولێدانی وام نەچێشتوە و نەدیوە ، ئەمە یەکەم جارە توشی لێدانی بەم جۆرە ئەبم ، هەموو جارێک پێمان ئەوت پیاو ئەو پیاوەیە بەرگەبگرێت ، ورەی بەرزبێت ، ئەزانین لای تۆ ئاساییە تۆ زۆرت بەسەرهاتوە .

ئەوڕۆژە دەمەوئێوارە بوو هاتنەوە وێزەی بەدەم لێدانەوە داوای ئەویان لێکرد کە جنێو بە ستالین و لینین وبارزانی بدات ، لەبەرئەوەی خاوەنی بیرو باوەڕبوو بەرگەگربوو ، لە باتی ئەوەی بێدەنگبێت، وەرامی ئەدانەوە کە ئەوانە پیاوی گەورەن و بەناوبانگن بۆ جنێویان پێبدەم؟ .

فلیمی ئەمرۆو ئێوارەو شەو تابەیانی هەر هی کاک عومەر کاسترۆبوو ، هیچیان لەسەرینەبوو تەنها ئەوەنەبێت کە زانیان ( کۆمۆنیستە) بەدڵی ئەوان قسەناکات وەڵام ناداتەوە .

شەو دەستیانکرد بەلێدانی ئەما لێدان ، بردیان بۆژوری لێکۆڵینەوە تەنهابۆ ئەشکەنجەو ئازاردانی ، بەوساردو سەرمایە لەدەرەو لەسەر تەنور هێشتیانەوە جلی لەبەردانەمابوو دڕابوو ، هەر ساتەنەساتێک ئەچوونەسەری و جنێویانئەدا بەستالین و لینین ومارکس و بارزانی و داوای جنێویان لێئەکرد ، لەدواییدا هاتنە سەرئەوەی هەرئەبێت جنێو بەبارزانی بدات کە (ناکر الجمیلە ) وموتەمەڕێدە و هینراوەتەو لەم وڵاتە جێگەی کراوەتەوە و لەم خاکەدا ئەژی ، بێوەفایە ،لەم وڵاتە ئازادو دیموکراتی و ئازادیخوازە ، هەڵگەڕاوەتەوە . بەم شیوەیە کاری ئەوچەند رۆژەیان هاتەسەر ئازاردان وجنێودان .

## به گاز و پلاییس سمێڵی هەلکێشرا

بەیانیەک کە بەلایدا تێپەڕبووین دیمان ئەوسمێڵە گەورەیەی پاککراوە وتاشراوە، من لێم پرسی کاکە عومەر کواسمێلەکەت چێ بەسەرهات بۆتاشیت ،،، بەچی تاشێت ،،چۆن ،،؟ وتی: سمێلەکەم چووە گۆڕی باوکیانەوە ، لەدواییدا زانیمان تومەز ئەوشەوە سەبازەکان گازو پلاییسیان هێناوە گرتویانە مو بەموی سمێڵیان دەرهێناوە، لەدواییدا کاک عومەرکاسترۆ بۆیگێڕاینەوە وتی شەوهاتنە سەرم لە سەر ورگ و سنگم دانیشتن هەردودەست و قاچیان بەستم و لێدانی چاکم خاردو جوڵەم لێبڕا ونیوە مردو کرام ، بەگازوپلاییس موبەموی سمێڵیان دەرهێنام.

***

## دولاوی ڕەواندزی

رۆژێکی دەمەو ئێوارە بوو دولاومان دی سەربازەکان پێش خۆیاندابوون ماوەیەک لە حەوشەکەدا مانەوە نەمان ناسین، دوای ماوەیەک چەند سەربازێک لەدەوریان گردبوونەوە دەستیانکرد بەلێدانیان ، هەر هاواریان بوو : کەئێمە میوانین ،،،هیچ نازانین ،،، هیچمان نەکردوە ، لەشەودا دوای لێکۆلینەوە ولێدان یەکێکیان هێنابۆ ژوری ئێمە ، دوای ماوەیەک کە باری تەندروستی دەرونی ئاساییبوو پرسیارمان لێکرد وتی ناوم (مەلەوانە ) براکەم ناوی ( شاخەوانە ) خەڵکی ڕەواندزین بۆ سلێمانی بەمیوانی هاتین ، لە سەیتەرەکە گرتیانین ، نازانین لە بەرچی وهۆی چیبوو ،،،؟ . وایانئەزانی گوایە پێشمەرگەین ، وتی ئێمە بۆکاری خێزانی خۆمان بۆماڵی خزممان هاتوین ، توشی ئەم بەڵایەبووین ، ئەو شەوە مەلەوان و شاخەوان تابەیانی مانەوە بەیانی وکرانە دەرەوە .

[لەساڵی ١٩٩٩دا لە شاری (ماڵمۆی سوید) بۆ یەکەم جار ویستم بچم بۆ نەرویج ، لە سەنتەری کەلتوری کوردی ڕێککەوتم لەگەڵ لاوێک بمگەیەنێت بۆ ئۆسلۆ کە ئەو بەنیازبوو بچێت بۆ( یۆتۆبۆری) ، کەلە ئۆسلۆ وە نزیک بوو وتی من ئەتبەم ، لە ڕێگە کەباسی سیاسەت و باری کورد کرا باسیکرد کەلە ئینزیباتی عەسکەری سلێمانی شەوێک گیراوە و لێدانی چاکی بە خۆڕایی خواردوە ، منیش وتم : تۆ ئەوگەنجە ڕەواندزیە بوویت کە شەوێک لە

**لەئینزیباتخانەدا لەژورەکەماندا مایتەوە وتی : بەڵێ .یەکترمان ناسیەوە وتی من بووم ( مەڵەوان ) .چەندساڵێکە لە سوید لە شاری ماڵمۆ ئەژیم براکەشم شاخەوان لەگەڵە ، ئەویش لێرە ئەژی ،ئەبینیت ئەمڕۆ خۆم و خێزانەکەم کەخەڵکی دیوانیە یە ئەچین بۆماڵی براکەم لە (یۆتۆ بۆری) خێزانەکەم لەماڵی براکەم دائەنێم و ئەتبەم بۆ ئۆسلۆ ، هیوادارم بەسەلامەتی بگەینە ئەوێ ، ماوەیەک لەماڵی براکەی ماینەوە ، بەوبەیانیە دیمان گیپەیان لێناوە ئامادەیە بۆخـواردن ، کەباسی گیپەکرا منیش زۆر تامەزرۆ بووم بۆخواردنی دووساڵ بوو نەم خواردبوو ، هەردوکمان تێرو پڕمان خواردو بەرەو ئۆسلۆ بەڕێبووین.]**

***



# هەڕەشەی مام جەلال

سەرلە ئێوارەبوو دنیا بەرەوتاریکی ئەچوو حەوشەی ئینزیباتخانە پڕبوو لە سەرباز هەموو بڵاوبوونەوەو دامەزران ، بەمەدا زانیمان زەعیم سدیق هاتوە ، لەپر خۆیکرد بەحەوشەکەدا و لەلایەکەوە وەستا سەگ و گورگەکانی دەوری ،هەر کەسێکی بەندکراویان لەحەوشەکەدا ببینایە پەلاماریان ئەدا ، بە تایبەت عەلاوی پیاوی کە پیاوێکی کەتەی زلی قەڵەو بوو درندەیەکی بێوێنەبوو بۆخۆی ، هەرکاتێک بهاتایە یەکسەر بەتێڵایەکەوە بۆلای کاک عومەر کاسترۆ ئەچوو کەکردبوویە نێچیری دەستی خۆی ، عەریف ئیسماعیل لەگەڵی بوو کە خەڵکی ناوچەی خانەقین بوو ، کە زەعیم سدیق بهاتایە ئێمە هەموومان خۆمانئەکرد بەنوستوو . وەک لەوەپێش باسکرا ،زەعیم سدیق باڵا مام ناوەندی بوو لەدەم و چاویدا دەرنەئەکەوت کە خاوەنی کەسایەتی بەنرخ بێت (شەخسیەت ) ،زۆر توڕەو کەللە شەقبوو ، قسەی خۆشنەبوو ،کەرتڕپوو ، قسەزانیش نەبوو، مامۆستای جنێو بوو.

لەدوای ماوەیەک لەپر دەرگاکرایەوە خۆیکرد بەژوردا ئێمە ئەبووایە خێرا ڕاستبینەوە هەموو بەپێوە ڕیزبووینایە ، کەلەپڕهاتەژورەوە هێشتا ڕاکشابووین خەریکی هەڵسان بووین دەستیکرد بەتێهەڵدان و جنێودان ، کاتێک کەڕیزبووین نەختێک لێمان وردبووەوە و دەستیکردەوە بەلێدانی دوکتۆر سەروەر و حەمەی حەمەلاو و کاک جەوهەر ، ئارەزووی هەرکەسێکی بووایە لێیئەدا کە لەلێدان ماندوبوو. ماوەیەک بەبێدەنگ وەستا ، بەخێسەو توڕەییەوە سەیری ئەکردین ، بە دەم چاوێکی گرژەوە هەر لێمان ورد ئەبووەوە .

بەتێروانین و وەستانەکەیدا دەرکەوت کە نیازی کارێکی هەبوو شتێک لەدڵیابوو ئەیویست بیدرکێنێت بیڵێت ، بەتوڕەییەوە دەستیکرد بەقسەکردن ، بەعەرەبی وتی : شنو جەلال یهددنی (مەبەستی بەڕێزمام جەلال بوو ) ،کەگوایە جەلال هەڕەشەم لێئەکات؟ دوایی لە سەری

**ڕۆیشت بە عەرەبی وتی: (لاسلکیەکی بەدەستەوەیە هەرساتە نەساتێک قسە ئەکات نازانین چیۆ ئەوێت؟ ،ئێمە گوێ لەقسەی  ئەو ناگرین ،ئێمە لەهەڕەشەی ئەو ناترسین ،کارمان تێناکات).**
**لەدواییدا بۆماندەرکەت وزانیمان  بەڕێزمام جەلاَل لەگەڵ ئەوەی کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو  سەرکردەی پێشمەرگەی ناوچەی سلێمانی و گەرمیانبوو ، لەڕێـی لاسـلکیەوە پەیوەنـدی بە زەعـیم سـدیقەوە کردبـوو ،هەڕەشـەی  لێکردبـوو، لە خراپەکاریەکانی ئاگاداری کردبووەوە.**
**لەو کاتانەدا شۆڕشگێڕان سەرکەوتن دوای سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو (زەعـیم سـدیق ) شێتگیرانە چاری نەمابوو پەلاماری خەڵکی سڤیل و بێدەسەلاَتی ئەدا ولەکاری دڕندانەو نامەردی خـۆی نەئەکەوت ، ئەگەر هەر جارێـک پێـشمەرگە گـورزێکی گورچکبڕێـان لێبوەشـاندایە و چالاکیەکیان ئەنجامبدایە ، ئەو شەوە ئەهاتە ملی ئێمە ڕک و کینەو داخی دڵی بەئێمە ئەڕشت ، لەوماوەیەدا یەکێک لە دەستکەوتەکانی پێشمەرگە لە نەبەردێکی بەرامبەریدا ، لەگەڵ سوپای میریدا چەند ئەفسەرو سەربازیان بەدیل گرتبوو ، لەنیوانیدا  ئەفسەرێکی خزمێ زەعیم سدیقی تیابوو ، مام جەلال بەلاسلکی قسەی لەگەڵ کردبوو ،**
**:[ وتبووی : کە یەکێک ئەنێرێت بەنامەیەکەوە بۆسلێمانی ،  نامەکە  وەربگـرەو ئەبێـت ئەو پێشمەرگەیە پارێزراوبێت بە سەلامەتی بگەڕێتەوەناومان ،،،هەروەهـا لەمەودوا هەرکاتێـک لە ئینزیباتخانە ئازاری یەکێک بدرێت ،ئێمەیش لای خۆمانەوە ئـازاری ئەوانە ئەدەیـن کە لامـان گیراون خۆشت بەدەر نابێت لەوسزایە ، هەرکەسێکیش لەئینزیباتخانەو دەرەوە خوێن لەلوتی بێت لەجیاتی ئەو ، خزمەکەت بەودەردەی ئەو کەسەئەبەین ]  ، ئەوشەوە هەر بەو بۆنەیەوە بۆژورەکەمان هاتبوو ، دوای ئەوە ئیتر لێدان و ئەشکەنجەدان کەم بووەوە ، وەک جاران  نەما بەتایبەت  لەگەڵ ئەوانەی  کەلێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرا بوو ( بەلاَم هەر تۆبەی گورگ مەرگە )**

***

## حاجیەکی خۆفرۆش
## پیاوێکی وشۆخ شەنگی جل کوردی بەهەیبەت
## بەڵام خاوەن دەرون وکرداری بێ هیمەت

هێشتابەشی بەیانی بوو دیمان پیاوێکی کەڵە گەت بە جلوبەرگی ڕێک وپێکی کوردیەوە مشکی وجامانە بەسەر بوو ، شێوەی لەوەئەچوو کە خەڵکی (،،،، بێت ) بەهەیبەتبوو لەکەسایەتیەک ئەچوو ، لامان وابوو ئەبێت کارێکی گرنگی هەبێت ، هات بۆ ناوحەوشەکە لەگەڵ (نائب زابتەکان)دا کەوتە قسە ، بەفیزێکەوە ئەڕۆیشت وسەیری ئەملاو ئەولای خۆیئەکرد خۆیئەنواند، بەڕێزەوە بردیان بۆ ژوری لێکۆڵینەوە، من نەم ئەناسی وتیان لەوەئەچێت کە حاجی فلان بێت ، ئەگەر ئەو بێت ، پیاوێکی ناسراوی شارەکەیە ، وتمان یاران ئەبێت بۆچی هاتبێت ، کاری چیە بە ئینزیباتخانە ،،،،؟ ، بەرەو ژوری لێکۆڵینەوە پێشی کەوتبوون. دوانمان خێرا ڕامانکرد بۆلای دیواری تیغەکەی بەینی ئێمەو ژوری لێکۆڵینەوە، تابزانین چی باسە،،،،؟، بەڕونی گوێمان لەهەموو قسەکانیانبوو.

کابرا بێشەرمانە وتی: ئیستا لە (ئەسحابەسپی) خەریکن لۆریەک بار ئەکەن لە سندوقە چا، بەرەو (هەڵەبجەی) ئەبەن ، ئەوسندوقانە لە باتی چا پڕکراون لە دەمانچەو فیشەک وتەقە مەنی لەناو چاکاندا شاردویانەتەوە، کۆمەڵێک پێشمەرگە لەدەوری وەستاون بە تەمان لە گەڵێدا بڕۆن بۆ هەڵەبجە ،ماوەیەک حاجیە خۆفرۆشەکە لەگەڵیان مایەوە، لەدواییدا بینیمان بەڕێزەوە بەڕێکراو حاجی بەورگی زلیەوە چووە دەرەوە .

داخێ ئەوەمانبوو لەپێش هاتنی حاجیەکەدا کاک ئەحمەد عارف هاتبوو نامەی ڕۆژانەی وەرگرتبوو فریانەکەوتین، دەرەوە لەم خەبەرە ئاگادار بکەینەوە، ناچار چاوەڕوانی ئەنجامی بووین .

ئەوەندەی پێنەچوو سەربازەکان بەخێرایی کۆکرانەوە برانە دەروەی ئینزیباتخانە ، وادیاربوو بەپێودانی خەبەری حاجیەکەوە بەرەو( ئەسحابەسپی) چووبوون، لەدوای نزیکەی کاتژمێرێک سەربازەکان گەڕانەوە کۆمەڵێک خەڵکی هەڵەبجەیان پێشخۆیاندابوو، کەبە دەکەس زیاتر مەزەندە ئەکران، دەستیانکرد بەلێدان و تێهەڵدانیان لەدواییدا هەندێک سندوقە چایان هێنا بۆ ناوحەوشەکە، لەناوەڕاستیدا فڕێیاندان ،لەلایەکەوە لە گیراوەکانیان ئەداو لە لایەکی کەوە خەریکی سەر هەڵپچڕینی سندوقەکانبوون، لەچا زیاتر هیچیان نەدۆزیەوە ، نەدەمانچە نە فیشەک ، دەرکەوت خەبەرەکەی کاکە حاجی درۆ دەرچوو، دەستیانکرد بەپرسیارو لێکۆڵینەوە

و لێـدان لەگەڵ گیـراوەکانـدا ، دەرکەوت ئەمـانیش ئاگایـان لەم خەبەرە نەبـوو پەیوەنـدیان بەلۆریەکەو سندوقە چاکانەوەنەبوو ، وەک عـادەتـی هـەڵبجـەییـەکـان ، زۆرجـار لـەونـاوەدا کۆئەبنەوە بێئەوەی کارێکی لەوشێوەیە بەبیریاندابێت ، دوای لێدان و لێکۆڵینەوە بەرەوئێوارە هەموو بەرەڵلاکران .

لەنێوانیانـدا مامۆسـتا عەبـدوڵڵە سـورم ناسـیەوە کەخەڵکـی هەڵەبجەبـوو زۆری پرسـیارو لێکۆڵینەوە ولێدان لەگەڵ ئەودا ئەنجامدرا .

(ئەسحابە سپی لەوکاتەدا گەراجی لۆری و ئۆتۆمۆبیل بوو بۆگواستنەوەی ماڵی بازرگانی وهات وچۆی خەڵکی ، لەم گەراجەوەبوو بۆ هەڵەبجەو پێنجوین و شارەزورو دەربەندیخان دەرئەچوون . شەقامی ناڵی دروست نەکرابوو لۆری ئۆتۆمۆبیلەکـان لە سـابونکرانەوە ئەڕۆیـشتن بـەرەو سەرکارێز.) ئیستاکراوە بەتەلارێک بەرزو مۆدرن بەگەراجی ژێرەوە ودوکانی زۆر ڕازاوەتەوە.

***

# دوسەربازی بادینان
# کورد پەروەر ودڵگەرم

لەدەمی ئێوارەیەکدا دنیا تاریک بووبوو سەربازخانە هێمنی وبێدەنگی پێوەدیاربوو ، ژمارەی سەربازەکان کەمکرابووەوە . سەربازێکی کورد خەڵکی ناوچەی بادینان خۆیکرد بەژوورەکەماندا بەکلاشینکۆفەکەیەوە ئامادە بەدەستیەوە بوو ، بەدەستەکەی تریەوە مەخزەنێکی ئیحتیاتی هەڵگرتبوو، سەربازێکی کەی لە گەڵدابوو ئامادە وەک ئەو لەبەردەرگاکەماندا چاوەڕوان وەستابوو ، سەبازەکە قورگی پڕبوو لەگریان بەحەماسەوەو پەرۆشیەوە ، وتی : من چەند ڕۆژە لەگەڵ ئەو برادەرەمدا لێرە پاسەوانم ، ئیتر توانامان نەماوە ،خۆم پێڕاناگیرێت ، ئەم قەسابخانەیەم پێ قبوڵناکرێت ، هاتوم پێتان ڕابگەیەنم کەخۆتان بپێچنەوەو ئامادەبن ڕزگارتان ئەکەین ، ئیستا ئەچین ئامر ئینزیبات ئەکوژین ، لەگەڵ ئەو هەموو سەربازانەی کەلێرەن (حێمایەن )، دەرگای دەروە ئەکەینەوە ئێوەش خێرا ڕابکەن ،دەربچن ، ئێمە ساتێک راماین وەستاین بیرمان خستەکارو تاوتوێی بارەکەمان کرد و هەڵمان سەنگاند هەڵوێستەمانکرد بیرمان چووە سەرئەوەی کەبڕیارو کرداری لەم شیوەیەو وا بەپەلە ئەنجامەکەی روننیە ، وردبینی بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندن و کاتی ئەوێت ، کە تاوتوێمانکرد ئەم بیرۆکەو پلانە بەپەلەیە نەچووە عەقڵمانەوە ، تروسکایی سەرکەوتنمان تیا بەدی نەئەکرد. سەربازەکەمان هێدی کردەوە وبۆمان ڕونکردەوە ، سەر بازەکە ماوەیەکی داپێمان بیر بکەینەوە و ئاگاداری بکەینەوە ، لەئەنجامی بیرکردنەوە وەک بیرۆکەکەمان وردکردەوە وچی بەباش ئەزانین بکرێت.

کاری وا وئەنجامدانی ئاسان نیەو ئەنجامەکەی ڕون نیە لەوانەیە فریابکەون ،لەئەنجامدا هەردوکیان بکوژنەوە ، ئەگەر زانیان ئێمە ئاگامان لەو پلانە بووە ، بەفرسەتی بزانن ئێمەش هەر بەدەردی ئەوانبەرن ، ،ئەگەر هەر توانیمان دەربچین ، ناتوانین دوربکەوینەوە سەربازی کە فریائەکەون بەدەم تەقەکانەوەدێن وئەمانگرن ، کە بەتایبەت بنکەی سەرەکی ئینزیبات خانە لە بیناکەی ئیستای ( ڕەگەزنامەو باری شارستانی )دابوو کە نزێکەی سی مەترێک لێمانەوە دوربوو ، لەبەر ئەوهۆیانە فریائەکەوتن ئەیان گرتینەوە، سەرکەوتنمان بەدی نەئەهێنا .

لەدواییدا سەربازەکان هێدی بوونەوە بیرۆکەی ئێمەیان پەسەندکردو سوپاسی بێپایانمان کردن بۆ ئەو هەستە هەڵوێستە نیشتمانیەو دڵسۆزیان .

# کوشتنی پۆلیسێکی حاجی مامەندی



**وێنەی بەڕێز مستەفا عەبدو الڕەحیم و سدیقە فەندی برای لەگیراوەکانی ئینزیباتخانە**
**کەلە ئەنجامی کوشتنی پۆلیسەکە بەزۆری زۆرداری گیران ئازاردران**
**لەگەڵ کۆمەڵێک لە دانیشتوانی گەڕەکی سابون کەران**

هێشتا بەیانی زووبوو دیمان سەربازەکان دار بەدەستیانەوە بوو کۆمەڵێکیان پێش خۆیاندابوو بەلێدان و تێهەڵدان بەرەو ناوەڕاستی حەوشەکەیان هێنان ،ئەوکەسانە پێک هاتبوون لەپیروجوان وگەنج زۆریان بەتوێی جل و بەرگی خەوەو بەپێی خاوسی لەناو ماڵەکانیاندا دەریان هێنابوون .

ئامر ئینزیبات دارێکی درێژی ئەستور (تێلایەک )ی بەدەستەوەبوو بەتێلاکە بۆیانهات دەستیکرد بە لێدانیان بەسەروچاویاندا وهەموو لەشیاندا ، لەوبەر ژورەکەمانەوە ڕیزیکردن ، هەموو بەترسەوە و دەم وچاوی بزڕکاو و ژاکاوەوە وەستابوون ، سەرسام بوون واقیان وڕمابوو ، لەدەم و چاویاندا ئەخوێندرایەوە کەنازانن لەبەر چی وهۆی چێە بەوشیوەیە هێنراون و لێیان ئەدرێت و ئازار ئەدرێن ،،،؟.

کەلە ژورەکەمانەوە سەیرمانکرد مەلایەکی سەرسپیان لەگەڵبوو لەگەڵ بەڕێز مستەفا عەبدولڕەحیم کاتبی قوتابخانەی دواناوەنی گەورەی کوڕان ، لەگەڵ براکەی کاک سدیق کە پەرستیاربوو.

ئامر ئینزیبات ڕەشید المهداوی ٢٠ بیست سەرباز زیاتری هێنا بەدارو کێبلەوە کردنی بەدو ڕێز بەرامبەر یەکتر ڕێزی سەربازەکان لەوبەرەوەبوو، ڕێزی دووەمیان لەبەر پەنجەرەکەی ئێمەدا بوون، لەڕیزی ئەوسەر دەستیانکرد بەلێدانیان وڕاونانیان، خەڵکەکە لەتاو گیانی خۆیان ڕایانکرد بۆ ئەمبەر، کەگەیشتنە ئاستی پەنجەرەکە لای ئێمە و ڕێزەسەربازەکە، ئەوجا ئەوانیش

دەستیانکرد بە لێدانیان ، خەڵکەکە دیسان لێرەوە لەتاو گیانی خۆیان گەڕانەوە بۆ ئەوسەر، ڕەشید المهداوی لەناوەڕاستدا داری ئەوەشاند، بۆهەرلایەک ڕایانبکردایە ڕێزێک سەربازیکە پەلاماریان ئەدان بەم جۆرە ڕاکردنی ئەمبەرو ئەوبەر دەوامیکرد ، خەڵکە کە ئەکەوتن و هەڵئەسانەوە، و بەسەر یەکدا ئەکەوتن ، هەندیکیان پەکیانکەوت بەتایبەت کاک مستەفا عەبدولڕەحیم کە پیربوو ، بەچاویلکەکەیەوە لەگەڵ مەلاکە کەوتن ، زانیبوویان کە مەڵاکە ناوی مستەفایە جنێوی سوکیان بە بارزانی ئەداو ئەیان وت مەڵا مستەفامان گرتوە، (کەمەلای مزگەوتی حاجی شێخ ئەمین بوو ·نزیک سابونکەران ) ئامر ئینزیبات بەتێڵایەکەوە وەستابوو بەهەوای شانی تێڵای ئەوەشاند ، دوایی کە زۆرهیلاکبوو ئارەقیکردەوە قیژانی بەسەریانداو دەستیکرد بەجنێوی ناشیرین بەخەڵکەکە و بەهەمووکورد وتی : ئێوە ئینسان نین شایانی کوشتنن ، پێم ناڵێن ، کێ ئەو پۆلیسسەی کوشتوە ،،،؟، ئەگەر قسەنەکەن پێم نەڵێن وڕاستی نەلێن لەژێر دارو شەقدا ئەتان ڕژێنم ئەتانکوژم ، لەکاتی قسەکردندا ئارەق بە دەم و چاویدا ئەهاتەخوارێ زۆرهیلاک بوو ، بە زەبری تیلاکەی هەمویانی کۆکردەوە لە بەردەم پەنجەرەکەی ئێمەدا لەولایانەوە وەستا دوایی بەجێی هێشتن بەرەو ژورەکەی چوو وتی ؛ هەتادێمەوە تەدبیری خۆتانبکەن وڕاستی بڵێن .

کەدورکەوتەوە ئێمە لە پەنجەرەوکەوە لەناو ژورەکەوە وتمان کۆڕێنە وریابن هەرچی ئەزانن مەیلێن ، ئەگەر یەک وشەتان درکاند ، وازتان لێناهێنن ، داوای ناوی ترتان لێئەکەن خۆتان ، توشئەبن. ئەزانین ئێوە هەمووتان هیچتان بەم کارە هەڵنەستاون و ئاگاتان لەهیچ نیە .

لەدواییدا زانیمان ئەوبەیانیە زوو خەڵکی لەبەردەم نانەواخانەیەکدا وەستاون بۆ کڕێنی نان کە نانەواخانەکە نزیک مزگەوتی حاجی شێخ ئەمین بووە لەگەل خەڵکەکەدا پۆلیسێک وەستاوە بۆ نانکڕێن سەرەیگرتوە، وەک باسکراوە یەکێک هاتووە نەناسراو چەکی بەدەستەوە بووە تەقەی لە پۆلیسەکە کردوە گوڵلەی ناوە بە سەریەوە و دەربازبووە. پۆلیسەکە لاوێکی ناسراوی ئەوناوەبووە خەڵکی دێی (حاجی مامەند) بوو ، وەک ئەوترا بێوەی بوو ،برایەکی هەبوو تا ئەمرۆژ لەتاپۆ سکاڵانووسە ، وەک لێکدرایەوە کوشتنی ڕەوانەبووە ، لەوانەیە بەهۆیەکی کەوە کۆژرابێت تەقەی لێکرابێت نەک وەک پۆلیسێک وپیاوی میری ، یان بەهۆی دوژمنایەتی وهۆو کرداری ئەوتۆی تر بێت بکوژرێت هەرنەزانراکێ کوشتی و هۆی کوشتنی چێبوو ،،، ؟ ،

لەئەنجامی تەقەکەدا پۆلیسەکە لەبەر نانەواخانەکەدا ئەکەوێت ئەوەی تەقەی لێکردبوو ناسیبووی دوا وشەی ئەوەبووە وتبووی( ئەحمەد کۆشتمی) گیانی دەرچووبوو ، بەزیندویی نەگەیشتبووە خەستەخانە لەڕێگە گیانی دەرچووبوو ، سەربازو ئەمن خێرا فریائەکەون ئەوناوە گەمارۆ ئەدەن ماڵەکانی دەورویشت ئەپشکنن هەرچی پیاوەکانە بەجلی خەوەوە ڕاپێچی

ئینزیباتخانەیـان ئەکەن ، کەئاگایـان لەو رووداوە نەبـووە، ئەچـنە نـاومزگەوتەکەوە مەلای مزگەوتەکە ئەگرن نانەواخانەکە دائەخەن و هەموویان ئەگرن کە خاوەنی نانەواخـانەکە نـاوی (ئەحمەد) بوو.

هەمووگیراوەکان لەسـوچێکدا کـۆمەڵ کرابـوون لەبەردەم ژورەکەی ئـێمەدا کـزۆڵە وئـازاردراو دانیشتبوون و هەڵتروشکابوون ، یەکێکیان هەستایە سەرپێ وتی: کورینە...! بـرایینە، کـێ شتێک لەم بارەیەوە ئەزانێت باهەڵسێت و ڕاستی بڵێت و قسەبکات بائێمە زیاتر بە خـۆڕایی ئازار نەدرێین و ڕزگارمان بێت و وازمان لێبهێنن؟ .

وادەرئەکەوت یەکێک لە گەنجەکان لەوبارەیەوەشتێک بزانێت ، لەبەرچاوی ئەو ئەنجامـدرابێت وکەسێکی دیبێت ،،، یەکێک لە پیاوە پیرەکان بەرەو ژوری ئامر ئینزیبات چوو کە ئەم باسە بگەیەنێت ، سەربازەکان هاتن بۆلایـان ، هەوڵیانـدا یەکێـک قـسەیەک بکـات ، هەمووخۆیـان متکردبوو ، هیچیان نەئەزانی بیڵێن ، ئەوکەسەی کەوتی زانیاریم هەیە خۆی بێدەنگ کردو خۆی ئاشکرانەکرد ، سەربازەکان پیاوە پیرەکەیان لەگەڵ خۆیان بردەژورەوە شلکوتی مەرگیانکرد ، دوایی بەشەق کردیانەدەرەوە، وتیان درۆی لەگەڵکردین، کەسنەبوو ڕاستی بڵێت ، بێگومان وەک دەرکەوت هیچیان ئاگایان لێنەبووە ، دەربارەی ئەو ڕوداوە هیچ نازانن وکەسیان نەدیبوو نەناسیبوو نەیانزانی کێ ئەم کارەی ئەنجامداوە .

لەدوای ئازارو ئەشکەنجەو جنێوی ناشیرین دوانیوەڕۆ کرانەدەروە هەموو بەرەڵلاکران تەنها (ئەحمەد ) ناوێکیـان هێـشتەوە . هەر ئەوڕۆژە چووبـوونە قوتابخـانەی دواناوەنـدی گەورەی سلێمانی هەرچی (ئەحمەد) ناو هەبوو گرتیان کەژمارەیان ٧ حەوت ئەحمەد بوو هێنایانن بۆ ئینزیباتخانە.

دەسـتیانکرد بەلێـدان و ئازاردانیـان و یەکەیەکە ئەیـانبردن بـۆژوری لێکـۆڵینەوە ،هـەمـوو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵکراو و ئازارو ئەشکەنجەدران ، لە ڕاستیدا هیچیان ئاگادار نەبوون هیچیان نەئەزانی و ئاگایان لەم روداوە نەبووە ،هەندێک تاکتێک و هەڕەشەیان بەکارهێنا دژیان ، بەمە بەستی ترساندن و تۆقاندنیان بەڵکو ڕاستی بڵێن دەربارەی کوشتنی پۆلیسەکەوە زانیاری بدەنەدەست ، هیچیان دەستنەکەوت لەدوای ماوەیەک هەندێکیان بەرەڵلاکرد چەند قوتابییەکی دواناوەندیان هێشتەوە ماوەیەک مانەوە و ئازار دران بەڵام تەقەی سـەریـان ئـەهـات هیچیـان نەئەزانی و لە دواییدا ناچار ئەوانیشیان بەردا تەنها حاجی ئەحمەد مایـەوە هیـشتیانەوە کـە خاوەنی نانەوا خانەکەبوو .

{ کاک ئەحمەد کە خاوەنی نانەواخانەکەبوو پیاوێکی گردیلەی بچووک بوو ، پیاوێکی بێوەی بەڕێزو بێدەنگ بوو ، دوربوو لەوەی بەکارێکی واتۆمەت بار بکرێت، ئەولەکاتی ئیشدابوو ، کە

بەربوو دوكانی فرۆشتنی پارچەی ئۆتۆمۆبیلی كردەوە ، لە سەر شەقامی نالی نزیك  فولكە كە ، لەوناوەدا ماوەیەك ژیانی بەسەربرد وەك بیستم لەم ساڵانەی دواییەدا كۆچی دوایی كرد }
لەگەڵ ئەنجامدانی كارەكانیان دژی ئەحمەد ناوەكان و كێشەی كوشتنی پۆلیسەكە ، دوكتۆر سەروەرو ، عوسمان سەعید ، حەبیب محەمەد كەریم ، لەبیر نەكرابوون جار جارەش یادی ئەمینی عەبدەو حەمەی حەمەلاو ئەكرایەوە سەرومڕ خەریكیان بوون لێكۆڵینەوە یان لەگەڵ ئەكردن ئازاریان ئەدان شەوانە تا درەنگ لەگەڵیاندا خەریكبوون بەڵكو زانیاری بدەن بەدەستەوە .



بەڕێز بارزانی  لەدوای گەڕانەوەی لەیەكێتی سۆڤێتەوە سەردانی سلێمانی كرد لەگەڵ لاوانی كوردستاندا ، ئەم وێنە یادگاریەی گرتوە لەوێنەكاندا عەبدولی سوران ، سەڵاح ئەحمەد ، ئەمین میرازا كەریم ، جەمال عومەرمڵۆزم ،حسەڕەشی خەیات ، عومەری محەی قازی ، محەمەدساڵح سەعید، ئەناسرێنەوە .

***



## زەعیم سدیق

## بروسکە دژی شۆڕش و بارزانی

شەو بەرەو درەنگی ئەچوو کاتی نووستن بوو حەوشەکە پربوو لە سەرباز بڵاوبوونەوە و دابەشبوون، زانیمان کە زەعیم سدیق هاتوە ، ئێمەیش هەموو پالکەوتین و خۆمانکرد بەنووستوو بەڵکو نەیەتە ژورەکەمان توشیێ جنێوو لێدان نەبین، لەپڕ دەرگای ژورەکەمان کرایەوە و زەعیم سدیق خۆیکرد بەژوردا، یەکەم شەق کەوەشاندی بەر قادربرسی کەوت (لەبەرئەوەی لەڕیزی نووستوواندا ئەو لە دەرگاکەوە نزیکبوو) لەگەڵ شەقەکەدا نەڕاندی وتی : (گوم) یانی هەڵسە، یەکەیەکە بە شەق ولەقەڕاستیکردینەوە، ڕیزیکردین ، لەگەڵ ڕێزکردندا بەزللە تێمانکەوت، دوایی لەقادربرسی نزیک بووەوە وتی :ئیستا ئەبێت تۆ بەرقیە بنووسیت بۆبەغداد، ئێمە بۆت ڕەوانەئەکەین ، کەنوسرابێت، { مەلا مستەفا عەمیلە وناکر الجمیلە ،،، بنووسە کەئێمە دژی بارزانی و تمردی کوردین، ئێمە لەگەڵ جەمهوریەتین ، ئە کەر ئەمەت نووسی بەرەڵلاتئەکەم} .قادربرسی وەرامیدایەوە وتی؛ ( ئانی مایعروف عەرەبی) یانی من عەرەبی نازانم، من لەتەنیشت قادر برسیەوە ڕاوەستابووم، زەعیم سدیق ڕویکردە من شەقییێکیدا لەبەر ئەژنۆم و زللەیەکی لێدام وتی: (تعال انت ترجم لە) یانی وەرە تۆ بۆی تەرجومەبکە، یەکەمجار چی بەکاک قادر وت لەگەڵ مندا دوبارەیکردەوە وتی ئەمەی پێی بڵێ، منیش ڕستەبەڕستە بۆم کرد بەکوردی وئەم وتەوە ( دواجار وتم کاک قادر ئەڵێت: ئەبێت تۆبەرقیە و بنووسیت دژی بارزانی و بڵێیت کەعەمیلەو ناکر الجەمیلەو دژی جەمهوریەتەو لەگەڵی نین ودژی هەڵگەڕانوەی کوردین) کاک قادر پەشۆکابوو بەهەردو دەستی چاویلکەکەی گرتبوو دایئەگرت و ئەیکردەوە چاوی، منیش وتم ئەلێت دوای بەرقیەکە بەرەڵلات ئەکەین ، کاک قادر لەبەر شلەژان و پەشۆکاویەوە خۆی ڕانەگرت هەلیدایەو وبەعەرەبی وتی ( ئانی مایگدەر یسەوی بەرقیە

زد ملا مستەفا، پێشمەرگە یقتلونا) یانی ناتوام بەرقیەبکەم دژی بارزانی پێشمەرگە ئەمانکوژێت، زەعیم سدیق بەم قسەیە یەکجار شێت و شێتگیربوو تورەبوو دەستیکرد بەلێدان وجنێودانی و نەراندی و وتی (سارلک ساعه تگول ثانی ماعرف عربی ، وتجاوبنی بالعربی )؟ یانی سەعاتێکە تۆ ئەلێیت عەرەبی نازانم کەچی بەعەرەبی وەرام ئەدەیتەوە ، بەهۆی لێدانەکەیەوە ، قادربرسی چاپلکەکەی لێکەوت ، وتی: (بێگ های عەرەبی ) یانی ئەوەعەرەبیە من قسەی پێئەکەم، زەعیم سدیق شێتانە هاواری ئەکرد و جنێوی ئەداو لێیَ ئەدا وتی:

اذا هاذا مو عرەبی،لەعەد هذا فەرەنسی) یانی ئەوە عەرەبی نەبوو،ئەی فەرنسیبوو.! ؟ دوبارەیکردەوە (بۆچی ئەمە ئەگەر عەرەبینەبوو، ئەی چیبوو؟ . لەقادر دورکەوتەوە وازی لێهێناو لەئەنوەر دارتاش نزیکبووەوە لەگەڵ کاک ئەنوەر هەرهەمان قسەی پێشوی دوبارەکردەوە،وتی بەیانی بەرەڵلات ئەکەم ئەگەر بڵێیت من لەگەڵ میریم و دژی بارزانیم ، ئەو یاخی بووە ، پیاوی بیگانەیە و لەگەڵ تە مەڕودی کوردیدانیم .

کاک ئەنوەر دارتاش تۆزێک وەستاو بە (عەرەبی ) وەرامی دایەوە وتی (ئێمە ئیستا لەبەردەستی ئێوەداین و لای ئێوە ئەمانەتین وەک بارمتەواین ، لەئینزیباتخانە حەپسین ، ئەگەر ئێمە بەرقیە لێبدەین و بنووسین، کەس باوەرناکات ، ئەلێن ئەوە بەزۆر پێیانکراوە ، هەر بەزۆریش یان هەرخۆتان بەناوی ئێمەوە بنووسن بینێرن کەس باوەڕناکات ، لە ئەنجامدا بە خائینمان دائەنێن بەرامبەر میللەتەکەمان ،ئیتر بە رەللاکردنمان چی سودێکی ئەمێنێت وهەیەتی چونکی نرخ و پاداشتی بەربوونمان کوشتنە لەدەرەوە .

وەک چەندجار باسکرا زەعیم سدیق ئەفسەرێکی بێمێشک و کەللەڕەق وتوڕەو بێمستەوابوو ، قسەنەزانبوو، وەرامی کاک ئەنوەری دایەوە وتی ؛ ( کیَ ئەتوانێت بتانکوژێت ، هەموویان لەناو ئەبەم، ئەوەنیە من رۆژانە بەجادەکاندا ئەسوڕێمەوە، بۆ کەس حەدی هەیە وبتوانێت ، بوێرێت سەیریشم بکات، تا ئەمڕۆ کەس نەی توانیوە لەڕێگەمدا بووەستێت ، بمکوژێت؟) .

ئەنوەر وەرامی دایەوە ( تۆ کە ئەڕۆیت کۆمەڵیک سەربازت لەگەڵەو "" مودەرەعە "" بەدواتەوەیە حیمایەت ئەکەن ، ئەی ئێمەکیَ حیمایەمان بکات ،،،؟ )، ئیتر زەعیم سدیق بێدەنگ بوو وەرامی نەدایەوە، یان نەیزانی چۆن وەرامی باتەوە ، رویکردە جەوهەر سدیق شاوەیس وتی : تۆ ئیستا ئەنووسیت (بارزانی متمردو عەمیلە )، کاک جەوهەر بێدەنگ بوو وەرامی نەدایەوە، دوای ئەمە پەنجەی ڕاکێشا بۆچەند کەسێکمان دەستنیشانیکرد بۆ سەربازەکان ، کە بمان هێنن بۆژورەکەی خۆی، بەو ئەفسەرەی وت کە لە گەڵی بوو وتی (ئەمانە بهێنە بۆژورەکەم) کەبریتیبوون لە ئەنوەر دارتاش، جەوهەر سدیق، من ، محەمەد باقی سەعید ، قادربرسی، خێرا چووە دەرەوە .

سەربازەکان خێرا ئێمەیان پێش خۆیاندا ، لەبەردەرگای ژورەکامانەوە ئەم بەرو ئەوبەر ریزبووبوون ، بەناو ریزەکەدا ئێمەیان برد تاگەیشتینە ژوری ئامر ئینزیبات لە هەردو لاوە بە زللەو شەق ودارو کێبڵ بەلێدانمانەوە خەریکبوون، لەم بەرو ئەوبەر بۆ یەکتریان ئەسەندەوە ، ئێمەش ئەکەوتین و هەڵئەساینەوە، لەتاوگیانی خۆمان رامانئەکرد تالەژوری ئامر ئینزیبات گیرساینەوە، دیمان زەعیم سدیق دانیشتوە رەشید المهداوی لەولاوە راوەستاوە ، بەرەشێد مەهداوی وت : یەکی قەڵەمێک و پارچەکاغەزێکیان بدەرێ، با هەر ئێستا بۆ بەغداد بروسکە بنووسن (ئیعلانی تایید و پشتگیری جەمهوریەت بکەن ودژی عەمالەت وخیانەتی بارزانی بنووسن)، ماوەیەک ماینەوە کەس قەڵەمی نەهێنا بەسەر کاغەزدا دوایی زەعێم سدیق بێزار بوو تاقەتی چوو هەر بەردەوام بە سەرمانەوە وەستابوون ساتە نەساتێک زللەیان لێئەداین.

زەعیم سدیق وادیاربوو تاقەتی چوو بێزاربوو لەبەر ملنەدانی ئێمە هەموو کارەکە بێسودمایەوە و بۆی نەچووەسەرو سەرنەکەوت }لەوکاتەدا {ئێمە مردنمان لاپەسەند تربوو لەوەی بەرقیە بنووسین دژی شۆڕش و بارزانی } . وەک مەسەلە کوردیەکە ئەڵێت: شەقێکی لە کونی خۆی داو، هەڵساو بەجێی هێشتین و بەپێوە بە ئامر ئینزیباتی وت : ئەمانە بابرۆنەوە بۆژورەکانیان، بەیانی با بەرقیە بنووسن، پەنجەی راکێشا بۆ جەوهەر شاوەیس وتی بائەم لێرەبێت ، بمێنێتەوە بابروسکە بنووسێت، هەریەکە پارچەیەک کاغەزو قەڵەم بەدەستەوە بەلێدان بەرێیان کردین بۆ ژورەکەمان.

لە نیوە شەودا کاک جەوهەریان هێنایەوە بەبێهۆشی هەمووسنگیان هەمیسان بەجگەرەسوتاندبوو .

لەدواییدا زانیمان کەئەمن و ئیستیخبارات کەوتبوونە ناوشار لە شوێنە فەرمیەکان وقوتابخانەکاندا و ناوخەڵکی بۆناردن و نووسینی بروسکە بەزۆر بەناوی (بەرقیەی ئیستنکار، دژی شۆڕشی ئەیلول و سەرۆک بارزانی ، وبۆپشتگیری میری ) لەگەڵ دەستپێکردنی هەڵمەتی هەوڵدان بۆ ناردنی بروسکە دژی شۆڕش وسەرکردایەتی شۆڕش بۆجێبەجێکردنی ئەم داواکاریەو ئالیشەیە وهەڵمەتە کەوتنە ناوخەڵکی و بەهەڕەشەوە وتبوویان هەرچی بروسکە نەنێرێت لەکارەکەی دەری ئەکەین و ئەگیرێت، زۆر لە خەڵکی بەرامبەری وەستابوون و خەڵکیان هاندابوو دژی بووەستن ، بروسکە نەنێرن ، لەئەنجامدا زۆرکەس گیرابوون و ئازار درابوون بەڵام نەیان هێنابوون بۆلای ئێمە لەئینزیباتخانە ، دیارە لە شوێنی تایبەتی کە بەند کرابوون کەبۆ ئەو مەبەستە ئامادەکرابوو . برادەرانی حیزبی شێوعی هەڵوێستێکی ڕاست و مەبدەئیان هەبوو بەرانبەری وەک بیستمان مامۆستایەکی عەرەبی شیوعی کەناوی (ئەزهەر) لە دواناوەندی کشت وکاڵی بەکرەجۆ مودەرس بوو ، دژی وەستابوو بەرقیەی نەنووسیبوو ، هەروەها مامۆستا

(محەمەد ئەمین حەسەن ) کەئەویش شیوعی بوو کەپیاوێکی خاوەن بڕوای بەتین و ڕەوشت بەرزبوو، دژی وەساتابوو خەڵکی هاندابوو کە نابێت بروسکە بنووسن ، بەوهۆیەوەگیرابوو . هەروەها زۆر کەسایەتی کە سەر بەپارتی وەک بەڕێز( مەحمودی مەلا عیزەت) وشـیۆعی و بێلایەن بوون دژی هەڵوێستیان وەرگرتبوو وکەسانی کە زۆربوون لێرەدا تەنها ئاماژەم بەهەندێک ناوکرد، لێرەدامن ناتوانم ناویان بنووسم کە زۆربوون ، ناویانم لە بیر نەماوە و هەموو ناوەکانم دەستنەکەوتوە، کەلە وکاتەدا ئێمە بەندبووین . لەگەل ئەوەشدا هەبووە بەناچاری لە ترسی نانبڕین وگرتن بروسکەیان لێدابوو کەکەم بوون، ئێمەدوای بەربوونمان ئەم خەبەرانەمان بەرگوێ کەوت.

بۆبەیانی نامەمان ئامادەکردبوو بۆ کاک ئەحمەد دەربارەی روداوەکانی شەو، هەوڵی زەعیم سدیق بۆ نووسینی بەرقیە دژی شۆڕش و بارزانی هەموو بەڕاشکاوی ڕاست ودروست نووسیمان دەربارەی هەموو ژورەکان نووسیبوومان ،هەرجارێکیش بەشێ شیۆعیەکان هەواڵمان ئەناردە دەروە تەنسیق و هاوکاری هەبوو لە نێواندا .

بەشی بەیانی زەعیم سدیق هاتەوە بۆ ئینزیباتخانە هاتەوە ناو ژورەکـەمـان ، دەسـتیکردەوە بەلێدان و جنێودان پێمان بەڵام بیری نەبوو باسی ناردنی بەرقیەبکات یان خۆی لێ گێلئەکرد ، هەرساتە ناساتێک ڕەشید الهداوی بیری ئەخستەوە ئەیوت :

(سەیدی ذۆلە مادازین برقیە) یانی گەوەرەم ئەمانە بەرقیەیان نەناردوە وەک بۆمانـدەرکەوت زەعیم سدیق نەیئەویست گوێی لەم قسەیەبێت، گوێی نەئەدایە ئەیویست لە بیری خۆی بباتەوە، ناچار لە دواییدا پێیوت تۆ پێیان بنووسە، دوایی ئەم کارە بێسود مایەوە سەرنەکوتن ئـێمە مردنمان لاپەسەند تربوو لە ناردنی بەرقیە دژی شۆڕشی ئەیلول و سەرکردایەتی بارزانی ئیتر ئەم هەوڵە بووە بیروکاری رۆژانەی ڕەشید المهداوی لێدان و جنێوی ڕۆژانەی لەگەڵمان سودی نەبوو ، سەرکەوتین ناچار وازیان هێنا، شەرمەزاری بو ڕەشید المهـداوی مـایەوە، کە لێـدانی بروسکەی کردبووە بیانوو داری دەستی بۆ لێدان و ئازاردان و جنێوی ناشێرین پێمان هەردەم دوبارەی ئەکردەوە تادوایی خاو بووەوە ناچار وازی لێهێنا .

ساڵی نوێی ١٩٦٣ هات لەدوای چەند رۆژێک وردە وردە خاو بوونەوە لێـدان و ئـازاردان کەم بوونەوە بارودۆخی ئینزیباتخانە بەرەو هێمنی ئەچوو پشویەکمان پیاهاتەوە.

لە ورۆژانە بەدواوە ئەمنەکانمان نەئەدی کە بێن بۆ ئینزیباتخانە لێکۆڵێنەوەبکەن بە ئارەزوی خۆیان خەڵکی بەرن بۆ لێدان و ڕاکێشان و ئەشکەنجەدان ، کاری ئینزیباتخانە هاتە سەرئەوە کەیەکێک بگیرایە تێر لێدانی ئەخوارەدو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئەکراو بۆ شەو بەڕەللا ئەکران

یان ئەبران بۆ شوێنانی کە بەبەندکراوی، کەسیان نەئەهێشتەوە لە لای ئێمە لە ژورەکانماندا تەنها ئێمەبووین . لەوە ئەچوو فرمانێک ئاگاداریەکی تازەیان پێگەیشتبێت لەوڕوانەوە .



بەڕێز مەحمود مەلا عیزەت ، لەگەڵ کۆمەڵێکی ئازاو بەرگەگر بروسکەی لێنەدا

## گۆرەوی بازی ونوکتەی خۆش

کاتێک باری ئینزیباتخانەو لیدان وئازاردان ولێکۆڵینەوە لەسەرمان کەمبووەو ، کاتەکانی خۆمان کردە هەلێک بۆ گێرانەوەی قسەی خۆش وبەسەرهات ونوکتەی خۆش، کەش و هەوایەکی هێمنی و دڵنیایی خۆی کێشابە سەرمانداو ،هەر یەکە بەپێی تواناو لێهاتوویی وزانیاری بەتایبەت قادربرسی و کشمیش لەگەڵ کاک ئەنوەرو جەوهەرشاوەیس نوکتەو قسەی خۆشیان ئەکرد.

شەوێکیان کات بەرەو درەنگی ئەچوو ئیمەیش حەزمانکرد گۆرەوی بازی بکەین لە بەر تروسکایی گڵۆپەکانی ناو حەوشەکە و چاویشمان ڕاهاتبوو بەتاریکی ، وەک شەمشەمە کوێرەمان لێهاتبوو لەوکاتەدا بە پێکەنین وياريەوە خەریکبووین ، نەمانزانی کەئامر ئینزیبات خۆیگرتەوە ، لەپڕ خۆیکرد بەژوردا بینی گۆرەوی بازی ئەکەین وتی : ( شنوهای تلعبون محێبس) یانی گۆرەویبازی (ئەموستیلەبازی) ئەکەن،ماڵی بەتەپڵێسەری خۆیدا وتی : بەڕاستی ئێوە بێعارن ئەم هەموو لێدانە ئەخۆن کەچی پەند وەرناگرن وکارتان تێناکات ، ئەوشەوە نەندوریان بۆمان داخست (بگرەو بکوتە) دەستیپێکرد بەلێدان وئازار دانمان هەتاتوانیان لییانداین، بەلێدان کراینە خەو .

وەک باسکرا ئازاردان و لێدان لێکۆلینەوە و لێپرسینەوە کە مبووەوە هەر لە بیر چووینەوە جاریوا هەبوو ئەچوینە دەروە سەربازەکان گوێیان نەئەدا وپەلاماریان نەئەداین لێمانبدەن ، هەندێکیان وەک ناسیاویان لێهاتبوو، کاک ڕەئوفیش بەشی ڕۆژانەی هەبوو لە نوقڵی ترش

وشێرین و ئەمانتوانی لەگەڵ ژورەکەی بەرامبەرمان بە ئارەزو سەربەست قسەبکەین لەکاتی چوونە دەرەوەدا لەگەڵیان ڕائەوەستاین

ژوری بەرامبەرمان ژوری حەمە ڕەشید ئەحەشانە زۆرترینیان لەلاوانی پێشمەرگە پێکهاتبوو ، ژورەکانی کە بەتایبەت ژوری عەلی ئیبراهیم دەروێش دوربوون لە ئێمەوە کەمتر ئەماندین .

## ژمارەی بەندکراوان کەم بوونەوە

لەژورەکەمان حەمەی حاجی فەرەج لەگەڵ ڕەئوفی برای بەربوون کەمالی کوڕیان مایەوە ڕەحیم ئوچقارداش بەربوو ، لەسێوکانیەکان تەنها ڕەسوڵ سیوکانی مایەوە . حەمەی لالە ئەمین و تۆفیقی کەریم خان لەوەپێش بەربوون لەگەڵ چەندکەسێکی کە .

دوکتۆر سەروەری دەروێش کەریم لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم بران بۆ بەغداد ، کاک جەوهەر سدیق شاوەیس نەمان زانی بۆ کوێ برا ،

[ لە ساڵی ١٩٩٩دا کاتێک لەشاری (لایبزیکی ئەڵمانیا )بووم دیمەوە باسیکرد وتی منیان برد بۆ بەغداد لەوێ زۆر ئازار درام دوایی گوێزرامەوە بۆ (نوگرەت سەلمان ) ماوەیەکی زۆر لەوێبووم کەڕزگاربووم عێراقم بەجێهێشت بەرەو ئەڵمانیای ڕۆژ هەڵات چووم ماوەیەک لەوێمامەوە دەستم کرد بەخوێندن گەیشتمە ئەوئاستەی بتوانم دوکتۆرا وەربگرم وتی بەکاری (تەرجومەوە) وەرگێڕانەوە خەریکم ، دیم هاوسەرگیری کردوە و خێزانەکەی خەڵکی سلێمانیەو کۆڕێکیان هەیە ، هەتا لەوێبووم بەردەوام سەردانم ئەکردن .

# خێزان وخزمان هاتن بۆ بینینمان

بەیانیەکی زو هاتنە ژورەکەمان پێیان ڕاگەیاندین وتیان خۆتان ڕێک وپێکبکەن ئامادەبن، لەگەڵ خۆیان گوێزانی تراشیان هێنابوو کەهەر یەکەمان ڕێشی بتاشێت ودەم وچاوی بشوات . لەدواییدا وتیان ئەمرۆ پێشوازی کەس وکارتان ئەکەن دین بۆ بینینتان، دەمەو نیوەرۆبوو یەکە یەکە بانگئەکراین بۆ ناوەڕاستی حەوشەکە ، دائەنیشتین چاوەڕوانی کەس وکارمان ئەکرد کە بێنەژورەوە کە ئەهاتن ماوەیەکلە گەڵیان دائەنیشتین ، لەگەڵ هەموو خێزانەکاندا ئەبوایە کاکە (حەمەڕەئوف) بەسەرمانەوە بووەستایە لە ناوەراستماند دابنیشتایە ،بۆ ئەوەی نەهێڵێت ، باسی هیچ بکەین ونهێنیەک بدرکێنین هەرساتە نەساتێک دارەکەی ڕائەوەشاند و ڕاستی ئەکردەو ، هەڕەشەی لێئەکردین کە قسەنەکەین .[ لەوکاتەدا کەگیرام من لەماڵەکەدا تەنهاکەس بووم کەئیشبکەم مووچەخۆری میریبم، پەیداکەری بژێنی بووم بۆئەندامانی خێزانەکەبم، چەند ساڵبوو باوکم لەسەرجێگە کەوتبوو پەکی کەوتبوو گیانی ئەلەرزی بەرێی دوکتۆرو دەرمانی هەمیشەییەوە بووین، عوسمانی برام لەئەڵمانیا بوو نێررابوو بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی بەرز، ئەیخوێند ، تاکەخوشکم لەماڵدا کەمابوو لە (پەیمانگەی هونەری ناومال ) قوتابیبوو ، کە تەنها بژێوو یارمەتی دەریان هەرمن بووم ، ئەرکی خێزانی هەمووی بەسەر منەوەبوو ،پێش گرتنم بەحال فریائەکەوتم یارمەتیان بدەم، کاتێک خێزان وخزمان هاتن بۆ پێشوازی و بینینم ، دایکم وتی: کۆڕم باری ژیان و درامەتمان زۆر خراپەو یارمەتی دەرمان نیە ، تۆیش لێرە توند کراویت، کە تۆ بەتەنها تاکە هۆی بژێوی و ژیانمان بوویت چیبکەین باشە؟ ]

وتم دایە گیان ، جاریێ پارەی کرێخانوو مەدەن .ئەوەی بەنرخەو زور پێویست نیە وردە وردە بیفرۆشن و بیخۆن ئیتر خواگەورەیە تاخوا دەروویەکمان لێئکاتەوە .

چاوەڕوانبین بزانین سبەینێ چی بەدوایدا دێت وڕوئەدات ،وتی کورم تۆ خەمت نەبێت بێبەشت ناکەین ڕۆژانە چی لەتوانادا هەبێت خوابیدات ، خواردنی رۆژانەت بۆ ئامادەئەکەین وئەیهێنین .

هەرچەندە ویستمان باسی باری خۆمان و کەسوکارو باسی شاربکەین حەمە ڕەئوف نەی ئەهێشت بەڕاستی ئیهانەیک بوو ئەکرایە سەرمان لە لایەن ئەم فیرنەگولە پیسەوە، ئەگەر عەرەبێکیان دابنایە بەچاودێر لە بەینماندا بڕواناکەم وەک حەمەڕەئوف ڕەفتاری واناشیرینی هەبووایە و بیکردایە دژمان هەر خراپەیەکی بکردایە لە گەڵمان ئەمان وت: کوردنیەو عەرەبەو دوژمنە ، ئەگەر قسەیش بکەین لەوانەیە تینەگات، ئەی کوردەکە؟. لەبەرئەوە بەچاو و بەئیشارەت هەندێک هەواڵمان وەرگرت .

***

# زۆرجار هەڵوێست ودڵسۆزی
# لەڕێزی ڕێکخستندا دوژمنایتی دروست ئەکات

زۆرجار کارکردن وهەڵسوڕاندنی کار لەڕێکخستنەکاندا بەدڵسۆزی و پاکی ڕاستگۆیی وچالاکی وچاو نەپۆشـێن لەهەڵەو و کـاری خـراپ وڕواوڕو بـوونەوە و بـەرامبـەری بۆڕاسـتکردنەوەی هەرچەوتیەک.

پیاو وایلێدێت کە لەگەڵ کەسانی هاو کارو هەڤاڵان و لەناو ڕێزەکاندا تۆشی بەرامـبەری ڕواو ڕوبوونەوەی زبر ببێت وتوشی دەمەقاڵی ببێت، ئەگەر بەرامبەرەکەش هەر وەکو تۆ هەڵگـری هەمان بیرو باوەڕبێت ولەبواری کارەکاندا لەگەڵیشدابێت.

بەڵام هەموو مرۆڤێک ئاستی کۆمەڵایەتی و تێگەیشتن و زانیاری وهەلسەنگاندن ودەمـارگیری وهەستی دەرونی و ئاستی بیر کردنەوەیان وەک یەک نیە، زۆرجار کەسانی واهەن کەئامادەنین ڕاستی بسەلمێنن و لەکاتی دوان وباسکردن ورونکردنەوەدا ، دان بەهەڵەی خۆیاندابنێن ، لە ئەنجامدا لەدەرون ودلیاندا جۆرەکینەیەک ودڵگرانی و بەرامبەریەیەک دروستئەبێت وەک تێبینی لەسەریەکتری بەردەوام ئەبیت. جارهەیە لەپەیوەندیەکانیاندا لەگەڵ یەکتـر رەنگئەداتەوە ، هەڵوێستی ساردی و دوژمنانەی لێئەکەوێتەوە.

کەسێک پرسیائەکات، یاران تۆبڵیی، بەهۆی دڵسۆزی وپـاکی وخەم خـۆری وچـالاکی وکـاری سەرومڕەوە و هەوڵـدان بۆڕاسـتکردنەوەی هەڵە ...! بـەوهۆیانـەوە بـۆچی کـەسێک تـوشـی گیروگرفت وناحەزی وبەرامبەری ببیتەوە؟ جاری واهەیە یان زۆرجار پێویستە ئەرکی سەرشانی بەڕاستی ودروستی جێبەجێبکرێت ، ئەبێت لە پرانسیپی ڕێکخستندا چاوپۆشی لەهەڵە نەکرێت ، بێ موجامەلە ورێک و ڕەوان حەدیبێت ، بەهۆی ئەم هەڵوێستەوە کەپێوستەو حەقەو ڕاستە ، بەرامبەرەکەت ئەوەی لێپرسینەوە وئاڕاستەکردن ئەیگرێتەوە (کەهەردوکیان یەک ئاست وپلەیان هەیە لە ڕێکخستنەکاندا ) ، دلگیرئەبێـت چـونکی ئامـادەنیە دان بە ڕاسـتیدابنێت، هەمـووی لەئەنجـامی خۆویـستن و خـۆ بەزل زانـین وشـێوەی پـەروەردەی وکاریگـەری دەوربـەری لەسەرژیانی وبیری تاکڕەوی هاتوە ، ئەوکەسە ڕانەهاتوە لەسەر بیری دیموکراتی ، نەزانە بڕوای بەتوندو تیژیە بەرژەوەندی تایبەت مەندی خۆی لەلامەبەست ترە لە بەرژەوەنـدی نەتەوەکەی (کە ئەم دیاردەیە لەدڵ و دەرون و بیریدا شاراوەیـە یـان شـاردویەتیـەوە )بەم هۆیـانەوەیە هەڵوێستی بەرامبەری ودوژمنانە وەرئەگرێت ، توشی بگرەو بەردەت ئەکات ،کەئەمە دیاردەیەکی دەرونی کۆمەڵایتیە ، ئەوجۆرە کەسانە گیانی هەلپەرستی تیایاندا زوو گەشەئەکات یان گەشەی

کردوه شاراوەیە ، ئەگەر ئەوکەسانە سەرکەوتن یان چمکێکی حەکمیان گرتەدەست، بەوریایی دەبنە مۆرانەی ناوکۆمەل ورێکخستن، هەمووی ئەگونجێنن لەگەل مەبەست و ئارەزوو خواست حەزیخۆیان و خەریکی گیرفان پرکردن ئەبن و ئەبنە نەخۆشیەکی چارەنەکراوی ناو کۆمەڵ وگەلدا. تۆڵەی کۆنی خۆیان ئەکەنەوە زۆرجاریش ئەگەر ئەم دڵگیری وناحەزیە پەرە بسێنێت ئەبێتە هۆی دروستبوونی تەکەتول لەناو حیزبداو ڕەنگدانەوەی دوبەرەکی و جیابوونەوەی لێئەکەوێتەوە .

ئەوانەی توشی خۆویستن وتاکڕەوی وکینەی درێژەخایەن ئەبن دڵسۆزان وکوردپەروەران ودڵپاکان ناچارو بێچارەن ، لەئاستیاندا یان کەسانی ئەوتۆهەن ڕەگی خراپەو نامەردی و ناپاکیان تیایەو زۆریان دزەئەکەنە ناو پارتەکان و کۆمەڵی دڵسۆزو پاکەوە ،مەبەست و ئامانجی گڵاویان ئەهێننە دی بە وریایی وبە لەبلەبانی و کرداری ئەوتۆ لەبەرگێکی دڵسۆزیداو لەبنەوە ئەبنە ئاگری بنکای کۆن ومیکرۆبێکی ناو کۆمەڵ وڕێزی گەڵ تێکئەدەن .

ئەبێت وریابین بەعەقڵانیەت بەرەوڕوی ئەم دیاردانە ببینەوە ، بەتایبەت ئەگەر ئەم ڕەفتارو کارانە و برامبەریەو ڕوبەڕوبوونەوەیە لەشوێنێکی داخراوی وەک ( بەندیخانە )دا سەرهەڵبدات هەمووساتێک بەزەقی دەرئەکەوێت ، کەهەموو لەبارێکی دەرونی و نائومێدی وتوندوتیژی وئازارو ئەشکەنجە و مەینەتیدا ئەژین، کەهەموو ڕۆژێک هەر ئەو دەم و چاوانە لەبەردەمیاندایەوە بەرامبەرین ، ڕۆژانە ئەم دیادەیە دوبارە ئەبێتەوە گۆڕانێکی تیابەدی ناکرێت کەسێک بێزارئەکات، بێ هویەک و هەرلەدڵیەوە رقی لەبەرامبەرەکەی هەڵئەسێت ئەنجامەکەی لەوانەیە، شەروناخۆشی لێبکەوێتەوە.

هەموو ئەوانەی لە ئینزیباتخانەدا گیرابوون رۆڵەی بەئەمەکی ئەم گەلەو لەڕێکخستنەکانی پێشمەرگەو پارتی و ناوندی پیشکەوتنخواز و ڕۆڵەی گەلەکەمانبوون .

ئەبوایە زۆر وریابین بەتەنگ بارەکەوەبین ، بەر بەرژەوەندی گشتی ڕەچاو بکەین بەدڵسۆزی وبۆ پاراستنی کەسانی کەی دەروە کە لەڕێکخستنەکاندا لەگەڵماندابوون ، ئەرک وفرمانی سەرشانمانبوو. مەبەست لەناردنی نامەکانمان ، فریاکەوتنی لیژنەکان و پاراستنی نهێنی ریکخستنی ریزەکانی شۆرش بوو. زۆر هەوڵماندا تاکەسانی کە راپێچی ئینزیباتخانە نەکرێن و بەدەردی ئێمە نەبرێن .

بەهۆی ئەم دیارەدەو تێبینیانەوە، ئەبوایە مەنجبوربین ڕۆژانە نامە بنووسین بینێرین ، ڕێکخستنەکانی دەرەوەی بەندیخانە ئاگاداربکەینەوە، بەڕاستی دروستی وەکخویان وشەبەوشە،چی ڕویداوە بینێرین .ناوی کێ هاتوەلەلێکۆڵینەوەدا بائاگادار بکرێتەوە فریای خۆی بکەوێت .

ئەم کارانەی زۆرەکەی ئێمە وای لە هەندێک لە هەڤاڵان و برادەرانمان کرد دژمان هەڵوێست وەربگرن ، دواییش بکەوێنە بەر شاڵاوی قسەو قسە لۆک وبەرامبەری و ناحەزی دژمان و دوژمنایەتیان، ئەم ڕەنگدانەوەیە بەوەوە نەوەستا لە ساڵەکانی دواییدا بوونە هۆی ئەوەی تووشێ قسەو قسەلۆک و تۆمەتی نارەواو ڕاونان و ئازاروگرتن ببینەوە تابەرەو ڕوی کۆشتنیش ببینەوە .

ئەگەر ئەم باس ورِوداوانە لای خەڵکی ڕوون و ئاشکراو دیارنەبن ، بەڵام ئێمە بەرەوڕوی بوینەوە پێوەی تلاینەوە ئازارمان چێشت مەترسی هەبوو لەسەرمان، حیزبەکانیشی تارادەیەک توشی خۆشباوەڕێکرد لەوبارەیەوە ، لای ئێمە بەڵگەی ساغکراوە هەیە دەربارەی هەنگاوی دوژمنایەتیان دژمان ، کەزۆری ئەوکەسانە تائەمڕۆ ماون ، کەئاگایان لێیبووە دیویانە و لەبەرچاویان کاری دوژمنانە دژمان رویداوە وئەنجامدراوە . ماوەیەکی زۆر پێوەی ناڵاندومانە و تاڵاویمان چێشتوە ، هەر ئاسەواری بەدوامانەوەبووە .

ئەو چەندکەسە زۆرجار کە بەکارو کردەوەو هەنگاوی خۆماندا ئەچووینەوەو تاوتوێمان ئەکرد ئەمان وت : یاران ،،، ئەبێت ئێمە خراپەی چیمان هەبووبێت ،،، یان کردبێت ،،، تاتوشی ئەم هەموو بەرامبەری کارە دوژمنانە ببینەوە ؟ ، ئایارەوایە وشیاوە ؟ .

لەئەنجامی کارو خەبات و شەونخونی لەوبارە مەترسیە دا بۆسەر ژیانمان لەکاردابووین و کۆڵمان نەداوە ، کەجاری واهەبووە گیانمان لە سەر دەستمانبووە ، بۆ ئەنجامدانی پێویستی وئەرکەکانی سەرشانمان وەک مەسەلە کوردیەکە ئەڵێت (لەمردن گرمان ئەخوارد ) ئەگەر نامەیەکیان بگرتایە بەوهۆیەوە سەرمان تیائەچوو .

ئاياشیاوە لەو یاداشتەدا ئەمڕۆ لە لایەن رۆڵەکانی میللەتەکەمانەوە تووشی ئەوگیرو گرفت و کارە دوژمنانەو ناهەمواریانە ببین و پییان بتلێینەوە . هەرلە بەر ئەوەی ڕاست و دروست ڕوداوی ڕاستیمان نووسیوە چاو پۆشێمان لەهەڵەنەکردوە کە باسکردن و دەرخستنی هەڵەکان بۆ بەرژەوەندی شۆڕش و نەتەوەکەمان بووە ، بۆ پاراسستنی کەسانێک بووە نەک بگیرێن بافریابکەوین ، بەرژەوەندی خۆمانی تیا نەبووە.

من ئەگەر رۆژێک بتوانم یاداشتێک بنووسمەوە ، دەربارەی کارەکانمان لەریزەکانی ڕێکخستنەکانی کوردایەتیدا ئەوەی من ئاگام لێیبووە دەورم هەبووە ، هەڵبەت ئەوسا بەڕاشکاوی ئاماژە بۆ ئەو هەموو کارو رەفتارە دوژمنایەتیانە ئەکەم کەچوار جار تووشی ڕوداوی کوشتن بوومەتەوە بەڵگەی تەواو وکەسان هەن کە هەموو ئاگایان لێیبووە لەبەرچاویان دژم هەوڵی ئەنجامدانیکراوە ، زۆریان لەژیاندا ماون .

ئەزانم ئەوەی کەمن و هاوڕێکانم بەدرێژایی ژیانمان بەسەرمانهاتووە ، دوای بەربوون وتوشیبووین ، تەنهابەسەرهاتی ئێمە نیە هی هەموو کەسێکێکی دڵسۆزو خەباتکەریکە دێتەڕێی و بەسەریدێت ، کەدڵ وگیان وهەموو بیرو وزەوکاری ڕۆژانەی بخاتەگەڕ لەپێناو خەباتی ڕاست و دروستی کوردایەتیدا ، ئەزموونێکە بۆ ئەکەسەی کە لەکەس سڵنەکاتەوە و ڕێک و ڕەوان و دروست بێمەجامەلەی خۆڕایی وشاردنەوەی ڕاستی و ( بێمامە حەمەیی کردن ) و (حەددی ) بێ ڕیاکردن بەچاک بڵێت چاک و بە خراپ بلێت خراپ ، چەوتی قبوڵنەکات موجامەلە وچاوپۆشی نەمێنێت . لەناو کۆمەڵدا هەرکەسێک بەپێی دڵسۆزی و خزمەتگوزاری ونیشتمان پەروەری وچاکی ڕەفتاری لەگەڵبکرێت و ڕێزی لێبگیرێت .

ئەگەر بەپێچەوانەوە بێت ،ئەبێت هەڵوێستی لەسەری وەربگرن .

ئەو جۆرەکەسە دڵسۆزانە وبەو مەرجانەوە کەمن ، زووتوشی بەرامبەری و کاری دوژمنانە ئەبنەوە و توشی گیروگرفتی ژیان ئەبنەوە وبەدناو ئەبن و ئەکرێن ، لەکۆمەڵێکی دواکەوتوی ڕۆژهەڵاتیدا کەم کەس هەیە کەهەموو لێی ڕازیبن ، ئەم بیرۆکەو دیاردەیە ، کاری دیپلۆماسی و زیرەکی کۆمەڵایەتی ئەوێت و زۆرجاریش کەسێک مەجبوور ئەبێت پێ لەویژدان و ڕاستی بنێت خۆی بگونجێنێت ، زەمانە کاری تێئەکات یان ڕەشبین ئەبێت ، لەکاریگەریەکانی دوارۆژی و مەترسیەکانی ئەسڵەمێتەوە ، دوای ئەوەی ئەنجامە خراپەکان بەرەو ڕویئەبێتەوە ، ئەوەستیت .

لەکۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتیدا ئەم دیاردانە بەزەقی هەن پێوەی ئەتلێینەوە چارەکردنی پشوو و کاری دریژ خایەنی ئەوێت ئەوکەسانەی کە خاوەن بڕوای بەهێزنین کاریان تێئەکات، بیرئەکەنەوە کە بەخۆیاندا بچنەوە کە بەرگەگرتن و خۆڕاگری ئەوێت .

ڕاهاتن و هەندێک نەریتی کۆمەڵایەتی لەناو کۆمەڵگاماندا هێشتا بەڕادەی پێویست ئامادەکاری چاکسازی بۆ نەکراوە ئەبێت کۆمەڵ ئاڕاستە بکرێت، تابۆ بەرژەوەندی نەتەوایەتی ڕەفتاری ئیجابی هەبێت ، لەگەڵ بیرو باوەڕی بەرزی نەتەوایەتی بەڕێبێت وگونجاوبێت ، ئەم شیوە ڕەفتارو کردەوانە زۆرجار پیاو لە خشتە ئەبات، کەلەنیوەی ڕێگە بیر لەگەڕانەوەبکات ،بەخۆیدا بچێتەوە بسلەمێتەوە وریای خۆی بێت کە زیاتر توشی دوژمنایەتی و بەدناوی نەبێت ژیانی خۆی بپارێزێت ،لەوانەیە لەوە زیاتر هەنگاو نەنێت ، ئەوەستێت.

***

# گوێزاندنەوە بۆبەندیخانەی گشتی دەستی پێکرد

لەدوای چەند ڕۆژێک دیمان ئەوانەی لەژورەکەی عەلی ئیبراهیم دەرویش زیندانی بوون بانگکران بۆ دەروە هەموو لەحەوشەکەدا ڕیزکران، دوایی بران بۆ دەروەی ئینزیباتخانە تەنهاجەزای عەلی کاتبیان هێشتەوە هێنایان بۆژورەکەی ئێمە .

لە دوای چەند ڕۆژێک زانیمان کە هەموویان گوێزراونەتەوە بۆ بەندیخانەی گشتی سلێمانی . دورۆژ دوای ئەوە هاتن بۆ ژورەکەی ئێمە و بەرمابەرمان لەژورەکەی ئێمە ئەنوەر دارتاش و قادربرسی و لوتفی (کشمیش ) کرانە دەرەوە بۆ حەوشەکە لەژوری حەمەڕەشێدشانە ، لاوەکان کرانە حەوشەکەوە هەموو ڕیزکران و برانە دەرەوە.

هەرچی مابوو هێنایانن بۆ ژوری ئێمە ئەوانەی هێشتیانەوە مانەوە: من محەمەد باقی سەعید، کاک عوسمان سەعید ، حەمەڕەشید ئەحەشانە ،عوسمانی حاجی کەریم ، حەمەی حەمەلاو ، ئەمینی عەبدە ،جەزای عەلی کاتب . وەک لە بیرم مابێت تەنها ئێمەماینەوە لەئینزیباتخانە، کەسی کەی تیانەما .

ئێمە کە ماینەوە لە ژورەکەی ئێمدا کۆیان کردینەوە وهەڕەشەی کۆشتنیان ئەکرد،چەند رۆژێک ماینەوە چاوەڕوانبووین وەک برادەرەکانمان ئێمەیش بگوێزنەوە بۆ بەندیخانەی گشتی، لەبارێکی دەرونی زۆر خراپدابووین، دڵمان زۆرتەنگ و ناخۆشبوو، بێدەنگی و ماتەمینی دایگرتبووین کەبەردەوام هەڕەشەی کوشتنیان لێ ئەکردین، وەک هاوڕێکانمان مامەلەیان لە گەڵماندا نەکرد جیاکراینەوە هەر کە ئامر ئینزیبات ئەهات بەسەری ئەکردینەوە هەڕەشەی ئەکرد کە جارێکی کە ئێمە دەرەوە نابینینەوە .

لەلایەکەوە پێمان خۆشبوو کە ڕزگاریانبوون لەم قەسابخانەیە، لەلایەکی کەوە ئەوهاوڕێ باشانە دورکەوتنەوە کەزۆر هۆگری یەک بووین، کەبەهۆی ئەوانەوە هەستمان بە ناخۆشی دەرونی ئەوتۆ نەئەکرد ،ڕۆژانە بەقسەی خۆش و باس و بیروباوەڕی پتەو ورەی بەرزکاتمان ئەبردەسەر بەتایبەت لەگەڵ بەڕێز قادر برسی.

یادی ئەڕۆژانەی کە لەگەڵ یەکتر بردمانە سەر بەڕاستی تا ئەمڕۆژ لەدڵ و دەرونماندا جێگەیەکی ڕێزو بەرزو پڕلە شانازیان لەدڵ و دەرونماندا پڕکردبووەوە بەرامبەر یەکتر، بە تایبەت ئەوانەی لەژورەکەی ئێمەدابوون لەڕێزو خۆشەویستی زیاترلەگەڵیاندا، هیچمان بە بیردا نەئەهات .

ئەو ڕوژەی برادەران گوێزرانەوە زۆرخەفەتم خوارد ، ماتەمینی دایگرتم کە ئەو هاوڕێ ئازیزانە لە دەورم نەمان ، برادەرانی ژورەکەمان بۆبەیانی وتیان ئەمشەو هەر وڕێنەت ئەکرد، منیش شەوانە ئاگام لەوڕێنەی ئەوان بوو، کەلەئەنجامی لێدان توشی ئەوحاڵتەبووین .

لەبەر ئەوەی کەیەکەم جارگیرام شەقی پۆستاڵ درابوو لە سەرم، سەریەشەم گرتبوو، هەردەم ئەیەشـا وکـاریتێکردم بۆکـاتێکی کـەم شـتم زۆر و زو لەبیـر ئەچـووەوە، زۆرجـار بۆچەنـد دەقیقەیەک ئاگام لەخۆ نەئەما.

دوای بەربوونم زۆرجار برادەرانم پێیان ئەوتم، ئێمە هەسـتئەکەین تۆبـۆ مـاوەیەکی کەم وەک ئاگات لەخۆ نەمێنێت وایە کاتێک کەقسە ئەکەیت یان ئەجوولێیت پێوەت دیارە.

لەدوای ئەو ڕوداوە بەرگەی دانیشتنی زۆرو قسەی زۆرم نەئەگرت کەلە چەند سەعاتێک زیاتر درێژەی بخایاندایە .

ئەوحاڵەتە و بەسەرهاتەی سەرم بەدرێژایی ژیانم لەگەڵمدا مایەوە وکاری خراپی تێکردم، زۆرجار بووەتە هۆ و مایەی ئەوەی بەهۆی بیرچوونەوە کاتی گرنگم لەدەستبچێت زیانی زۆرم لێبکەوێت، تائەمڕۆژ پێوەی ئەناڵم و کاریگەری هەیە لەسەرم، چارەسەری نیە .

# سەرەی ئێمەش هات گوێزراینەوە
# بۆ بەندیخانەی گشتی سلێمانی

لەدوای ماوەیەک لەچاوەڕوانی، دوای  سەری ساڵی تازەی ١٩٦٣ بەیانیەک ئامر ئینزیبات هات دوسەربازی بەدواوە بوو وتی: خۆتان حازربکەن هەرچیتان هەیە کۆی بکەنەوە بیپێچنەوە لێرە ئەگوێزرێنەوە بۆ شوێنێکی کە ، بەم وشەیە بیرمان بۆزۆرکاری خراپ چوو ، لە حەوشـەکەدا کۆکراینەوە لەژێر چاودێری وئامادەباشێدا یەکەیەکە بەرەو دەرگای دەرەوەبراین ، هەریەکەمان سەربازێک بەدیاریەوە بوو ، میلی کلاشینکۆفەکەیان  ئاڕاستەی سەرمان کردبـوو. لـەدەرەوە دیمان ، زیلی عەسکەری وەستابوو بەڕیز سواری پشتی زیلەکانیان کردین .

هەریەکەمان سەربازێک لە بەردەمیدا وەستابوو ، کە زیلەکـان بەڕێبـوون هەسـتمانکرد بەرەو ناوشار ئەڕۆن دوایی بەرەو بەندیخانەی گشتی ئەڕوشتن کەزانیمان بەرەو بەندیخانەی گشتی ئەبرێین  دڵمان ئارام بووەوە خۆشیەک بەدڵماناهات دڵەڕواکێمان نەما.

بەگوێزانەوەی ئێمە ئینزیباتخـانە کەسـی تیانەمـا.  کەبـراینە نـاو بەنـدیخانە لـە نـاوەڕاسـتی حەوشەکەدا ، ڕیزکراین ناونووس وسەرژمێری کـراین ، دوایـی کراینەنـاو قاوشـەکانەوە ، ئەو ڕۆژەبووە خۆشیەک و مزگێنیەک  بوو بۆ ئێمە واماندایە قەڵەم کە ئازادین و ڕزگار کراوین  .

هاوڕێکانمان هاتن بەپێرمانەوە و باوەشیان پیا کردین  کە خۆشیەکی بێوێنەبوو ئارامیەکی دەرونیبوو بۆمان ،  لەمەترسی  وهەڕەشەی کوشتن نەجاتمانبوو . برادەرەکانمـان یەکەیەکە بەسەریان کـردینەوە ،  هەوڵمـدا شـوێنێک بـۆ خـۆم بـدوزمەوە تـا بەدرێژایـی مانەوەمـان لە بەندیخانە ببێتە شوێنی حەوانەوەم .

***



**کاک محەمەد فەتاح (دەروێش فەتاح )**
**یەکێک بوو لە گیراوەکانی بەندیخانەی گشتی**

## ژیانی بەندیخانەو گوزەراندن

خەڵکێکی زۆر لە بەندیخانەدا گیرابوو چڕو پڕبوو جمەی ئەهات زەعیم سدیق بەندیخانەی پرکردبوو لەکەسانی بێتاوان لەوێ زانیم کەچندەها کەسی تر گیراوە ، توندکراوە نەهێنراوە بۆلای ئێمە.
زۆر گەڕام و سۆراخم کرد جێگەی ئەوتۆم دەستنەکەوت وەک بۆشم دەرکەوت هۆ هەبوو، کاک ئەنوەر هەندێک گیروگرفتی بۆ باسکردم بەدەستی هەندێک لەبرادەرانی ئینزیباتخانە، توشی بەرامبەری بووە ، کەهۆیەکانی لە ئینزیباتخانەوەیە کینەیەکی دژمان دروستکردوە لەدەرونی هەندێکیاندا ماوەتەو بەدوایدا هاتووە بۆ بەندیخانە، هەندێک دژایەتی ئەکەن.
بە هەرحاڵ جێگەی خۆممکردەوە لەناو دەرگای قاوشێکەدا، کە بەڕۆژ شوێنی دانیشتنم نەبوو، ئەبووایە شەوانە چاوەڕوان بم تازیندانیەکان چاویان ئەکەوێتە خەو ، لەکاتێکدا کە هەموویان خەوتبوون، ئەوسا ئەمتوانی بۆماوەی چەند سەعاتێک بنوستمایە، شەویش خەڵکی بۆ چونەدەرەوە ئەبووایە بەسەرمدا بازیان بدایە، بەوهۆیەوە زۆرجارێش پێیان ئەنا بەلەشمدا لەخەو ڕائەپەڕیم دەرگاکەش بەکەمی دائەخرا و بەردەوام لەبەر سەرماکەدا بووم. هەندێک شوێنی قاوشەکان قورغکرابوون لەلایەن کەسانەوە. ژورە بچوکەکانیش هەروەها لەلایەن کەسانێک کە لە ئینزیباتخانە لەگەڵماندا بوون قۆرغکرابون جێگەی بەتاڵ هەبوو ، کە ئەو کەسانە بەخوشی وئارامی لەوجێگە فراوانەدا ، کات بەرنەسەر ، کەسێکی کە بۆی نەبوو شوێنیان پێلێژبکات وببێتەهاوبەشیان کەجێگەی زۆرمابوو هەبوو ، منیش لەناو دەرگاکەدا و لەسەرە ڕێ بنووم.

لەدواییدا کاک ئەنوەر دارتاش سکالای دڵی خۆیکرد، وزۆر بێزاربوو (کە کۆمەڵێک لەوانەی ئینزیباتخانە دوژمنایەتیان کردوە جێگەیان پێلێژکردوە داخ لەدڵن ، ئەبێت ئێمە ئاگاداربین زیانی ئەوتۆمان پێنەگەیەنن)، ئەمەیەحاڵی بەندیخانە کە بە خوت وخۆڕایی پیاو توشێ کێشەو دوژمنایەتی ئەبێت دوژمنایەتیەکەیان بە بەڵگەی ئەوەبووە ، کەئیمە هەواڵی درۆمان داوە بە حێزب رۆژانە راپۆرت و نامەمان نووسیوەو پڕکردوەتەوە دژیان کەپڕبووە لەدرۆوی هەڵبەستراو.

منیش رۆژی دوایی دیم جلەکانی منیشیان فڕێداوەتە ناو حەوشەکەو بەربارانەکە، ناو دەرگاکەیشیان پێ ڕەوانەدیوم ، زانیم هەر بەو هۆیەوە بووە لەناو قاوشەکاندا شوێنم نەکراوەتەوە لەناو دەرگاکەدا جێی خۆمکردەوە .

هۆیەکی گرنگی کەهەبوو کەدیاردەیەکی دەرونی گشتیە لەشوێنی وەهادا ، کەخەڵکی بێزارەو هەریەکە سەد گیروگرفتی خێزانی وکەسایەتی ودەرونی هەیە، لەسەرو ئامانەوە گیروگرفتی ناو بەندیخانە، کە زۆرکەس توشی خامۆکی ئەبن و بێزار ئەبن، حەزناکەن لەگەڵ هاوڕێکانیشیان بدوێن، دەم و چاویان ببینن کەهەموو ڕۆژێک دوبارە ئەبێتەوە هەر هەمان دەم و چاوە، لەئەنجامدا، دەها ناکۆکی و دەمەقاڵی و شەڕوو دوژنمایەتی دروست ئەبێت، و چارەی یەکتریان ناوێت .

مانگی کانونی دووەم بوو چلەی زستانبوو ، لەو ڕۆژەوەی گیرابووم خۆم نەشتبوو ، بەهۆی هەندێک لەبرادەران ، تەنەکەیک ئاوی شلەتێنم دەستکەوت لەتوالێتەکەدا ، خۆم پێشت دوای ئەوە حەسامەوە هەستم بەئارامیەک و خۆشیەک کرد ،کە لەئازاردان و هەڕەشە ڕزگابووین ئینزیباتخانە بووە ڕابوردوو یادەوەریەک .

لەدوای چەندڕۆژێک لەلیژنەی ناوچەی سلێمانیەوە نامەیەکمان بۆ هات دوای سوپاسگوزاری پیرۆزبایی بەرگەگرتنی هەموو ، تیایدا هاتبوو ئێمە دەستیشانکراوین کە ببینە لیژنەی ڕێکخستنی بەندیخانە کە پێک هاتبووین لە :

١ /ئەنوەر سەعید دارتاش ٢ / (من ) محەمەدباقی سەعید ٣ / حەمە ڕەشید ئەحەشانە

٤ / عوسمان سەعید .

بەنهێنی شەودرەنگ دەستمانکرد بە ئەنجام دانی کارەکانی ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستان ، لەوماوەیەدا (حاجی حەسەن کەنۆش – کەلۆش ) (باوکی مامۆستا ئەحمەد حەسەن کەنۆش) لەگەڵ خیزانەکەی لەبەندیخانە: ، لەبەرقاپی بەندیخانە سەرپەرشتی گەڕان و پشکنینی ئەوکەسانەیان ئەکرد کە ئەهاتنە ناو بەندیخانەوە لەڕۆژی زیارەتدا ، نەک کەسێک چەک یان شتی ڕێگەنەدراو بهێننە ناو بەندیخانەوە ، زۆر یارمەتی لیژنەکەیان ئەدا بۆ نامەهێنان وبردن .

لەماوەی کارەکانماندا لە ناو لیژنەی ڕیکخستنی بەندیخانە دا  هەستمانکرد وبۆماندەرکەوت کە ئاسەواری ئینزیباتخانە و ڕاپۆرتە نووسراوەکان و پەیوەندی  سەرومڕمان لەگەڵ دەرەوە بەتایبەی لیژنەی ناوچەی سلێمانی جۆرێک دڵتەنگی و کینەی دروستکردبوو لەدڵی هەندێک کەساندا لەگەڵ جۆرێک بەرامبەریی ، کەزۆرجار هەستی پێئەکراو بەدیئەکرا ، ڕەنگی دابووەوە لە بەندیخانە، ئەوبرادەرانەی پێش ئێمە گوێزرانەوە  ، هەندێکیان بۆیان باسکردم وکە هەستم ئەکرد وسەیرمکرد لەبەرچاومە بەزەقی دیارە بەدوامانەوەیەو دواتریش هەر بەدوامانەوەبوو ، ئەیانویست بەرامبەری و خراپەکاری بکەن لەگەڵماندا ، بیخەنە قاڵبی دوژمنایەتیەوە ، کە هەنگاوەکانیان بۆنی دوژمنایەتی ڕواو ڕوی لێئەهات و مەبەستیشیان بوو  حیزب بخەنە خانەی دژایەتیکردنمان . دوایی کەبەربووین ، هەر بەدوامانەوەبوون تۆمەتی ناڕەواو ، کردەوەی خراپیان ئەدایە پاڵمان ، قسەی ناشیرێنیان ئەدایە پاڵمان ،زۆرلەکردەوە خراپەکانیان پێمان ئەگەیشتنەوە، لەوبارەدا نەبووین کەفریای خۆمان بکەوین ،گوێمان نەئەداپێیان ، گەیشتە ئەوەی هەوڵی کوشتنمان بدەن .

***

## گیراوەکانی بەندیخانەی گشتی

لەبەندیخانە زۆر کەسم ناسی  کە زۆریان هەر لەسەر ئەمرو بەدەستی زەعیم سدیق گیرابوون ، وەک (حاجی دەروێشی بەقـاڵ) کەپیـاوێکی هەڵکەوتـو ناسـراوی شـارەکەبوو (بـووە بـوو ) کوردپەروەربوو، ماوەیەک بوو گیرابوو بە تۆمەتی ئەوەی یارمەتی پێشمەرگەی داوە ، پیاوێکی دەست ودڵپاکبوو دوکانی گەورەی هەبوو  بەرامبە بینای شارەوانی کۆن لەتەنیـشت دوکـانی حاجی ئەحمەد ڕەشیدی بەقاڵ  ،ماڵیان بەرامبەر یانەی فرمانبەرانبوو  ، سەری مانگ کە زانی لە بەندیخانە ئێمە لێپرسراوی حیزب (پارتی ) بووین وتی : من هەندێک پارەی مانگانەم داناوە کەبدرێت بەوکەسانەی دەستکورتن و خێزانەکانیان لەدەرەوە  پێویستیان بە یارمەتی هەیە و بێدرامەتن، وتی: ئامدەم مانگانە ببرمەوەبۆیان، ئێمەێش ئەم کارەمان لا پیرۆزبوو پەسەندبوو ، ئەوەی پێویستبوو بۆ ئەنجامدانی بەدەنگیەوەچووین چەندکەسێکمان هەڵبژارد، دوای وردکردنەوە لێکـۆڵێنەوە وپرسـیار، ئیتـر بەسـوپاس وڕیـزەوە بەپیـر ئەم کـارەخێرخوازیەیەوە هـاتین، ئەوکەسانەی دەستنیشان کرابوون یەکەم مانگایان وەرگرت .

هەردەم ڕاپۆرتمان ئەنووسی بۆ حێزب دەربارەی بەندیخانەوە بەڕونی و ڕاشـکاوی ودروسـت، کەپەیوەندی سەرومڕمان هەبوو لەگەڵ دەرەوە (لیژنەی ناوچە ) .

لەوکەسایەتیانەی کەلە بەندیخانە دیمان (کاکە حەمەی قیروان ) بوو، سەیریش ئەوەبوو خۆی بەندبوو قۆنتەوراتی خواردنی بەندیخانەی بەدەستەوەبوو . لەدوای دانیشتن لەگەڵی وداواکاری بەندکراوەکان، جۆرو شێوەو کـوالیتی خواردنەکـانی بەنـدیخانەی چـاککرد کە پێـی ئەوترێـت (کانە).

قاوشەکەی ئێمە کەلە پەنجا زیندانی زیاتری تیابوو لەسوچێکی ئەوسەردا پیـاوێکی دەروێـش هەبوو، نزیکەی ساڵێک بوو گیرابوو، کاربەدەستانی بەندیخانە نەیانئەزانی لە سەرچی گیراوە ، بەوشێوەیە ئەوەندە مابووەوە تێکچووبوو، هاواریبوو، ئەیبزرکاند کەخەڵکی سەید سادقەو هەشت منداڵی هەیە، خێزانەکەی برسیانەو نانیان نیە بیخۆن کەسنیە دەستیانبگرێت ویارمەتیانبدات، ئەڵێت نازانم چیان بەسەر هاتوە، ( کە لەگەڵی دانیشتین بۆی گێڕاینەوە وتی ؛ بەیانیەک زوو بوو چوم بۆ نانکڕین بۆمندالەکانم، لەگەڕانەوەدا نانەکانم بەدەستەوەبوو  جەندرمەکانی زەعیم سدیق نانەکەیان لێسەندم وتیان تۆ ئەونانانە بۆ پێشمەرگە ئەبەیت، هەرچەند سوێندم خوارد کەهەشت منداڵم هەیە بۆماڵی خۆمی ئەبەم  باوەڕیان نەکرد ، گرتمیان لێرە توندیان کردوم، کەسنیە لێم بپرسێتەوە وقەواڵەم بخوێنێتەوە، هاوکاریم بکەن و فریامبکەون ، ناوی ئەونووسرا کەیەکێک بێت لەگەل ئەوانەی مانگانە یارمەتی ئەدرێن .

کۆمەڵێک لەخەڵکی وفرمانبەران بەتایبەت فرمانبەرانی بەشی کارەبای پێنجوین وبەڕێوە بەرایەتیەکان گیرابوون زەعیم سدیق هەموویانی بەکۆمەڵ گرتبوو بەبیانووی بێ بەڵگەو نادروست کەپێنجوێن کراوەتە مەڵبەندی پێشمەرگە ، لەنیوانیاندا جەمالی میرزا حەمە سەعید، براکەی حەمەسالح میرزا حەمە سەعید ،کەفرمانبەربوون لەگەڵ ، کاک شەوکەت نوری مفەوەزی پۆلیس لەگەل برادەرێکی کەی مفەوەز ، کەخەڵکی گەرمیانبوو لەگەڵ مفەوەز فائق حامد ئەسعەد، لەگەڵ مام سابیری پۆلیس لەگەڵیان .هەموویان ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون هەروەها کارگێرانی دائیرەی کارەبای پێنجوین ، هەموو گیرابوون بەبیانوی ئەوەی کەشەو کارەبایان کوژانوەتەوە بۆ ئەوەی پێشمەرگەبێتە ناوشارو چالاکی ئەنجامبدەن کەپێک هاتبوون لەم بەڕێزانە : فازل مستەفا، محەمەد حەمە کەریم مەحمود، جەلال محەمەد زۆراب .

پیاوێکی پارێزەر بەناوی (حەسەن کانەبی ) لەگەڵمان بەند بوو خەڵکی ڕانیە بوو ، پیاێکی بەڕێزو لەسەرخۆ وتێگەیشتو وڕۆشنبیربوو لێهاتووبوو ئەندامی پارتی بوو نەمان زانی بە بیانووی چیگیراوە

( لەم دواییەدا بیستمان کۆچی دواییکردوە) . هەر وەها (ساڵح زەنگەنە) برای شەوکەتی دانساز لەبەندکراوەکان بوو لەگەڵ محەمەد فەتاح ( دەروێش فەتاح ).و برایەکی شەهید یاسین لەگەڵمان بوو ، (سەبری ئەفەندی ) باوکی ئازاد سەبری پارێزەر وائەزانم مودیر مالی هەلەبجەبوو گیرابوو، کەزەعیم سدیق دەستێکی لەهەڵەبجەش وەشاند بوو ئازاری زۆرلەولاتان دابوو کۆمەڵێکی گرتبوو .

# بەندیخانە قوتابخانەیە

بەڕای زۆر کەس بەندیخانە لەقوتابخانەیک ئەچێت کەپیاو زۆرشتی تیافێر ئەبێت، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بەدڵ و دەرونەوە هەیە سایکۆلۆجیە، کەهەرکەسە باسی ژیان و بەسەرهات و گیروگرفتی ژیانی خۆی و ڕابووردوی ئەگێڕێتەوە، تاقیکردنەوەیەکی دەروونی گرنگە بۆ هەموو کەسایەتیەکان لەهەر پلەو پایەی جۆراو جۆردابن لەرۆشنبیرو زاناو تێگەیشتوو بەکەسانی ناحاڵێشەوە تێکەڵاوبوون پیاوخراپ کەگیراون لەگەڵ پیاو چاک و دڵسۆز ولاو و پیر تێکەڵاون هەریەکە لەبابەتێک ئەدوێت و خەیاڵێکی دنیایی پڕلەخەفەت گیروگرفتی ناو بەندیاخانەو دەرەوەو جۆراجۆر و گیرو گرفتی بێدرامەتی و گیروگرفتی خێزانی هەموی کەڵەکەبوون لەمێشکی هەر یەکێکیاندا هەر یەکە بەشێوەیەک ، هەریەکێکیان بەجۆرێک بەپێی میزاجی ودەماری وئاستی تێگەیشتن وبیرکردنەوەی ڕابووردویەوە بەپیریانەوە ئەچێت .

یەکێک لەگرفتە گەورەوگرنگەکان لەبەندیخانەدا ئەوەیە ، کەسێک کەلەوبارە دەرونیەدا ئەژی بێزارە دەمارگیر ئەبێت دڵی ناسک ئەبێت شەڕانی ئەبێت ، لەسەرونئەمانەوە ئەو هەمووماوەیە دەم وچاوێک بەرامبەریەتی شەوئەنوێت ئەودەم وچاوەی لەبەرچاوە، بەیانی هەڵئەسێت هەمان دەم وچاوە لێی بێزار ئەبێت، رقی لێیئەبێتەوە زۆرجار تێکئەچێت، جارهەیە خۆی پێناگیرێت لەپڕ دێت بەگژیاو ئەڵێت لاچۆ لەبەرچاوم، نامەوێت بتبینم، جار هەیەئەگاتە ڕاستبوونەوە دەمەقاڵێ وشەری بەرامبەری .

ئەم دیاردانە وچارەکردنی هیورکردنەوەی خەڵکی کەسانێکی ئەوێت کە هێمن ولەسەرخۆبن ، هەناسە درێژبن ، خۆڕاگربن ، کێشە دەرونیەکانیان باش شیکردبێەوە ، بەئارامی و سنگی فراوانەوە وبەگیانی لێبوردنەوە بەرەو روی ڕوداوی ڕۆژانە ڕەفتار بکەن ، ئەودیاردەیەو روداوانە رۆژانە هەبوون و زۆربوون ، هەردەم لەکاردابووین بۆ هێورکردنەوەیان .

وەک لە پێشەوەباسم کرد یەکێک لەڕەواڵەتە هەرە دیارەکانی بەندیخانە باری دەرونی گیراوەکانبوو، کە زۆر بێزارو بێتاقەت ودڵتەنگبوون، خاوەن گیروگرفتی دەرونی زۆربوون، لەئەنجامی مانەوەی زۆریان لە بەندیخانەدا دروستئەبێت ، لەوانەیە زۆرگیروگرفت لەناو بەندیخانەدا لەنیوانیاندا دروستببێت وزۆرهۆی کە هەیە کەهەریەکێکیان لەوانەیە چەندەها کێشەو گیروگرفتی خێزانی و کەس و کارو بەرژەوەندی ژیانیان لەدەست چووبێت و نەبوونی و بێدرامەتی وهۆی کە هەبن کە بیزارو دڵتەنگیبکات زۆری کاتەکانی بەبیرکردنەوە خەریکبێت کەتوانای بەسەریاندا ناشکێت و لەبەردەستیدانین لەناوچوار دیواری بەندیخانەدا توندکراوە

سەربەستی لێزەوتکراوە ئەم هەمووە وەک بارێکی گران لە ئەستۆیدایە ، لەڕەفتاروکرداری هەریەکێکدا ڕەنگئەداتەوە کەدەمارەکانی هەردەم گرژەو خۆی پێڕاناگیرێت بەرامبەر هەر وتەو ڕوداوێک بەدڵینەبێت هەڵئەچێت.
جاری واهەبووە لەپڕ دوکەس لەیەکتر سور ئەبوونەوە ، ئەهاتن بەگژ یەکتردا و بۆلێدان لەیەک راستئەبوونەوە.
بەم شێوەیە لەم گێژاوە دەرونیەدا یەکێکی ئەویست ئەوبارە باش هەڵبسەنگێنێت وردیبکاتەوەهەندێک زانیاری هەبێت وباری دەرونی و هۆیەکانی بزانێت وسنگ فراوان بێت وگیانی لێبوردنی تیابێت هێمن و لەسەرخۆو بەتاقەت و بەرگەگربێت ،بەڕێزەوە و بەگیانیکی بێلایەنی لەنێوانیاندا ڕاست ودروست بێتەپێشەوە ، هەڵس وکەوتبکات ئەم شێوەو جۆرە ومەرجەو ئەنجامدانی وائاسان نیە بەتایبەت لەبەندیخانەدا و ناچاریە ئەبێت شانی بدرێتەبەر .
لایەنێکی تری دروستبوونی جۆرە دوبەرەکیەک لەناو بەندیخانە ئەگەڕێتەوە بۆرەوشت وڕەفتاری هەندێک لەگیراوەکانی ئینزیباتخانە، لەوانەیە کەسانێک هەبێت ئامادەنەبێت دان بەهەڵەی خۆیدابنێت هەرخۆی بەڕاست وخاوەن حەق بزانێت ، بەرچاوی خۆی نەبینێت بەرامبەرەکەی نابینێت نایەوێت بەخۆیدابچێتەوە بەرژەوەندی کەسایەتی خۆی وتاکڕەوی گرنگتر بێت لە لەبەرژەوەندی نەتەوەکەی ، لە ئەنجامدا ، هەولئەدات بەمەبەستی ئەوەی ئەم بیروکارانەو هەوەس وئارەزوی خۆی لەگەڵ قاڵبی ڕێکخستن وپارتایەتی وخەباتدا ڕێکبخات و بگونجێنێت ،بۆ ئەوەی بەوهۆیانەوەکاری تایبەتی خۆی بڕوات بەڕێوە .
کەئامادەنابێت وازلە خۆپەرستی ولاساری وبەرژەوەندی بهێنێت، کەللە ڕەق تۆڵەسندە وبەڕواڵەت بەکاروکردەوە دڵسۆز وخەباتکەر خۆی دەرئەخات ، بەڵام وەک پێویست وچاوەروانکراو لەناخیەوەنیە . هەر ڕۆژێک لەرۆژان ئەو ڕواڵەت وڕەفتارەی لەناو دەروونیاندا ڕەنگ ئەداتەوەو تیائاشکرائەبێت ، کاتێک کەزانیان بەرژەوەندی تایبەتیان لەناوڕیزەکانی خەبات و ڕێکخستندا جێبەجینابێت، لەئەنجامدا ئەم جۆرەکەسانە ئەبنە هۆی گرنگی (تەکەتول ) وتاقمگەری لایەنگەری ناپاکی کەهەردەم لەناو ناوەندو پارت و کۆمەلەو ڕێکخراوە سیاسی وکۆمەڵایەتیەکاندا روئەدات .
لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە توانیمان نیمچە کۆمەڵگەیەکی خۆش دروستبکەین کاتەکان بە قسەی خۆش و نوکتەو سەر گوزەشتە و یاری شەوانە کاتمان ئەبردەسەر یارمەتی یەکترمانئەدا ، بەندیخانەمان کردە لانەیەکی برایەتی ویادگاری وخۆشی، بەگیانێکی لێبوردن ودڵپاکی دور لەکێنە ڕەفتارمان ئەکرد گوێمان نەئەدا بەکاری دوژمنایەتی خراپەکاری.

لەبەندیخانەدا باری ژیانمان زۆر ناخۆشبوو بەڵام ئێمە کردبوومانە لانەیەکی هاوڕێیانەو یادگاری وبەرگەگرتن وخۆشی ، بازمان ئەدابەسەر زۆر تەگەرەدا ، بیرمان ئەکردەوە ئەگەر وانەکین ئەی چیبکەین ،،؟، نەبوونی هۆی ژیان وگیروگرفتی ژیان زۆربوو ، مانگی جارێک ئەگەر هەڵکەوتایە تەنەکەیەک ئاوی شلەتێنمان دەستئەکەوت خۆمانی پێبشۆین . لەدوای ماوەیەک شوێنم دەستکەوت .

جارێکیان کۆمەڵێک قەرجی گیراویان هێنا بۆناو قاوشەکەمان ، بەزۆرو پاڵە پەستۆ جێگەمان هەبوو ، زۆرکەس شوێنی ڕاکشان و خەوتنی نەبوو ، ژیانیان زیاتر لێ تاڵکردین ، ئەسپێی لە شێان لەو ناوەدا ڕێچکەیان بەستبوو وەک شارەمێروله کەبدەگمەن بەو شێوەیە لەژیانماند دیومانە ، هەمووگیانمان کەوتە خورو سوربوونەوە لە سەرو ئەوەشەوە بەهۆیانەوە شەوانە خەومان نەبوو لەبەردەنگەدەنگی بەردەوام وشەڕیان لەگەڵ یەکتر کە بەردەوامبوو ، هەردەم هاواریان بوو بۆ پێڵاوەکانیان ، کەزوونەیان ئەدۆزیەوە پڕبەدەم لەنیوەشەودا هاوریانئەکرد (کەفشی من کی بوردە ) یانی پێڵاوەکانی من کێ بردویەتی ، بەڕاستی ماوەیەک دامایـن و چێشتمان بەدەست ئەو قەرەجە پیسیانەوە ، لەبەر ئەسپێ ژیانمان لێتاڵبوو.

مانگی کانوونی دوەم بوو ساڵی ١٩٦٣بوو ئیتر هەفتانە کەس وکارمان سەردانیان ئەکردین لەیەکەم جاری سەردانیاندا بۆیان باسکردم کەچۆن ئەوکتێب و شتانەی گۆمانیان لەسەربوو خێرالایان دابوو ، کەهاتبوون بۆ پشکنینی ماڵەکەمان کتێب و شتی ئەوتۆیان دەستنەکەوتبوو ، بەڵام هەرشتیان خستەگونیەوە لەگەڵ کێتبەکاندا کەمابوون خستبوویانە ناو پیکابەکەوە لەگەڵ خۆیاندا بەتاڵانی بردبوویان .

باسیان بۆکردم کەباری درامەتیمان زۆر خراپە یارمەتیدەرمان نیە وکەسنیە لایەکمان لێبکاتەوە ، تاتواناى کڕینی دەرمانیشمان نیە بۆباوکت کە زۆر پێویستە ، منیش دڵخۆشیم دانەوە کە ئەبێت شانی بدەینەبەر ، خۆمان ڕابگرێن تاخوا دەرویەکمان لێئەکاتەوە ، وتم تا ئەمڕۆ شۆڕشەکەمان تازەیەو سەر پێی خۆی نەکەوتوە هیوای ئەوە ناکرێت ،چاوەڕوانی یارمەتی بین لێیان ، و کەسانی کە ، گوێ مەدەنێ شتی ناوماڵ بفرۆشن تاپێی بژین موحتاج نەبین . زۆر لەخزمان لەوڕۆژەدا هاتبوون بۆ بینینم .

.

# كۆدەتای بەعس ٨ شوباتی ١٩٦٣

لە بەندیخانەی سلێمانی ماوەیەکمان بەسەر بەد لەپڕ بڵاوکرایەوە کەحیزبی بەعس هەڵساوە بە کۆدەتایەکی سەربازی دژی  زەعیم عەبدولکەریم قاسم و بەسەریدا سەرکەوتون و بەشێوەیەکی نامرۆڤانەو نامەردانەی جەهالەتی عـەرەبـی، کەهەڵقولابـوو چـەسـپیبوو لەدەرونـی نزمیـانەوە عەبدولکەریم قاسمیان بە شیوەیەکی دڕندانە تیرۆرکرد.

کەکاتی خۆی ئـێمە لە ئینزیباتخـانەوە ئەمانـدی وئەبیـست ئەوانەی کاروباریـان ئەبردبەڕێـوە ولەفرمانگەکـانی میریـدا ولە بنکەسـەربازیەکاندا لەهەمـوو پـلەو پایەیەکـدا بـەهـەمـوو دژی عەبدولکەریم قاسم وڕژێمی عێراق بوون، هەردەم بەنهێنی وئاشکرا  خـەریکـی دوژمنـایەتی و پیلانگێڕیبوون ، کاریانئەکرد دژی بەمەبەستی گۆڕین ولابردنی عەبدولکەریم قاسم، بەبیانووی ئەوەی کە عێراق ڕێگەی چەپڕەوی گرتوەتەبەر ، عەبدولکەریم قاسم کوردی کردوەتە شەریکی خاکی عێراق وهاو بەش وبرای عەرەب، دەستی دەرەکی لەکاردا بوو بۆروخانـدنی، بەتـایبەت لەلایەن دەوڵەتەعەرەبیەکانەوە ، دەوڵەتانی ڕۆژئاواش بارەکەیان بەدڵنەبوو.

شورشی ١١ ئەیلولی ساڵی ١٩٦١، کاریگەری گرنگی هەبوو لەسـەر توانـاو ئەدای حکـومەت، کۆمۆنیستەکان کە گرنگترین پاڵپشتبوون وهێزبوون بۆ عەبدولکەریم  ، خۆی دورخستەوە لێیان بەتاکرەوی خۆی، بێپاڵپشت وپەنا مایەوە.

هەردولایان (پارتی و شێوعی) بەتەنگەوەنەبوون یان بێئاگابوون لە جم وجـوڵی بەعـسیەکان، عەبدولکەریم بەتەنیامابووەوە  لەپلانگێڕی بەعسیەکان ئاگادارنەبوو ، بەوشێوەیە ئەو هەمـوو هۆیانەکۆبوونەوە کەڵەکەبوون. مەیدان چۆڵ بوو بۆ بەعسیەکان بەئارەزوی خۆیان بکەونە جۆڵە ئەو کۆدەتایە ئەنجامبدەن. هەر زوتر پێناسەی ڕەگەز پەرستیان  زانرابوو ناسـرابوو ، کـورد بڕوای پێیاننەبوو .

لەگەڵ سەرکەوتنیاندا یەکەم هەنگاویـان کەوتنەگیـانی شـیوعیەکان بـەکۆشـتنیان بەکـۆمەڵ، بەندیخانەکانیان پڕکرد لەشێوعی دەستیانکرد بەکۆمەڵ کوژیان.

بینای (قەسر النهایە) کە کاتی خۆی (مەحکەمەی شەعب) بوو کردیـانە قەسـابخانەی  لاوانـی بێتاوان، (حەرەس قەومی) چەندەها کەڕەت دەستدرێژیان کردە سەر ناموسـی خەڵکـی، هەر بوترایە فلان کەس شێوعیە خێرا پێستیان ئەبرد بۆ دەباخانە .

شـێوعیەکان هاوکـاری تەواوکـران لەلایەن شۆڕشـگێران و سـەرکردایەتی کـوردەوە، ئەوەی لەبەردەستیاندا هەبوو توانایان بەسەریدا هەبوو بەدەنگیانەوە چوون رزگاریانکردن لەدەسـتی بەعسیە دڕندەکان و پەنایاندان .

بەندیخانەی سلێمانی و زۆر شوێنی تر و لەهەمووعێراقدا پڕکران  لەکەسانی بێئاگا لەسیاسەت هەر بە بێبەڵگە، کێیان دەست بکەوتایە ئەیانگرت .

شوێن نەمایەوە بەندکراوی تری تیا جێگە بکرێتەوە زۆرترینیان بێتاوان و لەخۆڕایی گیرابوون کەئاگایان لەسیاسەت و حیزبایەتی نەبوو .

حێزبی شیوعی لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولی مەزن دەورێکی دیارو ئیجابیان هەبوو بۆ پشتگیری شۆڕشی ئەیلولی گەلی کوردستان لەژێر (دروشمی ئاشتی بۆکوردستان و دیموکراتی بۆ هەموو عێراق)، لەوپێناوەدا زۆرلەکەسایەتیان توشی ئازاروگرتن بوون ولەناوخۆیاندا کەلێنیان تێکەوت.

سەروک وەزیرانی نویی کۆدەتاکە (عەلی ساڵح السعدی ) بوو وتیان کوردە باوکی لەوکاتانەشدا هەر پەستەکی لەبەردابوو  هێشتا ، عەرەبی فێرنەبوو ، ئەم بەعسیانە بەدڕندەترین ڕێگە خەڵکیان لەناوبرد .

لە سەرەتادا لەگەڵ سەرکەوتنی کۆدەتا کەیان  وتیان ئێمە ئامادەین بۆ دانیشتن و دانووسان لەگەڵ سەرکردایەتی کوردی ، تابگەینە ئەنجامێکی باش بەرژەوەندی هەردولای تیابێت، بەڕێزمام جەلال کرا بەسەروکی  وەفدی شورشگێڕانی کورد، سەرکردایەتی کوردستان ناردی بۆ دانووسان و ڕێکەوتن، بەلام هەموو کارو پەیوەندیەکانیان تاکتیک و کات بردنەسەربوو، بەمەبەستی بۆخۆ دزینەوەو خۆبە هێزکردن و ئامادەباشی وپەلاماردان بوو بەنیازی، کۆمەڵکوژی گەلی کوردستان .

***

# ئازادکراین

## دەستمان کردەوە بەکاری ڕیکخستن

دوای ماوەیەک لەئەنجامی ڕێک کەوتن لەگەڵ سەرکردایەتی کورد لەمانگی نەورۆزدا هەموو زیندانیەکان ئازاد کران ڕۆژی بەربوون کرانە ئاهەنگێک و خۆپیشاندانێکی جەماوەری گەورە کە ژمارەیەکی زۆر لە هاو وڵاتی هاتبوون لەبەر دەرگای بەندیخانە چاوەڕوان بوون .

هەرچەندە ئێمە چەندکەسێکمان زووتر ئەمری بەربوونمان هەبوو، شاردبوویانەوە، کە کۆدەتاکە سەرکەوت بەلاوە نراو جێبەجێ نەکرا . ئەوەی سەیربوو ئێمەی زیندانی لەبەندیخانەدا ئەوماوە دورو درێژە ماینەوە بێئەوەی بەتۆمەتێکی ئاشکراو ڕون گیرابین یان مادەیەکی یاسایی درابێتەپاڵمان، بەوپێیە بەندکرابین ، وەک لەبیرم مابێت ئەیان وت خاڵێکی یاسایی هەبووە کەپێیان وتوە وائەزانم (مادە ٢٤ ) کەبەپێی ئەومادەیە، سەرسەری وبێئیش ودزی ئەگرتەوە، وتیان ئەومادەیە ئێوەشی ئەگرتەوە.

لەگەل بەربوونماندا خێرابانگ کراینەوە بۆهاوکاری لەگەڵ هەڤاڵەکانماندا ، بۆدرێژەدان بەخەبات لەڕیزەکانی ڕێکخستندا، شوێنەکانی ئاسایی پێشوی خۆمان وەرگرتەوە. لەگەڵ هەڤاڵاندا ڕۆژانە کۆبوونەوەی بەردەوامان هەبوو، تا ئاگاداربین ولە ئامادەباشیدا بین بەرامبەر هەر ڕوداو گۆڕان کاریەک کە لەلایەن بەعسیەکانەوە ڕوویدات یان دژی نەتەوەکەمان ئەنجامبدرێت.

ماڵی ( عەبدولخالق جەباریمان ) کردە بنکەی چالاکیمان کردمانە (ژوری کارو چالاکی) کە ماڵە کەی لەبەر خانەقابوو لەسەرجادەی سەیوان ، لەماڵی عەبدولخالق ئەم بەڕێزانە لیژنەکەیان ئەبردبەڕێوە کە پێکهاتبوون لە (جەلال عەزیز بەگ، ئەنوەر دارتاش، محەمەد باقی سەعید، کەمال میرزاغەفور، حەسەن حسەین، ئەحمەد مارف مۆریاسی، عەبدولخالق جەباری).

لەگەڵ ئەوەشدا (بەڕێز دارا تۆفیق ئاغا فەتحوڵڵە) کەلەبردەرانی کۆمۆنیست بوو لەوێ بوو کە لەبەغدادەوە لەدەستی بەعس ڕایکردبوو دەربازبوو وەک میوان لەوێبوو، حیزب دایناببوو ئەیپارست کە بەتەمابوون بینێرنە دەرەوە بۆناو پێشمەرگە .

لەڕیزەکانی کرێکاراندا جێگەی پێشوی خۆمان وەرگرتەوە هەندێک گۆڕانکاری کرابوو لەئەندامانداە، زۆر بەوریایی ونهێنی کارەکان ئەبران بەڕێوە شانەکان بەسەرکرانەوە، ئەندمانی پەرتەوازە ڕێکخرانەوە، یان ئەندامی نوێ جێگەیان گرتنەوە، لەماوەیەکی کەمدا فریای هەڤاڵانی کرێکاران کەوتین بەهەموو کەوتینەوە سەرکاری چڕوپڕی ڕێکخستن جاران ئاسایی کارەکانیان ئەنجامئەدا.

فریای کاسبکاران کەوتین کە لەناو ئەوانیشدا گۆڕانکاری ئەنجامدرابوو لەگەڵیاندا کەوتینەوەکار هەرئەندامێک بچرابوو وپەرتەوازە بوو ڕیکخرانەوە یان لەشوێنیان ئەندامانی نوێ دەست بەکاربوون وەک جاران کەوتەوە سەر ڕێ.

لەماوەی گرتنماندا یەکێتی مامۆستایانی کوردستان چالاکی جارانی مابوو گۆڕانکاری ئەوتۆی تیانەکرابوو ، سکرتێری یەکەمی یەکێتی مامۆستایان (دوکتۆر کامل بەسیر )، لەنگەری کارەکانی بەباشی ڕاگرتبوو، هەموو پارێزگاکان بەسەرکرابوونەوە، شوێنی (من و ئەنوەردارتاش ٠) بۆماوەیەکی کاتی پڕکرابوونەوە .

بانگکراینەوە بۆکۆبوونەوەی هەیئەتی سکرتاریەت لەناو سکرتاریەتدا شوێنی خۆمان وەرگرتەوە ئەوەندەی پێنەچوو لەسەرەتای مانگی نیسان یەکێتی مامۆستایانی کوردستان کەلێنێکی گەورەی تێکەوت .

١ / لەپڕ ( دوکتۆر کامل حسن البسیر ) سکرتێری یەکەمی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان گیرابوو ، ڕەوانەی بەغدادکرا لەبەندیخانەو قەسابخانەی (قسر النهایە ) توندکرا ، کەلەزەمانی عەبدولکەریم قاسمدا دادگای گەل بوو( مەحکەمەی شەعب )بوو بەعسیەکان کردیانە بەندیخانەو قەسابخانەیەک بۆ کوشتن وبرین وئازاردان وئەشکەنجەدان بەتایبەت بۆشیوعیەکان وکورد پەروەران .

٢ / فایەق میرزا عارف ئەندامی سکرتاریەت بەهەڵەگیرا بوو بەتۆمەتی شیوعی کە لەجیاتی ناوی کەسێکی کە گیرا، کەهەمان ناوی هەبوو .

٣ / عەبدولقادر مەلاعومەر گۆمبەدی ئەندامی سکرتاریەت پەیوەندی بە پێشمەرگەوە کردبوو.

لە ناو ئەندامانی سکرتاریەتی یەکێتی مامۆستایاندا تەنها بەندە (محەمەد باقی سەعید و ئەنوەر دارتاش ) لەدەرەوە ماینەوە ، ئەنوەر سەعید دارتاش جێگەی سکرتاریەتی گرتەوە بەهەردوکمان بڕیارماندا کەهیچ گۆڕانێک نەکەین لەرێزەکانی یەکێتی مامۆستایاندا تا کارەکە وبارەکە بەلایەکدا ئەکەوێت ڕون ئەبێتەوە .

لەو کاتانەدا بەیانێکمان بڵاوکردەوە بۆگشت مامۆستایانی کوردستان وڕیزەکان ، کە پێویستە نهێنی ڕیزەکانیان بپارێزن وریایانە کارەکانیان ڕاپەڕێنن ڕیزەکانیان پتەوتربکەن کە ئینقیلابچیەکان جێگەی متمانە نین ، بڕوایان پێناکرێت هەردەم لەگەڵ گەلی کوردستان و هەموو گەلی عێراقدا خەریکی کاری پلان گێڕی ونامەردین. مانگی نیسانی ساڵی ١٩٦٣ بوو بەڕاستی لەوماوەکەمەدا ئەرک وکارێکی گران کەوتە سەرشانمان کەمانگێک تیپەڕنەبوو تازە لەئینزیباتخانە بەربووین یەکێتی مامۆستایان توشی شکستی کەمی ئەندامانی سکرتاریەتبوو ئەبووایە ئێمە نەهێلێن ڕیزەکانی یەکێتی مامۆستایان کەمی ئەندامانی سکرتاریەتی پێوە

دیاربێت ، ئەوکەلێنە پڕبکەینەوە، ئەبووایە لەکۆبـوونەوە و پیوەنـدی بـەردەوام و سـەرومرڕدا بووینایە تا بتونین نەهێڵین توشی شکستی و بێتەوە لەنگەری کارەکان ڕابگرین .

لەڕیزەکانی ڕێکخستنی ڕێکخـراوەکـانی تـردا وەک جـاران بـەجـەختبـووین، خـەریکـی کـاری بەڕێوەبردن وڕێکخستنەوەیان بین تاهەموو رێکخستنەکان وەک جارانیـان لێدێتـەوە ، کـەم و کوڕیان نامێنێت .

***

## دانووسانی سەرکردایەتی کوردو بەعس

## فرت وفێلی بەعس وکات بردنەسەر

بەعسیەکان بۆ ڕەوینەوە و چارەسەرکردنی کێشەو و دۆزی نەتەوەی کورد وجێبەجێکردنی مافی ڕەوای ، پرۆگرامێک وپلانێکی زۆر ڕۆشنیان نەبوو ، لە بڵاوکراوەکاندا هێچ بەڵێن وپەیمان و وشەیەکی ڕون نەدرا بەگەلی کورد ، بڵاویانکردەوە لە ئەنجامی دانیشتن وپەیوەندی بەنیازی ئەوەن ،کە بگەنە ڕێکەوتن وبڕیارێک بۆ جێبەجێکردنی مافی نەتەوەی کورد.

.لەڕۆژانی یەکەمی کۆدەتاکەوە ، مسەرکردایەتی کورد خێرا فریاکەوت، داواکاری و مافی کوردیان بەیاداشت پێشکەشکرد، کەئەبێت لە ماوەیەکی کەمدا سەرکردەکانی کۆدەتای نوێ ، بەڕونی و ئاشکرا دانبنێن بە مافی نەتەوەیی کورد دا وەک نەتەوەی دوەم لە عڕاقدا ، هاوسەنگ و هاوتای عەرەب و هاوبەش .

وەک تەکتیک و ڕەوشتی بەعس دەرکەوت کە کاتیان ئەبردەسەر (بەبیانوی ئەوەی شۆڕشەکە نوێیەو پێویستی بەماوەیەک هەیە تاجێگیر ئەبێت، شوێن پێی بکاتەوە ، دوژمن زۆرەو ، بەرژەوەندی گەلی عێراق ، پێویستی بە یەکڕیزی هەیە، هەموو لەدەوری کۆماری نوێ کۆببینەوە و پشتگیری لێبکەین تا کاتی گونجاو ئەڕەخسێت مافی کورد پارێزراو ئەبێت،وتیان: باپەیوەندی ودانوسان و گفت وگۆ لەنێواندا بەردوامبێت، داواکاری خاڵ بەخاڵ نووسرابێت بەمەبەستی چارەسەری وگەیشتن بەئەنجامیک وڕێک کەوتنیک کەمافی کوردی تیا ڕەچاوکرابێت).

بەڕێزمام جەلال تاڵەبانی سەرۆکی لایەنی وەفدی کوردیبوو بۆ گفت وگۆو وتوێژو لەگەڵیاندا لەگەڵ چەند کەسایەتیەکی تری کورد کەئەندامی شاندەکەبوون .

ماوەیەک بەڕێز تاڵەبانی لەبەغدادبوو بۆگفت وگۆ ودانوسان و وت و وێژ لەگەڵیاندا، ماوەکە درێژەی کێشا ، لەوە ئەچوو کەبیانەوێت کات بەرنەسەر تاهەلیان بۆ ئەڕەخسێت، دستێک بوەشێنن دەستبکەن بەکۆمەڵ کوژی کورد وتیرۆرکردنی سەرکردەکانی کورد وشۆڕشگێڕان .

زەعیم سدیقی خوێن ڕێژ لە جاران زیاتر کەوتە کەش وهەوای خۆی رۆژانە دەستدرێژی ئەکردە سەرگیانی هاوڵاتیان لە سەرشەقام و ماڵەکان بێلێپرسینەوە خەڵکی ئەکوشت، درندەکانی لەهەموو دەڤەرو ناوچەکاندا کاری تیرۆر و تاوانی کۆشتن و دەست درێژیان ئەنجامئەدا.

گەلی کورد لە بۆسەدابوو بەگۆمانەوە سەیری سەرکردایەتی بەعسیان ئەکرد لە ڕەفتاروکردارو سیاسەتیاندا دەرئەکەوت ومەترسی ئەوە هەبوو کە بەعس بەتەمابێت دەستێک لەکورد بووەشێنێت، بەنهێنی خەریکی پلانگێڕی بوو، ئێمەیش لە ریزەکانی ڕێکخستنی پارتیدا هەردەم

له بۆسەدابووین ئاگاداربووین ئاگادارکرابووینەوە وئاڕاستەکرابووین، کەبەوپەڕی نهێنی کاربکەین زۆر وریابین ،جەماوەر ئاگادارکرانەوە ،کە وریابن یەکرپیز کاربکەن بەعس دوژمنەو باوەڕی پێناکرێت .

# كاری نامەردی ونامرۆڤانەی زەعیم سدیق

لەوکاتانەدا زەعیم سدیق بەردوام خەریکی کاری نامەردی و خوێن ڕێژی بوو ، بەڕاستی وەک مۆرانە کاریکردبووە سەر ژیانی ئابووری کەلتوری وژیانی کۆمەڵایەتی کورد. لەهەموو ناوچەکەدا کیش و هەوایەکی ترسناک و ڕاڕاییی و سامناکی دروستکردبوو، لەترسی ئەوەی شتێک وێنەیەک نوسینێک لەماڵدا بەناڕەوا نەبێتە بەڵگەیەک یان بیانوویەک لەسەری ،بەوهۆیانەوە بیگرن ، زۆر سامانی کەلتوری کەلەپوری کۆن و یادەوەری خێزانی وشتی بەنرخ نووسراو و کتێب لەناوبران ، کاری کردە سەربازاڕو ژیانی خەڵکی بە هەموو مانایەکیەوە.

گەلی کوردێش لە بەرامبەر ئەو دوژمنایەتیەدا ، دەستەوەستان نەبوو چەندجار لاوان هەوڵیاندا وڵات وخەڵکی پاکبکەنەوە لەم مۆرانەیەو لەناوی بەرن ، بەڵام بێسودمایەوە لەناوچەی سلێمانی و گەرمیان هەردەم خەریکی کاری نامەردانەبوو، یەکێک لەو کارە نامەردیانەی :

زانیبووی کە بەڕێزمام جەلال لەشارەزورەوە بەنیازە بگەڕێتەوە بۆ ناو شاری سلێمانی وەک باسکرا سەرۆکی ِشاندی کوردی بوو کوردیبوو بۆ پەیوەندی و دانووسان ، کەمینێکی بۆ دانابوو لەسەرجادەی سەرکارێز نزیک بنکەی پۆلیسی سەرکارێز ، ماڵەکانی دەورووپشتی مەخفەرەکەی داگیر کردبوو لەباڵە خانەکانەوە لەباڵکۆنەکانەوە کە بەسەرجادەکەدا ئەیانڕوانی ، سەربازەکانی بەچەکەوە ئامادەباشی حەشاردابوو لەبۆسەدابوون ئامادە لولەی چەکەکانیان کردبووە ناوشەقامەکە، خەڵکی گەڕەک کەئەمەیان دیبوو هەستیان کرد کە کارێکی نامەردی بەدەستەوەیە و نیازی زۆرخراپە ، لە چەند لایەکەوە بەرپرسانیان ئاگادارکرد بووەوە ، بەرەو پیری بەڕێزمام جەڵال چووبوون ئاگاداریان کردەوە کە زەعیم سدیق بەنیازی کارێکی نامەردیە ، چاوەڕوانی کەسێکە بەوشەقامەدا تێپەڕێت تیرۆری بکات، بەڕێزی لەلایەکی کەوە هاتبووە ناوشار ڕێگەی گۆڕیبوو زەعیم سدیق بەشەرمەزاریەوە ئەو ناوەی بەجێهێشت .

[ لەوساڵاندا جادەی (سەرکارێز-کانی با) تاکە جادەی باشی سلێمانی بوو بۆ هەڵەبجەو پێنجوین ودەربەندیخان وشارەزور] .

لەڕۆژێکی بەهاردا زەعیم سدیق لەگەڵ پێشمەرگەدا و لە نەبەردیەکدا شکستی هێنابوو ، لە گەڕانەوەیاندا لە بەردەرکی سەرا بەسەربازەکانی وتبوو بەئارەزوتان تەقەلە خەڵکی بکەن ،کەگەیشتبوونە ئاستی (چایخانەی حەمەڕەق ) دەستڕێژیان کردبوو بەناوچایخانەکەدا چەندکەسێکیان کوشت وبریندارکرد یەکێک لەوانەوائەزنم کوڕی ( بەشێر بێثون ) بوو کەهاوولاتیەکی مەسیحی بوو .(چایخانەی حەمەڕەق لەوساڵەدا بەشێک بوو لەسینەمای سیروان کەلە سەرجادەی سەرەکی مزگەوتی گەورەبوو بەرامبەر تەلاری نەقیبی ئیستا .)

بەڕێز شازاد دوکتۆر فوئاد گێڕایەوە و وتی: بەچاوی خۆم زۆریم دیوە لەساڵی١٩٦١ / ٦٢دا، زەعیم سدیق هات بۆ زرگوێز کەوتەگرتنی هاو وڵاتیان، بەدوکتۆرفوئادی باوکمیٶ وت کەلەوێ فرمانبەری خەستەخانەوبوو، وتی وەرە لەگەڵم بردیە ئەولاوە وتی: پێم بڵی لێرە دانیشتوانی ئەم شوێنە کێ چەکی هەیە. دوکتۆر فوئاد نەیویست.یارمەتی بدات و ناوی کەسی بهێنێت، زەعیم سدهیق خۆی وحیمایەکانی کەوتنەوێزەی، هەتاتوانیان لێیان دا بەدەردی مەرگیان برد، هەربەوهۆیەروە گیانی لەدەستدا، دوایی هەرچی گەنجی ئەوناوەبوو گرتی و بەزیلی عەسکەری بردنی بۆ سلێمانی .

هەروەهالەساڵی ١٩٦١ دا زەعیم سدیق هات بۆ بەردەم مزگەوتی گەورە ، کویرانە ئەمری ڕەمی دەرکرد، کۆمەڵێک هاو وڵاتی بەرکەوتن لەوەانە یەکێک بەناوی (نامدارەوە) شەهیدبوو جگەرەفرۆش بوو ، لەوکاتەدا هیشتامندااڵ بووم، کەئەودیمەنەم بینی دەستم کردبەگریان ، دوای ماوەیەک ئەمبۆلانس هات، لاشەکەیان هەڵگرت بردیان بۆ مەیت خانە.

هەرلەبەهاری ئەوساڵەدا خەڵکی لەدڵەڕاوکێ وچاوەڕوانی سەرومرِدابوون بەگومانەوە سەیری کارەکان وجوڵانی ئینقیلابچێە بەعسیەکانیان ئەکرد و دەنگ گۆ هەبوو ، لەوانەیە مەنعی تەجەول بکەن خەڵکی بەکۆمەڵ بگرن وبکوژن .

لەڕۆژی ٧ /٤ / ١٩٦٣دا لەساڵرۆژی دامەزراندنی (حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی) ڕێک کەوتن نامەی سێقۆڵی (عێراق ،سوریە، میسر ) بڵاوکرایەوەکە ئەوسێ دەوڵەتە بوونەیەک لە (دەوڵەتێکی کۆماری یەکگرتوی فیدراڵیدا)، ئەمەش نمونەیەکی کەی دیار وبەڵگەداربوو بۆپشتگوێ خستنی دوزو داواکاری ومافی نەتەوەیی کورد .

لەگەڵ بڵاوکردنەوە ڕێکەوتن نامە کە سەرکردایەتی کورد بیر خەرەوەیەکی پێشکەشی هەرسێ دەوڵەتەکە کرد کەکوردستان بکرێتە پارچەیەک وەک ئەوسێ ( دەوڵەتە یەکگرتوە) بەناوی کوردستانەوە ببێتە بەشی چوارەم لەچوارچێوەی ئەوحکومەتە یەکگرتوە فیدرِآلدا ، سەرۆکی وەفدی کوردی لە بەغداد چاوەڕوانی هەنگاو بوو بۆجێبەجێکردنی مافی نەتەوەیی گەلی کوردستان .

{ ئالای نوێ بۆئەم دەوڵەتە یەکگرتوە فیدراڵیە دانرا کە لە ناوەڕاستیدا ٣ سێ ئەستێرە هەبوو کەهەر ئەستێرەیەکیان هێمابوو بۆهەردەوڵەتێکیان . لەلایەکی کەوە بەعسیەکان ئەیانوت ئەوە هێمایە بۆ دروشمەکەی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی (وەحدە، حوریە، ئیشتراکیە) تا ئەمرۆژ ئەوئالآیە بەشەرمەزاریەوە لە عێراقدا بەرز ئەکرێتەوە و ئەشەکێتەوە بەتایبەت لەلایەن بەعسیەکانەوە }.

کەلەژێر سێبەریدا کورد لەم دواییەدا بەودەردە برا و ڕەشەکوژی وجینۆسایدکرا و ئەنفال و کیمیابارانکرا زیاتر لەچوار هەزار گوند لەگەڵ زەوی تەختکران کوردبەکۆمەڵ ڕەوی پێکرا.

**خەڵكی لەمەترسی ئەوەدابوون چۆن بەڕێزمام جەلال لەبەغدادەو چاوەڕوانە، بەعس دەها كاری نامەردی پلانی گڵاوی لە ژێر سەردایە، فرت وفێڵ ودەسی دەسی پێئەكەن و لەگەڵی بەخۆڕایی كات بەسەرئەبەن  خەڵكی بەگومانەوە باسیانئەكرد.**

**كاك ئەنوەر سەعید دارتاش هاوڕێی نزیكی هەمیشەییم بوو لە ڕێزەكانی ڕێكخستن و خەباتدا هەردەم بەیەكەوەبووین .**

# بەرەو بەغداد بەڕێ بووین

بەیانیەکی زوو پێش خۆرهەڵات لەدەرگامان درا کەدەرگام کردەوە (کاک ئەنوەر دارتاش بوو ) هاتوە بە شوێنمدا ، وتم هاخێرە بەم بەیانی زووە هاتویت بۆئێرە ،،،؟، :
وتی: هەرئیستا ئەبێت حازربێت لەگەڵم بچین بۆ بەغداد ڕاسپێراوین ، هەر ئەبێت بێیت لەگەڵم ، بەپەلەین ، وتم باشە چۆن وابەپەڵە ، بۆچی بچین؟ وتی : بەڕیز جەلال تاڵەبانی لەبەغدایە ئەبێت بچین ئاگاداری بکەینەوەکە ئاگای لە خۆیبێت ، بارەکە لە بارنیەو بەعس نیازی خراپە وژیانی لەخەتەردایە ، وتم تۆچی ئەڵێیت ڕاستە، بەڵام قابیلە ئەو خۆی ئەوەنەزانێت ،بارەکەی باش هەڵنەسنگاندبێت ، ئاگای لە خۆی نەبێت، چاری خۆی نەکات، وتی: من گوێم لەمانەنیە ،ئەمە ئەمرە، هەرئەبێت ئیستا ئامادەبیت لەگەلم تا بچین ، منیش ناچار خوم سازداو بەرەو کەراجی بەغداد چووین ، سواربووین ،هیشتا نزیک نیوەڕۆبوو گەیشتینە بەغداد ، بەرەو شارع الرشید چووین وەک لەبیرم مابێت بۆ (فندق) (هۆتێل ترۆکادیرۆ )، دیمان یەککەس پارێزگاری بەشەکەی ئەویئەکرد، کەپرسیمان بەڕێز مام جەلال لەکوێیە ،،،؟ ، وتی: بەڵێ لێرەیە ئیشتان چیە پێی ،،،؟ ، وتمان ئیشی بەپەلەمان پێیەتی ئەمانەوێت بەڕێزی ببینین، وتی: لە حەمامە خۆی ئەشوات ،بڵێم کێ هەواڵت ئەپرسێت، ناوی خۆمان دایـە، لەدوای چـاوەڕوانی، بەرێـزی بەسەری تەڕەوە هات بۆلامان ، سەری هیشتا تەڕبوو ، شانەی ئەکرد لەدوای پرسین وهەوال و بەخێرهاتن وتی: فەرمون ئەومەبەستەی بۆی هاتبوون چیە ،،،؟، کاک ئەنوەر بۆی باسکرد وهەندێک ڕاسپاردەی سلێمانی پێراگەیاند ، لەدواییدا فەرمووی قابیلە ئێمە ئاگادار نەبین لەم بارو کیش وهەوایە بێدەگبین ، خەمتان نەبێت بەیانی بەناوی موشاوەرەوە و موقابەلەی هەندێک لەسەرانی عەرەبەوە بەتاییەت لەگەڵ جەمال عەبدوالناسر ،بەتەیارە دەگەمە بێروت .
.ئیتر ئێمە دڵنیابووین هەر ئەوڕۆژە گەڕاینەوە بۆسلێمانی ، بۆ ئێوارەی ڕۆژی دوایی لەڕادیۆو لەهەندێک ڕاگەیاندنەکانی جیهانیدا گوێـمان لە کۆنگرە ڕۆژنامەییەکەی جەلال تاڵەبانی بوو کە لە بێروت گرتبوی، دەربارەی گیرەگرفتەکان و هەنگاوەکـانی وتـووێژو پەیوەنـدیەکانی لەگەڵ سەرانی حیزبی بەعس، ئەو هەنگاوانە نراوە بۆ جێبەجی کردنی داواکاریەکانی نەتەوەی کورد ، وبەراوردکردنـــی لەگەڵ داواکاریەکـــانی نەتەوەی کـــورد لەلایەن ســـەرکردایەتی کـــوردەوە کەپێشکەشکراون کەزۆر دورن لەیەکتری ومافی نەتەوەیی کوردی تیا ڕەچاو نەکراوە.
لەدوای ماوەیەک بەرامبەر ولەوەرامی داواکاریە نەتەوەییەکانی کورد، سەرانی حیزبی بەعسی عەرەبی، پرۆژەیەکیان بڵاوکردەوە بەناوی (ئیدارەی لامەرکەزی)، یەک لایەنـی بـوو بێـئەوەی

پرسیان بەکورد کردبێت وڕازامەندی کوردی تیابێت ، وەک لەبیرمابێت بەشێکی کەمی تەسککراوەی کوردستانی خواروی ئەگرتەوە بەندەکان و شێوەی بەڕێوەبردن ڕوننەبوو ، نەزانرا کە مەبەستی دەقادەقی لامەرکەزیەتەکە چیە ،،،؟بە چەندەها شیوە وجۆر ومانا لێکئەدرایەوە . خەڵکی بەگومانەوە و گاڵتەجاڕیەوە سەیری ئەو پرۆژەیانئەکرد ناویان نابوو ( لامەخفەری ) . شان بەشانی ئەم پرۆژەیەش بڕیاریاندا کە هێزێکی سەربەمیری دروستبکەن لەلاوانی کورد بە ناوی (فرسان سەلاحەدین ) کەمەبەستیان سەلاحەدینی ئەیوبی بوو کە کورد ناوی چاش سەلاحەدینی لێنا .

لەگەڵ ئەم هەنگاوانەدا دەستیانکرد بەگرتن وکوشتن و ڕانان دەرکردن و نانبڕین دورخستنەوەی دڵسۆزان و کوردپەروەران و ڕۆشنبیرانی کورد .بەردەوامبوون لە ئۆپەراسیۆنی سەربازی دژی شۆڕشگێڕان .

هەردەم خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆ ئەو ڕۆژەی بتوانن گورزێک زەبرێکی توندی لەپڕیدەن ، لەنەتەوەی کورد شۆڕشەکەی .

بەدرێژای ئەوماوەیە خەریکی ڕاونان و دەرکردن و ئاوارەکردنی کوردان بوون بەتایبەت لە و شوێنانەی کوردستان کەکوردو عەرەب تێکەڵاوبوون و بەمەبەستی تەعریب کردنی کوردستان و داگیرکردنی مال و موڵک وزەوی وزاریان چۆڵکردنی دێهاتەکان ، لەوڕووەوە بەردەوام دەست بەکاربوون .

لەهەموو شارەکاندا میلیشیایان دروستکرد لەلاوانی ڕەگەزپەرستانی عەرەب (عونسوری عربی ) دژ بەمرۆڤایەتی و ڕەوشتی بەرز فەرمودەکانی ئایینی بۆگرتن وکوشتن وڕاونانی ئازادیخوازان و نیشتمانپەروەران و ئاشتیخوازان دیموکراتیخوازان لەهەموو عێراقدا ، لەناوبردنی ئەو کەسانەی کەلەگەڵ خەتی ئەواندانین ، میلیشیاکەیان ناونا (حرس القومی ) ، هەرچی ڕەوشت نزمی و کاری نامەردانە هەیە کردیان بەرامبەر بەرامبەر بەدانیشتوانی سڤیل تاڕادەی دەست درێژی کردنەسەر ناموس وموڵک و ماڵی خەڵکی وگرتنی بەکۆمەل و لە ناو بردنیان بەشێوەیەکی دڕندانەی بێوێنە . هەموو بەندیخانەکانیان پڕکرد لەلاوانی بێتاونی کوردو عەرەب .

ڕۆژ بەڕوژ کارو رەفتارو توندوتیژی کار بەدەستانی عەرەب بەرەو خراپترو ئاشکراتر ئەچوو ، کات بەرەو مانگی مایس ئەچوو (زەعیم سدیق) خەریکی خۆئامادەکردن وخۆ توندکردنبوو بنکەو هێزەکانی هەردەم لە ئامادەباشیدا بوون ، لەدەوری شاری سلێمانی دەستی کردبوو بە دانانی (ڕەبییە و مەفرەزەی ) زۆر ، وتیان خەریکە سەرقەبران تەلبەند بکات ، هەستی پێئەکراو بۆنی ئەوەی لێئەهات ولەناو خەڵکیدا واباو بوو ، کەبەنیازە ( مەنعی تەجەول ) بکات لەزۆرشارو شارۆچکەکانی کوردستاندا .

ئێمەیش لەوکاتەدا بیرمان لەوەئەکردەوە چیبکرێت باشە ،،،؟، بەرامبەر بەم نیازە گڵاوانەی بەعس ودارو دەستەکەیان ،لەکاتی رودان و ئەنجامدانیدا چۆن خەڵکی خۆیان لێی بپارێزن ،،،؟ .



لە باخی فەرەج لەساڵی ١٩٥٥دا ، لەڕاستەوە بەڕێزان :

١/ کەمال میرزاغەفور ٢/ محەمەد باقی سەعید ٣ / حسەین محەمەد ڕەحیم (سەید گوڵ) ٤/ ئیبراهیم شاڵی ٥/ فەتاح مەلا ڕەسوڵ بەتایبەت لەهاویندا لەژێر سێبەری دارەکاندا چاو پاقلەمان ئەخوارد وشوێنی کۆبوونەوەی لاوان و ڕۆشنبیران بوو.

# باخی فەرەج

باخی فەرەج بەشێکی ئەکەوتە شوێنی ئیستای سانەوەی کچانی سەرکارێز (دواناوەندی کوردستانی کچان ).مزگەوتی سەرکارێز لەسەروەی بوو کەتێکدراوە کراوە بەفوڵکە ، کەشەقامی سەیوان لێرەوە دەستپێئەکات ، لە خوارەوەی (باخی شێخ لەتیفی دانساز )هەبوو ، لەسەرەوی ماڵی (عەزمی بەگی بابان) هەبوو ئەمڕۆ هەموویان کراون بەفوڵکەو چوار ڕێان ودوکان ، لەخواریانەوە (گونجی حەسەن بەغدادی) و (هۆمەر مەندان ) هەبوون ، باخەکە ڕوبەرێکی فراوانی هەبوو داری بەرزی زۆری تیابوو .بەناوی (فەرەجی حەمەمورادەوە) ناو بانگی دەرکردبوو کەچایچی بوولەوێ.

زۆرجار دوای نیوەڕۆ ئەگەرکارو کۆبوونەوەمان نەبووایە ئەچووین بۆ (باخی فەرەج ) بۆدانشتن و چاخواردن و پاقلەخواردن بەتایبەت لە هاوین و بەهارو پایزدا دا کورسی تەختەی سادە هەبوو لە سەری دائەنیشتین لەبن دارەکانی باخەکەدا بەم شێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ لە گەڵ یەک دائەنیشتین بەقسەی خۆش و نوکتەو سیاسەتەوە خەریک ئەبووین ، زۆرجاریش کۆبوونەوەی ڕێکخستنی حیزبی تیائەکرا کە لاوانی هەردو حیزبە سەرەکیەکە ( پارت و تەحەرور ) لەوێ کۆئەبوونەوە، وەک شوێنێکی کەلتوری کوردی وکەلەپوری نەتەوایەتی لێهاتبوو ، ڕۆشنبیران و خاوەن بیری هەمە جۆر و بەئەزمونەکان لەپیروجوان لەوێ دائەنیشتن .

جاری واهەبوو پارتیەک و شیوعیەک لەگەڵ یەک ئەکەوتنە قسەو باس ڕۆنکردنەوەی بیروباوەڕو گۆڕنەوەی تیوری حیزبەکەیان بۆ یەکتری ، جارهەبوو لەئەنجامی گفت وگۆدا دەماری لایەکیان گرژئەبوو کارئەگەیشتە دەمەقالێ .

زۆرجار لەگەڵ (ئەوڕەحمانی خامە ) دائەنیشتین کە ئاسنگەربوو کەواو سەڵتەی لەبەردابوو زۆر بەتەمەن بوو هەردەم ئێواران لە باخەکەدا ئامادەبوو، قسەکانی زۆر خۆش و نەستەق بوو لە گەڵ نوکتەو بەسەرهات و سەرگوزەشتەی خۆشی پێبوو .

جارجارە پیاوێکی پیرئەهات کەواو سەڵتەلەبەربوو ناوی

( میرزا عارف ) بوو زۆرشارەزای ئومـوری دینی بوو هەڵوێست و تێبینی لەسەر ڕوداوە مێژوییەکانی پەیوەند بەکوردەوە هەبوو زۆر شارەزابوو بەوپیریە ڕۆشنبیر بوو قسەو بیرۆکەکانی مەتقیبوون کەباسی ئەبوو؛؛هورەیرەی ؛؛ ئەکرد ڕەخنەی لەسەری هەبوو، لەوکاتانەدا باسی عەشێرەتە عەرەبەکانی ئەکرد دەرلە ئایینی ئیسلام چیان بەکوردکردوە. لەولاشەوە ( کاک ئەحمەدئەولێ ) هەبوو برای کاک مەحمودی ئەولێ بوو پارتی بوو ، ماکی موجادەلە بوو لەگەڵ شیوعیەکاندا بۆنوکتە جارێکیان ئێمە لە باخی فەرەجی حەمەموراد دانیشتبووین لەپڕ هەرا

پەیدابوو ، تومەز کاک ئەحمەد داسێکی بەدەستەوەبوو بە بەرامبەرەکەی ئەوت بەس بڵی کورد ئوممەنیە ،،، تابەم داسە سەرت لێبەکەمەوە لە لەشت ، ئەگەرنەڵێیت (کوردئوممەیە ) خۆت ئەبینیتەوە .

(لەوکاتانەدا شیوعیەکان بە پێی بیرو ئامۆژگاری سەرکردەکانیان ئەیان وت کورد ئوممە نیە، مەرجی (ئوممە)نەتەوەی تیانیە، بەوهۆیانەوە مافی ئەوەی نیە دەولەتی سەربەخۆی هەبێت) .

جاری واهەبوو (حەمە گاسوار) خەڵکی ئەو گەڕەکەبوو بەقاتێک جل و بەرگی کوردی وپەستەکێکەوە لەوناوەدا ئامادە بوو ، ئەوقسەو موبالەغە خۆشە بەرێو جێیانەی بەلای خۆیەوە کە باسیئەکرد گێڕانەوەویەکی خەیاڵی دروستکراوی خۆشبوون، کە ئەمڕۆ لە فلیمی کاراتۆنیدا شێوەیان هەیە کەپرن لەکاروچالاکی خەیاڵی، ئێمە زۆرمان خۆش ئەویست زۆر جارگوێمان لێ ئەگرت .

ئەم باخە لەساڵەکانی پەنجاکانەوە شوێن کۆبوونەوەو بەیەکگەیشتن ودانیشتنی خەڵکی ناو شارًبوو بەڵام لەم دواییەدا ئەوخۆشیەی نەما بەهۆی زوڵم وزۆری کاربەدەستانی عەرەبەوە بەتایبەت زەعیم سدیق ودارودەستەکەی.

ئێوارەیەک لەکۆتایی مانگی مایس دا لەباخی فەرەجی حەمەموراد لاوی هەڵکەوتو شاعیرو وتەبێژی جەماوەری خەباتکەری کەم وێنە (کاک کامەران موکری) مان دی لای دانیشتین، دەربارەی ئەو بارەخراپە قسەمانکرد کە بیری خەلکی پێوەی خەریکەو بەگومانن لەکاری خراپی زەعیم سدیقی خوێنرێژ، ئەویش لەو باوەڕەدابوو کە بەعس دەستێک ئەوەشێنێت بەتایبەت دژی شاری سلێمانی، هەر خەریکی خۆئامادەکردنە ، ووتی ئەوەی ناودارەو ناسراوە و دەرکەوتوە پێویستە وباشتر وایە بۆماوەیەک لەشار دوربکەوێتەوە بچێت بۆ شوێنێک یان بۆ لادێیەک ، تابارەکە بەلایەکدا ئەکەوێت ، یان بارەکە تۆزێک ڕۆشنئەبێتەوە . وتی : بەتەمام بەم زوانە سلێمانی بەجێ بهێلم بۆماویەک لەلادێ بمێنمەوە .

( لەهاوێنی ساڵی ١٩٦٣دا لەدوای مەنعی تەجەولـەکـە لـەدەرەوەبـووم چوومـە شـارۆچکەی بەرزنجە ، دیم کاک کامەران لەوێیە و شەوێک لەماڵی خوشکێکم بەیەکەوە ماینەوە ، باسی ئەو ڕۆژەمان کرد کەلە باخی فەرەج وتی :من لە شار نامێنم بۆماوەیـەک دور ئـەکـەومـەوە ، لـە ڕاستیدا هەتا ئەوکاتەی هاوێن هەر لە بەرزنجە بوو ، خۆی پاراست ).

# مەنعی تەجەول بەڕێوەبوو ...!

ئێواران کە لە کارو فرمان وئەرکەکان ئەبووینەوە یان دوای بای فەرەج ، یەکسەر رومان ئەکردە شەقامی مەولەوی لە چایخانەکەی (مام ساڵح ) کۆئەبووینەوە چامان ئەخواردەوە لای (دوکانی حسەڕەشی خەیات )خەبەری ڕوژانەمان باسئەکردو تۆزێک لای (کاک ئەحمەدی میرازاغەفور خاوەنی کۆگای شیرین) لامانئەدا قسەی خۆشمانئەکردو لەوبەری شەقامەکە ، لە بەردەم دوکانی (نووری قەزاز) لەسەرشۆسەکە ئەوەستاین و باسی ڕوداوی ڕۆژانەمان ئەکرد بەشێک لەبرادەران ئەهاتن و هەندێک ئەڕۆیشتن بەقسەوباس وخوازەوە وقسەی خۆش ونوکتەوە ئێواران خەرێکئەبووین، ئەوبرادەرانەی هەمیشە ئامادەبوون ئەم بەڕێزانەبوون کە زۆرترین ئێواران لەوناوەدا ئامادەبوون[ شەهیدان ،ئەنوەر سەعید دارتاش ، محەمەد حەمە ساڵح (حەمەبۆر )، یاسین محەمەد سالح، ئیسماعیل ئیبراهیم(بەلوعە )]، م.کەمال میرزا غەفور جارجارە جەمال ئاغا لەوناوەدا ئەبوو لەولاشەوە، شەهید خاڵە شەهاب لە چایخانەکە بەزۆری ئەبینرا.

لەوکاتانەدا من و ئەنوەردارتاش وەک مامۆستا گەڕابووینەوە بۆ سەرکارەفەرمیەکانمان باری درامەتیمان بەرەو چکابوون ئەچوو ، گیروگرفتی درامەت وبژێویم نەما.

مانگی حوزەیران دەستی پێکرد لەڕۆژی ١ /٦ /١٩٦٣ نامەیەکم بۆهات لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەرەدەی سلێمانی ئەمری تیابوو کەدانرابووم بەچاودێری تاقیکردنەوەی گشتی پۆلی شەشەم و پۆلی سیی ناوەندی لەڕانیە، زۆرم پێ ناخۆشبوو ئەم ئەمرەم پێخۆش نەبوو بەدڵنەبوو ، لەوەپێش ئاگادار نەکرابووم ، داوام نەکردبوو دابنرێم ، واباوبوو مامۆستایان خۆیان داوایانئەکرد ، کەچوومە سەریان وتم بۆچی دانراوم خۆمن داوام نەکردوە واسیتەم بۆی نەکردوە ئەم ئەمرەم بەدڵنیە وبۆچی دانراوم بێئەوەی پرسم پێبکەن ؟،،،، وتیان کەس نەبوو ئارەزوی هەبێت ( وەک واجب و فەرمی ) تۆمان داناوە وەک ئەمر ئەبێت (هەربچیت) لەتۆمان ڕابینیوە.منیش ناچاربووم، ئێوارەی ٤ /٦ /١٩٦٣ جاران ئاسایی هاتم بۆ شەقامی مەولەوی بۆچایخانەکەی مام ساڵح دوای چاخواردنەوە هەڵساین چووینە ئەوبەری جادەکە وەستاین ئەوئێوارەیە من ، کەمال میرزا غەفور، ئەنوەر دارتاش ، حەمەبۆر (محەمەد حاجی ساڵح) ڕاوەستابووین لەولاوە کاک یاسینی وەرزشوان ( یاسین محەمەد سالح) ئیسماعیلی بەلوعە ( ئیسماعیل ئیبراهیم ) پەیدابوون ، وەک مەسەلە کوردیەکە ئەڵێت شارەکە شێوابوو بۆنی خوێنی لێئەهات خەڵکی لەگومان و ترسدا ئەژیان ئەم چەند ڕۆژە چی ناخۆشیەکی بەدواوەدێت .

ئەو ئێوارەیە باسەکەمان هەر لە سەر وەزعی شارەکەبوو سەربازەکانی زەعیم سدیق چۆن بە سەرجادەکاندا ئە سورێنەوە لەدەم و چاویاندا تورەییو هەرەشە هەستپێئەکرا ، مەترسیان خستبووە ناو دڵی دانیشتوانەوە، چۆن زەعیم سدیق بە مودەرەعە بەناو شاردا ئە سوڕایەوە، ئامادە بۆکوشتن و دەستدرێژی بۆسەر خەڵکی بێتاوان و ئەنجامئەدانی کاری نامەردی، بیرمان هاتە سەر ئەوەی کە ئاگاداری خەڵکی بکرێتەوە و وریای خۆمانبین ئاگاداربین، هەریەکە بیربکاتەوە لەچارە سەری گونجاو، شوێنێک بدۆزێتەوە خوی تیاحەشاربدات ، تاخۆی دوربگرێت لەکاتی ڕودانی (مەنعی تەجەول) .

لەولاوە یاسین هەڵی دایەو هاتەقسە وتی:کوڕێنە لەبەر ئەوەی من سەرکارو بەڕێوەبەری یاریگای گشتی سلێمانیم ، شوێنی چاک و ژوری تایبەتی تیایە لەگەڵ نوێن وپێویستی تایبەتی ، ئەتوانین لەوێ خۆمان بشارینەوە و ئەمینە ، بڕواناکەم کەس پێمان بزانێت و زەفەرمان پێببات ، ئێمە هەموومان ئەم بیرۆکەیەو تەگبیرەمان پەسەندکرد، بەچاکمان زانی بۆ شەوی داهاتوو هەربۆ تاقیکردنەوە لەوێ شەو بمێنینەوە .

بەڕاستی شەوێکی مێژووی پڕلەخۆشی و کەش و هەوای برادەری بوو بەیاری وقسەی خۆش ئەو شەوەمان بردەسەر .

من بەبرادەرانم وت: کوڕینە نامەیەکم بۆ هاتوە لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەدەوە کە بەچاودێر دانراوم بۆ تاقیکردنەوەی گشتی پۆلی شەشەم وپۆلی سێی ناوەندی لە ڕانیە من لە بەیانیەوە ئەبێت بچم . چوومەسەریان وتم : تا ئەمڕۆژ کەس بیری منی نەبووە بەچاودێر دام بنێت بۆتاقیکردنەوە ، وتیان کەسمان دەست نەکەوتوە و وەزع باشنیە کەس ئامادەنەبووە ، برادەران وتیان بۆچی ناچێت ،،،؟، ئەوڕۆژە دواحافیزیم لەبرادەران کرد نەمزانی دواخواحافیزی هەتاهەتایی ئەبێت لەگەڵیاندا، جارێکی تر نایان بینمەوە بەر کارەساتی ٩ نۆی حوزەیران ئەکەون

لەڕۆژی٦ / ٦ / ١٩٦٣ دا بەناڕەزاییەوە بەناچاری بەڕێبووم بەرەو ڕانیە ، کەپێم ناخۆشبوو بەڵام وەک بۆم دەرکەوت لەدواییدا ئەنجامەکەی بەخێرگەڕا بۆم ژیانم لە مردن ڕزگارییبوو

***

## کارەساتی ٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣

ڕۆژی ٦ / ٦ / ١٩٦٣ لەگەڵ عەبدولخالق جەبـاری بەرەو ڕانـیە کەوتـمەڕێ بـۆ ڕاپەڕانـدنی کارەکەمان ( بۆتاقی کردنەوەی گشتیی قوتابیانی پۆلی شەشەمی سەرەتایی وپۆلی سێیەمی ناوەندی )ئەو ڕۆژە کار وپێویستیەکانی تاقی کردنەوەمانوەرگرت ، ئامادەکرد .

لەڕانیە ئیوارەی ڕۆژی ٧ /٦ کاتێک بۆپیاسە هاتین بۆ ناوشار ، سەیرمکرد کاک ئەنوەر دارتاش لەبەردەمدا قوتبووەتەوە ، مۆسکۆڤیچە سەوزەکەی دارای تۆفیقی ئاغا فەتحوڵلای پێبوو .

[ کاک دارا تۆفیق کەکۆمۆنیستبوو دوای ئەوەی لە دەستی بەعس هەڵهاتبوو پەیوەندی کردبوو ،ماوەیەک لەسلێمانی پاراستیان دوایی چوبووە ناو پێشمەرگەوە.

ئێمە لەماڵی عەبدولخالق جەباری لەدەوری بووین تاپەوانەی ناو پێشمەرگەکرا دوایی لەڕیزەکانی ڕێکخستنی پارتی دا پلەی بەرز بوو تاگەیشتە پلەو ئاسـتی سـەرکردایەتی لەنـاو پارتیـدا و سەرنووسەری ڕۆژنامەی خەبات ، پیاوێکی وریاو هەڵکەوتوو و ڕۆشنبیرو ئازادیخوازو خەبات کەر بوو ، بەداخەوە ڕژێمی بـەعـسی فاشێـست لـە سـاڵەکـانی حـەفتاکانـدا لـە بـەغـداد گرتـی و سەرنگومیکرد وتیرۆرکرا].

. دارای تۆفیقی ئاغا فەتحوڵلە مۆسکۆڤیچەکەی پێش کەشی ڕێکخـستنەکـانی پـارتیکردبوو، بەدەست کاک ئەنوەرەوەبوو.

کە دیمان کاک ئەنوەر لە گەڵ باقی حاجی جەلال و سەیدقادرە و چەند برادەرێکی کەسایەتی خەڵکی ڕانیە وەستاوە ، بەرەو ڕویان چووم ، وتم کاک ئەنوەر خێرەچی تۆی گەیاندوەتە ئێرە ، وابەپە لەهاتوویت ،،،؟، کاک ئەنوەر وەرامی دامەوە وتی: بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری حێزب هاتوم ، بەیانی ئەبێت بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی .

بەیانی ڕۆژی ٨ /٦ چووم بۆلای تکام لێکرد کە نەڕواتەو چەند ڕۆژێک لە ڕانـیە بمێنێـتەوە ئارامبگرێت بارەکە باشنیەو ترسناکە لەسلێمانی بەعس نیازی خراپە ،،، وتی لەسلێمانی ئیشی بەپەلەم هەیە، ئەبێت هەربگەڕێمەوە، وتم مادام تۆ ئەوەندە بەپەلەیت ئـارەزوی خـۆتە بەڵام پێـمخۆشنیە بڕۆیت، وتم ئەوخوشکە زایەم لە گەڵ هاتوە ، بیری ماڵەوە ئەکات لەگەڵ خۆت بیبەرەوە و تۆزێک پەنیرم کڕیووە بۆم بەرەوە بۆماڵی خۆمان ، بەناچاری دوعاخوازیم لێکرد نەمزانـی دواخواحـافیزیە جـارێکی کە لەژیانـدا نـابیینمەوە ، هەردەمەو نیوەڕوبـوو گەڕایەو بۆسلێمانی .

[ لەدواییدا لەماڵەوە باسیان بۆکردم وتیان : هەر ئەو ئێوارەیە کەبەیانی مەنعی تەجەول بوو هات بۆلامان هەواڵی تۆو ڕاسپاردەکانی گەیاند وباسی باری گران وناخۆشی شارەکەی کردبوو

**دایکم تکای لێکردبوو کەوەزع خراپە تۆش کوڕمانیت لای ئێمە بمێنەرەوە ، وتبووی خەمتان نەبێت شوێنی تایبەتی باشم هەیە و ئەمینە کەس دەرکی پێناکات وەک بۆیـان گێـڕامەوە لەلای دایکم گلەیی بەختی خۆی کردبـوو، کەبەهـۆی سـەرقاڵی وئـیش وکـارەوە نەمتوانیـوە خێزانێک بۆ خۆم پێکەوەبنێم، دایکم دوبارە وتبووی تۆش کوڕمانیت تکایە بمێنەرەوە مەڕۆ ، دیسان دوبارەی کردبووەوە ، کەشوێنەکەم زۆر باشەو لێرە ئەمینترە ئەگەر مەنعی تەجەولکرا کەس پێمان نازانێت لەگەڵ هەندێک برادەر لەوێ ئەبین ] .**

**لەدواییدابۆم دەرکەوت مەبەستی هەر یاریگە گشتیەکەی سلێمانی بووە کەشەوانە مامۆستایان ئەنوەر سەعیددارتاش ، محەمەد حاجی ساڵح ، یاسین محەمەدساڵح ، ئسماعیل ئیبراهیم لەوێ ئەمانەوە .**



شەهید مامۆستا ئیسماعیل ئیبراهیم بەلوعەچی — شەهید مامۆستا محەمەد حاجی سالح (حەمە بۆر) — شەهید مامۆستا یاسین محەمەد سالح — شەهید مامۆستا ئەنوەر سەعید دارتاش

## چوارشەهیدەکەی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان و پۆلەشەهیدی شاری سلێمانی

ئەو شەوەی کە بۆ بەیانیەکەی (مەنعی تەجەول ) بوو لەرۆژی ٩ /٦ /١٩٦٣ هەرچواریان بەدڵنیایی لە مەڵعەبەکەدا نووستبوون، تاریک و ڕونی بەیانی لەبڵندگۆی مزگەوتەکانەوە ئیعلانی (مەنعی تەجەول) ئەکرێت، بڵاوئەکرێتەوە کەنابێت کەس لەماڵیخۆی بێتەدەرەوە، وهاتو چۆبکات بەپێچەوانەوە توشی سزای توند ئەبێتەوە یان تەقەی لێئەکرێت، ئەوشەوە بە بەرێزان :

١/ ئەنوەر سەعید دارتاش

٢/ یاسین محەمەد سالح

٣/ محەمەد حەمەسالح

٤/ ئیسماعیل ئیبراهیم

لەناو ژورەکانی یاریگا کە مابوونەوە کەگوێیان لە بڵند گۆ ئەبێت (مەنعی تەجەول ) دەست پێئەکات خۆیان لەژورەکاندا توندئەکەن دەرگا لەسەرخۆیان دائەخەن .

سەربازەکانی زەعیم سدیق ، هەربەیانی زوو دابەشئەکرێن بەسەر شووێن وبەشەکان و گەرەک وشووێنە گرنگەکاندا، کۆمەڵ بەکۆمەڵ لەشوێنی دانراودا جێگیر ئەبن،کۆمەڵێکیان مەلعەبەکەیان بەرئەکەوێت، دێنەناو یاریگەکەوە ، ئەیکەن بەڕەبیەو بنکەی کۆکردنەوەی گیراوانی ئەوناوچەیە، تا لەوێ بەکۆمەڵ بیان نێرن بۆ شوێنی مەبەست وەک حامیەو ئینزیباتخانە وئەمن.

کاتێک یاریگاکە ئەکەنە ڕەبیەو بنکەی کۆکردنەوەی گیراوەکان و ڕەوانەکردنیان بۆ شوێنی مەبەستیان، بۆ ئەمجامدانی کاری تایبەتی و پێویستی خۆیان دەرگای ژورەکان ئەشکێنن، هەرچواریان لە ناو ژورەکاندا ئەبینن دوست گیریان ئەکەن، لەگەڵ کۆمەڵێک گیراوی تر بەبەند کراوی دایان ئەنێن .

هەندێک لەگیراوەکانی ئەو گەڕەکەو دەوروپشتی گێڕایانەوە کە ئەوچوار مامۆستایە لگەڵیانبوون لەناوگیراوەکاندابوون .

( کاک ئەنوەر دەمانچەیەکی تاریقی پێبوو ، لەدەمانچە تایبەتیەکانی ئەفسەرەکانی سوپابوو ،حیزب پێیدابوو لەبەر پشتێنەکەیدابوو بیر بۆئەوە ئەچوو کەلەوێ لەوانەیە پێی بوبێت لێیگیرابێت ).

وەک ئەوکەسانەی گیرابوون لەدواییداگێرایانەوە سەربازەکان هەرلەوێوە هەندێکیان بردبوون بۆئینزیباتخانە، لەوێ کە سەیری تۆماری ناوەکانیان کردبوو ، ناوی کاک ئەنوەریان دۆزیبووەوە کەچوار مانگ لەوە پێش لەوێ زیندانیبووە وتازەبەربووە ناوی هەرلەوێمابوو .

گێرایانەوە کەتا ئینزیباتخانە ئێمە لەگەڵیان بووین دوایی دابەش کراین نەمانزانی بۆکوێ بران.

وەک لەدواییدا دەرکەوتوە هەرئەو ڕۆژە جیایان ئەکەنەوە بەرەو کارێزە وشک ئەیانبەن ، لەوێ هەرچواریان بەر گولله ئەدەن هەر هێشتا زیندوبوون بەشۆفڵ ئەیانکەن بەژێر خۆڵەوە ، لەگەڵ کۆمەڵێکی کەلە دانیشتوانی شارەکە ، وەک مامۆستاحاجی باقی ، کەمالی محەمەدی حاجی فەرەج ئەفەندی ، نامیق ئاغا وکەسانیکە زۆربوون هەر کۆمەڵەی لە شوێنێک تیرۆرئەکەن . لەشارو شارۆچکەکانی کوردستان هەربەم شێوەیە خەڵکیان گرتبوو بەشێوەی ئامان تیرۆریان کردبوون .

[یەکێک لە شەهیدەکانی کارەساتەکە حاجی باقی بوو خەڵکی شاری کۆیەبوو مامۆستای زانیاری بوو لە دواناوەندی سلێمانی ،بیرو بۆچوونی چەپ ڕەوی هەبوو ، پیاوێکی بەهەڵوێست و دڵسۆز بوو ، لە لای خەڵکی خۆشەویست بوو ، قسە خۆش بوو خەڵکی زۆر حەزیان لێ بوو گوێیان لە قسەکانی بێت ، ژنی نەهێنابوو ، کرێچی بوو لەماڵی ئەحمەدی داود لە سابوون کەران بەرابەر مزگەوتی سەید حەسەن . ڕۆژی مەنعی تەجەول کەهاتبوون بۆ پشکنینی ماڵەکەی ، دور بینێکیان دۆزیبووەوە بەوهۆیەوە گرتیان لە کارێزەوشک لەگەڵ مامۆستاکانی تر تیرۆریان کردبوو] .

هەر ئەوڕۆژە هەموو مالەکانی شاری سلێمانی و دەورو بەری و شارەکانی کەیان بەودەردە بردبوو، هەرکەسێک لەماڵ سەری دەربهێنایە کوژرابوو ، لەناو ماڵەکاندا زۆر کەسیان تیرۆرکرد وەک بۆ نمونە ، کەئەچنە ماڵی مامۆستامستەفا عەبدو الرحمان لەناو حەوشەکەیاندا لەبەرچاوی دایکیان و خێزان و ماڵ و منداڵ، هەردو برا کەی تیرۆر ئەکەن ، ناتوانن بچن لەسەر قەبران بیانێژن ناچار لەحەوشەکەی خۆیاندا ناشتیانن . هەروەها لەمزگەوتەکەی جولەکان کە جاران کەنیشتەی جۆلەکان بوو گۆڕی دوپیاوی لێیە بەناوی حەمەی جگەرە بەلێو و براکەی عەبدو الوهاب ، کوڕی مام عەزیزی شیلم فرۆش ئەوڕۆژە تیرۆر کران ، کەبەناچاری لەو مزگەوتەدا نێژران .




**مامۆستاحاجی باقی  شەهید**



**پۆلێک شەهیدی نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣ کەشەهیدکران هێشتازیندووبوون لەکارێزەوشک بەشۆفڵ کران بەژێر خۆل**

## بەندکراوەکانی تەویلەکانی حامیە

لەمەنعی تەجەوڵەکەدا لە ئۆپەراسیۆنی سەر بازیدا (٥) پێنج هەزار لاو وپیرو جوان فرمانبەرو پیاوی میریان گرت وکۆکردەوە لەمووچەخۆرو فرمانبەرو دوکتۆرو موهەندس و کاسب و بازرگان و مامۆستاو قوتابی و پەککەوتەو نەخۆش وخاوەن پلەوپایە و ئەفسەری کورد کۆیان کردنەوە بەزیلی عەسکەری بەرووتی وبەجلی خەوەوە بردیانن بۆ سەربازگەی سلێمانی (حامیەی سلێمانی ). لەقاوشەکاندا کەتوێلەی وڵاخ بوون هەمووی گەوڕبوو ، (پڕبوون لە پەیین و تەسی وڵاخ و کەڕو وپیسی)، بەندیانکردن و توندیان کردن بەمەبەستی تیرۆرکردن و لەناو بردنیان لە کەس دەستیان نەپاراستبوو ، ڕۆژانە زۆریان ئەبرد بۆ گوللە بارانکردن ،هەرلەوناوەدا دادگایەکی سەرپێیان پێکهێنابوو بۆکاری کوشتن و لە ناوبردن .

زۆرترین بەندکراوەکان  توشی نەخۆشێ و سکچوون ورشآنەوەبوون ، لەبەرئەوەی شـوێنەکـە شیاوی ژیانی مرۆڤ نەبوو ، ڕێگەی چوونەدەرەوە دەستبەئاو گەیاندن لێیان قەدەغەکرابـوو لەگەڵ  سکچوون و ڕشانەوە زۆریان خۆیان پیسکردبوو ،هەندێکیان لە ناو تەویلەکاندا گیانیان لەدەسـتدا ، بەوشـێوەیە کۆکرابـوونەوە بەنیـازی ئەوە بـوون  هەموویـان ڕەشـەکوژ بکـرێن (جێنۆساید )

.(ئەوەی شایانی باسە کۆمەڵکوژی کورد ویەکەم هەنگـاوی سـەردەمی بەعـس وشـۆڤێنیزمی عەرەبی بەم شێوە نوێیە لێرەوە دەستپێئەکات) ، بەڕاستی کارەساتێکی مرۆڤایەتی بێوێنەبوو ، کەزۆرلایەنی مرۆڤایەتی ئەمڕۆ خۆیان بەدیموکرات خواز ئەزانن و فرمێسک ئەڕێژن بۆ مروڤایەتی ومافی بەشکخوراوی مرۆڤ باسی یاسای نێودەوڵەتی و پیرۆزیە ئاسـمانیەکانئەکەن ، بـەنـاو بەرگری لە  هەموو مرۆڤایەتی ئەکەن ، لەزۆر سەرچاوە وهەواڵەوە  ئەیان بینی و دیان میللەتی کورد چی بەسەرهاتوە بەدەست بەعسی فاشیست  وشۆفێنیزمی عەرەبەوە ، گیانی مرۆڤایتی و بەزەیی و  دەرونیان ساتێک نەچوولاو ورتەیان لەخۆیان بڕیبوو .

نە نەتەوەکانی دراوسێ . نە ناوەندیکیان  ڕێکخراوێکیان لایەنێکیان کەسێکیان نەجولان، گەلانی جیهان نەجوڵان تەنها هەر بڵێن  بۆ ئەم گەلە موسوڵمانە بەشخوراوە دابەشکراوە ئاشتیپەروەرە بۆ،،، وایلێبکرێت ،،، بۆ ،،،؟،کۆمەڵ کوژبکرێت ،،،؟.

{وەک هەندێک لە گیراوەکان دوای بەربوونیان بۆیان باسکردم ، گێرایانەوە کە  هەموو ڕۆژێک ئەهاتنە ژورەکانەوە لیستێک ناویان بە دەستەوەبوو ئەیان خوێندەوە بـۆ ئەوەی بیـانبەن بـۆ کوشتن و گوللەباران کردن وتیان ناوی تۆیشی تیابوو هەردەم  وهەموو ڕۆژێک ئەیانخوێندەوە وداوایانئەکرد .

# له هاوینی ساڵی ١٩٦٣دا كه بەنهێنی هاتمەوە بۆسلێمانی

ماوەیەک خۆم شاردەوە .لەماڵەوە بۆیان باسكردم كه چەندجار سەربازو ئەمن هاتونەتە سەرمان دوای تۆیان ئەكردو ، ماڵەكەیان پشكنیوە ، جنێوی ناشیرینیان ئەداو ئەیانوت كوڕەكەتان لە كوێیە و لەكوێ خۆی شاردوەتەوە ئەبێت پێمان بڵێن ،،،؟خوشكم گێڕایەوە جارێكیان بەقژراكێشان تادەرگای دەروە بردمیان ، منیش بیرم كەوتەوە كه ئەبێت ناوكەی منیان لە ئینزیباتخانە وەرگرتبێت ، كەلەوێ ناوەكان هەرمابوون .

بیریشم بۆئەوە چوو ئەگەر لەسلێمانی بوومایەو بێگومان لەیاریگا كه لەگەڵ ئەوپۆلە شەهیدەی هاوڕێم ئەگیرام ئەگەر لەماڵەوەش بوومایە ماڵی ئێمەیان ئەزانی هەر ئەگیرام و گولله باران ئەكرام بەدەردی براو هاوڕی شەهیدەكان ئەچووم ،دەمێكبوو چوبوومە ڕیزی شەهیدانەوە ناوم لە گەڵ شەهیداندا تۆماركرابوو }.

هەربۆ ئەو ماوەیە زەعیم سدیق (ژورێكی لێكۆڵێنەوە و ئەشكەنجەدان وكوشتن لەناو بردنی پێكهێنابوو ناویاننابوو (دادگا) ئامادەكرابوو بۆ ئەنجامدانی نیازەگڵاوەكانیان، لەتەویلەكانەوە روژانە خەڵكیان ئەبردە دەرەوە بۆ حامیە و كارێزەوشک بۆ گوللەبارانكردنیان).

وەک بەڕێز كاک هیوامولفتی بۆی گێڕامەوە كەخۆی لەو كاتەدا یەكێک بوو لەو ئەفسەرە بەندكراوانەوتی: (لەوكاتەدا ڕەئیس ئەوەل قاسم العزاز ، زابت ئیستخباراتی لوای ٢٠ بوو، یەكێک بوو لەتاوان بارەكان وئەنجامدەری كۆمەڵ كوژیەكە.

١/ سەرۆكی دادگا سەرپێیەكە (رئیس المحكمه العسكریه الفوریه) رائید جاسم الغازری بوو .

٢/ رئیس ركن فیسڵ عبدالحلیم كەئیستا لواء ركنەلەبەغداد . ئەندامی دادگاكەبوو .

٣/ دوكتۆر محەمەد عەلی حسەین توركومانی شیعی تەلەعفەری كەلەسلێمانی دوكتۆر بوو ئیعدامی فەوری بەدەستی بوو، ە دوایی هەر ئەوبوو( تەلقه الرەحمه ) ی ئەنا بەسەری ئەوەی هێشتا گیانی تیامابوو لەوانەی لەكارێزەوشک تیرۆر ئەكران.

پیاوێكی لۆتی شێتی دەهۆڵ ژەنییان دەستكەوتبوو لەگەڵ گیراوەكانبوو ناوی (عەلی بلبل ) بوو كەهەردەم بەقاتێک جڵی سپی كوردی و ، جوتێک پێلاوی سپیەوە بەشەقامەكانی سلێمانیدا ئەسوڕایەوە ، داوای پارەی لە خەڵكی ئەكرد ، خەڵكی خێڕی پێئەكرد ، كه ئەویش گیرابوو ، وتبووی من زۆركەس ئەناسم كه پێشمەرگەبوون ئەگەر ڕێگەم بدەن لەگەڵتان بگەڕێم ئەتوانم یەكە یەكە دەست نیشانی پارتی و پێشمەرگە بكەم، وتیان هەموو ڕۆژێک ئەیان هێنایە ناو ژورەكانەوە وەكو سەگی پۆلیسی ئەگەڕا بەناویاندا، بەناو گیراوەكاندا ئەسوڕایەوە یەكەیەكە

سەیری خەڵکەکەی ئەکرد لەگەڵ گەڕاندا بەناو بەندکراوەکاندا ئەم وشەیەی هەردەم دوبارە ئەکردەوە (چی ئەبێت بابێت) هەرکەسێکی ئارەزو بووایەو بیناسیایە کە لە سەرجادە لەوە پێش قسەی لەگەڵ کردبێت بۆ ئەوەی هەر پێشمەرگە یان سیاسی بووایە ، ئەیوت ئەمە پێشمەرگەیە بیگرن، لە گەڵیدا ئەیوتەوە (چی ئەبێت بابێت)، سەربازەکان پەلاماری کەسەکەیان ئەدا بۆ ژوری لێکۆڵینەوە بۆ کوشتن و گوللەبارانکردنی، لە دواییدا ئەم وشەیەی (عەلە بلبل ) بووە وشەیەک و مەسەلەیەک وتەیەک خەڵکی ئەیان وتەوە .، عەلی بلبل خەریکبوو بەو شێوەیە زۆرکەس لەدەمەوەبدات و بەرەومردنیان بەرێت ، خوشبەختانە زانیان شێتە و بەخۆڕایی و لە خۆیەوە بەئارەزوو قسەئەکات وخەڵکی توش ئەکات، پشت گوێیان خست .
لەڕۆژی مەنعی تەجەولدا دوبرای مامۆستای هونەرمەندو تێکۆشەر مستەفا عەبدولڕەحمان لە قەیسەری نەقیب کەکاسب بوون پیاوکوژەکانی زەعیم سدیق لەحەوشەکەی خۆیاندا بەبەرچاوی دایکیان و ئەندامانی خێزانەکەیانەوە هەروکیانی گوڵلە بارانکرد

***



بەڕێز ئەورەحمانی خامە ناسراو بە ئەورەحمانی خامەسنەیی

کە ئیواران لە باخی فەرەجی حەمە موراد ، ئامادە ئەبوو لاوان دەورەیان ئەدا ،تا گوێ لە سەر گوزەشتەو قسە خۆشەکانی بگرن.

# ئەنجام

لەئەنجامی ئەم نووسیەدا چەند خاڵێکی گرنگ وستراتیجی وپەندو وانەو بیرو بۆچوون وبەئەزمون ئەخەمە بەردەستی، خوێنەری بەڕێز کە پەیوەندی بەتینی بەچارەنووس و سەروەری و ئەمنی نەتەوایەتی و نیشتمانی کوردەوە هەیە بەتایبەت لەم قۆناغە ڕزگاری خوازەی کە نەتەوەکەمانی پێاتێپەڕ ئەبێت، کە ئەمڕۆ ئێمە لەوکاروانەدا دواکەوتوین ، دەمێکە گەلانی کە ئەو قۆناغەیان بڕیوە بەئامانجینەتەوەییان گەیشتون ، گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن ١/ لەگۆڕەپانی خەباتی نەتەوایەتی کوردا کۆمەڵێک پارت و ڕێکخراو ناوند هەن ودامەزراون ، نەتەوەی کورد ئەمڕۆ بەقۆناغی ڕزگاری نەتەوایەتیدائەڕوات، کە دەمێکە نەتەوەکانی کە بڕیویانە بەئامانجی نەتەوەییان گەیشتون خاوەن دەوڵەت و سەروەرین جا بەهەر هۆیەک بێت ئێمە تازەبەڕێوەین.

لەم قۆناغەچارەنووسسازەدا، پێویستە هەموو لەوبوارەدا یەک ئامانجیان لە بەر چاو بێت ، کەرزگاری وسەرفرازی نەتەوەی کوردە لەهەرپارچەیەکی ئەم کوردستانە ، بەڕەچاوکردنی باری تایبەتی وتایبەتمەندی هەربەشێکی بندەستی داگیرکەران ودوژمنان، هەموو هاوکارو پاڵپشتبن بۆیەکتری، پەیوەندی بەردەوامیان هەبێت لەگەڵ یەکتر ، چاک ئەزانین کە دوژمن هەرلایەکمان بێهێزبکات شکستیە بۆ هەموو بەشەکانی تر، تاکەڕێگەمان بەرەو سەرکەوتن، لەیەکبوون ویەکڕیزی وهاوکاری یەکتردا بەدیدێت.

هەرتاقم پارت و ڕیکخراوێکی کوردستانی لەکاتی چارەنووسیدا ئەبێت بەرژەوەندی و تایبەتمەندی لایەنەکەی خۆیان بەلاوەبنێن بیخەنە خزمەتی بەرژەوەندی گشتی ، کەئەمە بەرزترین دڵسۆزی و نیشتمانپەروەریە هەر بۆ ئەومەبەستە سەرەکیە ،کاتی خۆی بۆی دامەزراون بۆ بەدیهێنانی مافی نەتەوایەتی نەک مافی حیزبایەتی..

ئەوزەمانە بەسەر چوو هەر لایەن و لایەک وابیر بکاتەوە بڵێت لە ساحەدا هەرمنبم کورد هەربەمن رزگاری ئەبێت هەڵەیە .ئەزمونی سیاسی و تێکۆشانی گەلان سەلماندویەتی فرە بیرو بۆچون بەدڵسۆزی ، مایەی دۆزینەوەی ڕێگەی گونجاو وچارەسەریە، خەبات بۆ گەیشتن بەئاواتی چارەنووسی بەیەکڕیزی هەموو دێتەدی .

٢ /پێویستمان بەئۆپۆزسیۆن (موعارەزەی ) شەریف هەیە (مە بەست شەریف کارو بیرو باوەڕو گفتارو کرداریان لە چوار چێووەی دڵسۆزی ودادوەری و ویژدانی و ڕەوشت بەرزی و نیشتمان پەروەریدابێت، بنیاتنەربێت نەک ڕوخێنەر بڕوای بەسەربەستی و ئازادی و بە دیموکراتی و

سندوقی هەڵبژاردن هەبێت، دووربێت لەدروست کردنی تۆمەتی ناڕەوا و چوونە ناو کاروباری کەسایەتیوە وڕێز لە ناوەندو پارت و ڕێکخراوەکانی تر بگرێت، بەئاشتی و هێمنایی لەسەر بنەمای قبوڵکردنی یەکتری ڕەفتار بکات، ئازایانە دژی هەموو چەوتیەک وخراپەکاریەک وگەندەڵییەک بێت، کەبەبەڵگە دەستی ئەکەوێت)، کەهەردەم لە کاردابن بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەو چەوتی ونەهێشتنی گەندەڵی لە بەڕێوەبردن و سیاسەتدا، بەم ڕێگەیە دەبنەهۆی پێشکەوتن گەشەکردن سەرخستنی دۆزی کورد .

٣ / سەرکردەکانی کورد بەدرێژایی مێژووی نوێ هەموو خاوەن ڕەفتارو کرداری بەرزبوون، ئەدەب وڕەوشت وکردارو ڕەفتاریان و کەسایەتیان، لە ئاستێکی بەرز وبێخەوشدابووە، هەروەهاخاوەنی قسەو وتەی خویانبوون ، شەرەفی پەیوەندی دیپلۆماسی و ڕەوشتی کوردیان پاراستوە ، بەموویەک لایاننەداوە. بەڵام زۆرجار لەئاستی ئەخلاق کردارو بەرزی خۆیانەوە ڕوانیویانەتە بەرامبەرەکەیان کەزۆرجار ئەوان درۆزن و فێڵبازو فریودەر و بێ متمانەوکەم فرسەت ڕەوشتنزم بوون ، وەک هەلێک ئەو پاکی بڕوایەی سەرکردەکانی کوردیان قۆستوەتەوە . دژی نەتەوەکەمان کاری دوژمنانەی خۆیان ئەنجام داوەو تیاسەرکەوتون ، ئێمە سەدەهاساڵە پێوەی ئەتلێینەوە، کەزۆرفرسەتی سەرکەوتنمان لەدەستچووە فریودراوین بووەتەهۆی بێبەشی و بندەستی زاڵبوونی دوژمنان بەسەرمانداو چەندەها کارەسات و ناهەمواری بۆگەلەکەمان هێناوە و سەرکردەکانمان سەریان تیاچووە،کەم نەتەوەهەیە سەرکردەکانیان بەوژمارە زۆرە لە لایەن دوژمنانیانەو وابێبەزەیی و دور لە ڕەوشتی مرۆڤایەتی لەساحە گشتیەکاندا لەسێدارەدرابن . کەنمونەی مێژوویی لەمبارەیەوە زۆرە .

پێویستمان بەسەرکردەیەکە وریابێت ، بەرامبەر دوژمن خوش باوەڕنەبێت ونەکەوێتە داو دوژمنەوە وفریونەخوات، بەوتەو پەیمان و سوێندی دوژمن باوەڕنەکات .تۆزێک گیانی سەرکێشی (موغامەرە )ی تیابێت ، پێداگربێت لەسەرداواکاری ، بەڵام دوای لێکدانەوە و وردکردنەوە وبەوریایی، لە کاتی پێویست و چارەنووسیدا ، نەگەڕێتەوە وسازش نەکات، کرداری زۆرتربێت لەگوفتاری .

٤ /ئەوتاقم کۆمەڵ وباندو حیزبانەی لەگۆڕەپانی خواروی کوردستان و بەشەکانی کەی کوردستاندا کە لەکاردان ئەمڕۆ لەگەڵ ئەونەتەوە دراوسێیانەدا ژیان بەسەر ئەبەین، بەواتەیەکی کە ژێر دەستەیانین. زۆر وردبین بین وریابین باش هەڵیانسەنگێنین بزانین مەبەست ئامانج وپرۆگرام ستراتیجیان چیە وچۆنە؟

لەسەر ڕۆشنایی ئەزمونەکانی مێژوویی وتێبینیەکان، ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەین، ئەوانەی دوژمنایەتی گەلی کوردمان ئەکەن و ڕێگرن لەڕێماندا نەیەڵین سەربکەون گەشەبکەن سەرکوت

بکرێن ڕێگربین لەبەردەم سەرکردەکانیاندا و ئەوکەساتیانەی دوژمنایەتیمان ئەکەن و ڕسوایان بکەین بەتاک و بەکۆمەڵ ، دۆست و دوژمن جیابکەینەوە ، هەموو توانایەکی گونجاو بخەینەگەڕ بۆ ئەم مەبەستە ، هەردەم لە بۆسەدابین چاودێربین ، ڕۆژانە ئاگامان لە هەنگاو بڕیارو کردارو کارەکانیان بێت ، بەوردی بیریان لێبکەینەوە هەڵیان سەنگێنین هەردەم وەرام وکرداری گونجاوی بەرامبەری ئامادەکراو بەدەستمانەوە هەبێت ،تالەکاتی پێویستدا دەست پێشخەربین لەناو کۆمەڵدا ڕسوایان بکەین ، لەنرخ وئاستیان کەم بکەینەوە کارەخراپ و ڕەوشتە نزمەکانیان بخەینە ڕوو.

وەک چۆن ئەوان ڕەفتارو کرداری نابە جێ دژمان و بەرامبەرمان ئەنجامئەدەن ، ئێمەیش بەر پەرچیان بدەینەوە..بێ گومان ئەوانیش لەڕێی کەسانی نەفس نزمەوە دزە ئەکەنە ناو ڕیزەکانمان خزمەتی دوژمنان ئەکەن ، کەو وریایی ئەوێت

٥ /نەتەوەی کورد بە درێژایی مێژوو گەلێک دوژمنی هەبووە کەتەماعیان لەخاکەکەماندا هەبووە ( زۆرجار ئەڵێم کەمنداڵێکی کورد لە دایکئەبێت نزیکەی چوار دوژمنی سەرەکی بەسەریەوەیە، وەک مۆتەکە ئەیانەوێت لەناوی بەرن نەیەڵن بژی ) ئەودوژمنانە هەردەم بێوچان لەکاردان هەموو تواناو هێزێکیان بەدەستەوەیە ، لەتێکۆشانی سەرومڕدان بۆ درێژەدان بە ژێردەستەکردنمان . نایەلن نەتەوەکەمان بەئارامی بژی وپێشبکەوێت وخۆشی بەخۆیەوە ببینێت، مەبەستیانە ڕێگەی پێشبکەوتنی لێبگرن و هەر بەدواکەوتوویی و برسێتی و نەزانی بمێنێتەوە، هەموو هەوڵەکانی بۆسەربەخۆیی و سەرفرازی ئازادی چەسپاندنی مەرجەکانی ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی لەباربەرن .

کۆلۆنیالیزمی جیهانی لەساڵی ١٩١٦ دا بەپێی پەیمانی سایکس بیکۆ کوردستانیان دابەشکرد هەر بەشێکیان دا بە نەتەوەیەکی دراوسێ لەتورک و عەرەب و فارس ، کراینە ژێر دەستەیان هەرنەتەوەیەکیان کردە سەرۆک و بکوژو ببڕی کوردان ، بەدرێژایی مێژوو گەلی کوردستان توشی کارەسات وناهەمواری و کۆمەڵکوژی و ڕەوپێکردن بووەتەوە بەدەستیانەوە. لە سەرو ئەمانەشەوە هێشتا ئەوان ئێمە تاوانبار ئەکەن کە بە فیتی بێگانەو هاندان و هاوکاری ئینگلیز شۆڕشمان بەرپاکردوە بەهۆی ئەوانەوە ئێمە فێربووین داوای مافمان ئەکەین ، ئەوەی کە پێویستە ئێمە پەیڕەوی بکەین ولەبەرچاومان بێت تەنها پشت بەستنەو بەخۆ ، بەیەک ڕێزی و تەبایی و یەک هێز سەرکەوتن بەدی ئەهێنین .

کورد بڕوای بەخۆی بێت کەگەلێکی شارستانی و پێشکەوتوو بووە تابڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام خاوەنی سەروەری دەوڵەتی خۆی بوووە ، کوردستان سەرچاوە و سەنتەری شارستانی و داهێنان و بنکەی سەرهەڵدانی بیرو باوەر و ئایین ودینەکان بووە دوژمنان ئەمڕۆ ڕێگەی پێش

کەوتنیان لێگرتوین. ڕۆڵەکانی گەڵە کەمان ئەم ڕاستیانە بزانن ،ئەگەر کورد لەوان باشتر و لێهاتوتر نەبێت لەوان کەمتر نیە .

ئەگەر ئێمە خۆمان یەکرێز نەبین (بابیرو بۆچونمان جیابێت ) ئەگەرهەموو هاوچارەنووس نەبین ئامادەنەبین لەکاتی ڕودان و چارەنووسیدا فریانەکەوین یەک نەگرین، کەسی کە فریامان ناکەوێت، ئەبێت خۆمان هەبین، ئەوسا پاڵپشت وهاوکار ئەڕەخسێت بەدەنگمانەوەدین ، لەگەڵ شآخەسەرکەشەکانی کوردستانیش .

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت لایەنی کە پشتگوێ بخەین ئەبێت لە هەوڵ و تەقەلای سەرو مڕدابین ، بۆ پەیداکردنی دوست و پشت و پەنا لە هەموو جیهاندا ، هەردەم لەکاری ڕونکردنەوە و دەرکردنی نامیلکەو نووسراودابین مێژوو جوگرافیای کوردستان و دۆزی نەتەوەی کورد لە ڕۆژنامەوە کەنالەکان میدیاکان وپەیوەندیەکاندا باس بکەین و ڕونیبکەینەوە بۆگەلانی جیهان تاباش تێبگەن کەئێمە نەتەوەیەکین چاوەڕوانی ڕۆژێکین ئەوئاواتە پیرۆزەمان بێتەدی کە سەربەخۆیی و پێک هێنانی دەوڵەتی کوردیە، وەک وتمان یەکەم پشت پەنامان هەر خۆمانە .بەڵام ناتوانین بێ ناوندی بڕیاری جیهانی ودەوڵەتانی خاوەن بڕیار هەنگاوی ئەوتۆبنێین .ئەوەش بزانین ئەو دەوڵەتانە ئەگەر هاتنە مەیدانی یارمەتیدانمان بێگومان لەپێشدا بەرژەوەندی خۆیان ئەوێت .

یەکرێزی توانیمان بەرامبەربەڕژێمی سدامی تاوانکار بووەستین و بەرگەی ئەو سوپا پڕچەککراوەی بگرین ، بەرگەمانگرت بەرامبەری وەستاین کە زۆر لەدەوڵەتان لە بنەوە یارمەتیان ئەدا .ئەگەر دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان ، هەموو یەکبن دژمان وسەرومڕ لەکاری دوژمنانەیان بن دژمان ،،، ئەی بۆ ئێمە لەم کاتە چارەنووس سازەدا یەک نەبینین ، بەرژەوەندی نەتەوەیی وئاسایشی نیشتمانی بەرزتر ڕانەگرین، لەبەرژەوەندی حیزبایەتی ، کەلەبنە ڕەتدا حیزبایەتی بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی دامەزراوە.

٦ / کاتی موجامەلەو دڵپاکی و سادەیی و بڕوا بەدوژمن بەسەرچوو، ئەمڕۆ پێویستمان بەدەربڕینی بیروبۆچونە بەڕونی و ئاشکرا، داواکاریەکانمان ڕەوایەو ، هیوامان سەربەخۆییە ، ئازادیە، بێسڵکردنەوە و ڕاڕایی و بەڕاشکاوی و ئاشکرا بێشآردنەوەی مەبەست ، پێویستمان بە دەربڕێنی ڕێکاو ڕێک داواکاری هەیە، پێویستمان بەکارو دەربڕینی دیپلۆماسی هەیە کە ئامانجمان چیە؟

دوژمنان باش ئەزانن ئێمە کێین و چیمان ئەوێت ؟ ئامانج و مەبەست و داواکاری و بیری ستراتیجی ونەتەوایەتی و هیوای دواڕۆژمان چیە؟ئەگەر بڵێین ئەوان نازانن چیمان ئەوێت ڕاستنیە یان خۆیان گێڵ ئەکەن، ئێمە نەتەوەیەکی شارستانی پەنجا ملێۆنین خەبات ئەکەین

بۆسەربەخۆیی و سەروەری و سەرفرازی ، مافی نەتەوەیی خۆمانە و لێمان زەوتکراوە و خاکمان داگیرکراوە ، بەئاشکراو ڕاشکاوی ئەڵێین مافمانەو لەئێوە کەمترنین ئێوە چێن ئێمەیش واین بەچی گەیشتون ئێمەیش هەمان هێواو ئامانجمان هەیە ، کە خەمی سەرەکی مەرجی یەکەمی خەباتمانە.

پێویستە ئێمە زۆر وریابین ئاگاداربین لەڕەفتاروکردارو بلاوکراوە و ڕاگەیاندن پیلانی دوژمنەکانمان بەهەر هۆیەک و ڕێگەیەکەوە بێت بتوانین بچینە ناو ڕیزەکانیانەوە ، شارەزای نهێنیەکانیان ببین ، بێ سێ دو کردنەوە، پێویستە کردارمان زۆرتربێت لەزمانمان .

ئەڵیین نەتەوەیکین لە ئێوە کەمترنین وەک ئێوە چاوەڕوانین بەئاواتی نەتەوەیی بگەین ، هەوڵی بۆئەدەین خەباتی بۆئەکەین ، ئەگەر ئەم هیوا ئاواتەبشارینەوە دوژمنان باوەڕمان پێناکەن و پێویستمان بەبڕوای ئەوان نیە.

بەڵام هەندێک دەربڕێن و بۆ خاتری بەرامبەر لەسەرمان ئەکەوێت کەپێویست ناکات بوترێت، ئەگەر وترا باخاتری تیانەبێت، وەک بڵیین ( موسڵ )کوردستانی نیە، کە ناوەکۆنەکەی (میسێلە) یە تائەمڕۆژ بادینیەکان هەربەناوە کۆنەکەیەوە ناوی ئەبەن ( زەینەفۆنی یۆنانی) لەکاتی گیرانەوەکەیدا لەساڵی ٤٠١ پێش عیسا بەوشارەدا تێپەڕیووە نووسیویەتی میسیلا. لەساڵی دەوروبەری ١٤ کۆچی کە موسوڵمانەکان شارەکەیان داگیرکرد بەسەرکردایەتی (عەرفەجەی بارقی )وەک خاوەنی (کتێبی فتوح البلدانی ، پۆلاذری ) ئەڵێت: ( بۆ یەکەمجار ئەو موسوڵمانە عەرەبە بەدەویانە کۆچەرانەی لە یەمەن و نێو دورگەی عەرەبەوە لەگەڵ وبەدوای لەشکری موسوڵمانانیش هاتن بۆ لەناو ئەولاتە داگیر کراوانە نیشتەجێبوون [( بەهەموو تیورێک و یاسایەک مانای داگیر کردنە ) لەکەنیسەکانی مەسیحی و هورمزگانەکانی زەردەشتی نیشتەجێکران ]) قسەیەکی بەم جۆرە پێویست ناکات بوترێت لەسەرمانئەکەوێت ، وکەس زۆری لێنەکردوین ، بەڵگەمێژووییەکان و جوگرافیا ئەیسەلمێنن کە تاشاخی حەمرین بگرە ئەولاتریش کوردستان بووە، پێش بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام (عەرەب پێش بڵاو بوونەوەی ئیسلام وەک نەتەوە هێشتا لە ڕوباری فوڕات نەپەڕیونەتەوە ) ، ئەبێت ئێمە وانە لە فەلەستینیەکانەوە وەربگرین کەلە بیروباوەڕ دەربڕێن وبەڵگە مێژووییەکاندا و باسکردنیاندا ، وابەئاسانی خۆیان نادەن بەدەستەوە قەت سازش لەمافی ڕەوای خۆیان ناکەن ، هەرگیز نایەنە خوارەوە.

٧ / یەکەم کۆڵەکەو بنەمای هەرەگرنگی نەتەوەیەک زمانە کەپێویستی سەرشانی ئەندامانی ئەوگەلەیە بیپارێزن و گەشەی پێدەن بەردەوام قسە بەزمانی دایک بکەن ، مەرجی سەرەکی و ئەرکی سەرشانی هەرکوردێک، ئەوەیە هەتا زمانی کوردی هەبێت هیچ زمانێکی کە بەکارنەهێنێت، زمان ناسنامەی نەتەوەیەکە مەرجی هەرەرە گرنگی ئاسایشی نەتەوایەتیە ،

نەتەوەیەک بەهۆی زمانەکەیەوە ئەپارێزرێت، ئەوەی بەتەنگی گەلەکەیەوە یە کوردپەروەرە نیشتمان پەروەرە ، ئەبێت یەکەم هەوڵ و ئامانجی گەشەکردن و پاراستنی زمانەکەی بێت ، بەتەنگیەوە بێت بەباشی بەکاری بهێنێت ، ئەوەی جێگەی داخە تائەمڕۆ وەک پێویست ئاوڕێ لێ نەدراوەتەوە ،دوکەس لەکوردستاندا ووشەیەک وەک یەک نانووسن

٨ / نەتەوەی کورد پێویستی بەدامەزراندنی ڕێکخراوێکی جیهانی هەیە ، لەژێر هەرناوێکدابێت ، ناوی بنێن پەرلەمانی کوردستانی سەرتاسەری ،یان کۆمەڵەی باڵای نەتەوەیی یان کۆنگرەی بەرگری لەمافی کورد،،،یان کۆنگرەی نەتەوەیی ، کەپێک هاتبێت لە نوێنەری هەموو پارت و ڕێکخراو ولایەن وئینستیوت وکۆمەڵە کوردیەکانی هەموو پارچەکانی کوردستان بەڕێککەوتنی پێشەکی و لەسەربنەمای تەبایی و گیانی لێبووردن قبوڵکردنی یەکتری وپێکەوەژیان بەهاوکاری وبرایەتی بتوانن نوێنەری شیاو هەڵبژێرن ، بەرێژەی ژمارەی ئەندامانیان یان بەرێکەوتنی پێشەکی ،کەئەندامانی پێک هاتبن لە کەسایەتی کوردو ڕۆشنبیران و دەسەڵاتداران وخەباتکەران وزانایان کەدانیشتوی دەرەوەی کوردستان بن باشترە ، لە پەنجاکەس زیاتر نەبن ، ئەوانیش لەناو خۆیاندا لیژنەی کارگێڕی هەڵبژێرن کە پێک هاتبێت لەسەرکردەو سکرتێر بەڕێوەبەری ڕاگەیاندن ومیدیاو بڵاوکراوە .کەژمارەی ئەندامان لە ٧ کەسایەتی کەمتر نەبن ، بەهەموو ئەبنە نوێنەری ڕاستەقەنەی نەتەوەی کورد وپارێزەرو قسەکەر بەناوی نەتەوەی کوردەوە ، لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا لەهەموو ئاستێکی جیهانی ونەتەوەیی نەتەوەیەکگرتوەکاندا و هەموو ڕێکخراوێکێ مرۆڤ دوست ودیموکراتی نێودەوڵەتی بەپێی توانا نوێنەریان هەبێت، بەناوی هەموو کوردەوە قسەبکەن و لەکاتی پێویستدا بەشوێنی مەبەستەوە پەیوەندی بکەن، ڕونکردنەوەی گونجاو بڵاوبکەنەوە، لەکاتی هەر دەستدرێژیەک وڕودانی کارێکی نامرۆڤانە دژی کورد کەئەنجام بدرێت لە سەری هەڵبدەنێ ، دۆزی کورد لەهەموو ئاستێکی جیهانیدا ڕونبکەنەوە لەنامیلکەو لەکتێب وبڵاوکراوە وڕادیۆو کەنال و ڕۆژنامەو ئەنتەرنێت میدیاکان و لەڕێی پەیوەندیەکانەوە بڵاوبیکەنەوە، بە بەڵگەی مێژوویی و جوغرافی و ئەنثرۆپۆلۆجیەوە تا سەرنج و چاو و گوێی و بیری هەمووو جیهان ڕابکێشین بۆ دوزەکەمان هەموو هیوا نەتەوەییەکان، تا هەموو ڕاهاتبن و تێگەیشتبن کەکورد مافی ڕەوای خۆیەتی دەوڵەتی سەربەخۆی هەبێت لەوبوارانەدا یارمەتی دەرمان بن. هەوڵبدرێت نوێنەرایەتی کورد بخەنە ئاستێکی جیهانی، بتوانن (لۆبێکی کوردی ) دروستبکەن وپشت گیرو هاوکارو دۆست بۆکورد پەیدابکەن، هەرچەندە ئەم کارانە ئاسان نین، بەڵام ئارامی وهێمنی و کات و سنگی فراوان و هەوڵی سەرومڕی ئەوێت ، هیوادارین سەرکردەکانی کورد بکەونەکار بۆ ئەم ئاواتە پیرۆزە هەرچی ڕەخنەو ناڕەزایی و ناتەبایی هەیە بیخەنە ئەولاوە بەگیانێکی بەرزی نەتەوەییەوە

بێنە پێشەوە. لەم ڕۆوە هەموو دەست بەکاربین پێویستیەکانی (موستەلزەماتی ) سەر بەخۆبوون ئامادە بکەین بۆ کاتی گونجاو و لەبار، ساتێک بە فێڕۆ نەدەین وەک پورەهەنگ هەموو لەکاردابین ،مەرج نیە ئەمڕۆ یان بەیانی خێرا بیخەینە واری جێبەجێکردنەوە ،بەکردەوە،دەست بەکاربین، جێبەجێی بکەین، ئەبێت کاتی بڕەخسێت، بەڵام ئەمڕۆ لە بارترینە بەرەو ئەوئامانجە پیرۆزە بەڕێ بووین، لە هەموو ئاستێکی جیهانیدا ناو بانگێکی باشمان پەیداکردوە دۆزی کۆرد ئەمڕۆ لەپۆپەدایە،وهەموو جیهان ئەمڕۆ باشمان ئەناسن ، شارەزامان بوون و ناوبانگێکی باشمان پەیداکردوە، ماوەتەو یەک وشەیی و بە پرۆگرام و یەکرێزی ویەکهێز و بەتەبایی هەموو وەک برا بەڕێببین یەک سات بەفیڕۆ نەدەین ، ئەم جارەش ئەم هەلە لەکیس خۆ نەدەین.

٩ /هەندێک کەلتورو کەلەپور ونەریت و ڕاهاتنی ناو کۆمەڵ، کەلەناو نەتەوەکاندا بڵاوە و باوە. هەندێکیان ئەرێنی و بەسودن وکەڵکیان هەیە، پێویست ئەکات بپارێزرێن و گەشەیان پێ بدرێت. بەشیکیان نەرێنین مانەوە و پەیڕەوکردنیان زیان بە کۆمەڵ ئەگەیەنن و سودیان نیەو، پێویستەگەل ڕابهێنرێت و ئاڕاستە بکرێت ، کەواز لەو نەریت و ڕاهاتنە زیان بەخشانە بهێنێنن . نەتەوەکانی جیهان بەردەوام خەریکن کۆمەڵگاکەیان پاکبکەنەوە ئاڕاستەی بکەن بەرەو کەلتورو نەرێت و ڕاهاتنی مۆدرن وسود بەخش بیانبەن ، ئێمەی کوردیش بەدەرنین لەو جۆرە کەلتورو نەریت ڕاهاتنانە ، ئەوەی ئەمڕۆ سەرنجمان ڕائەکێشێت ، فەرهەنگ وڕاهاتنی جنێودان و سوکردنی بەرامبەرە ، کەسێک یەکێکی بەدڵ نەبێت یان بیرو باوەڕی لەگەڵیدا نەگونجێت،یان لەحیزبەکەی ئەودانەبێت ، بێویژدانانە باسی ئەکات و بەهەق و بەناهەق رەخنەی ناڕەواو بێسەروبەری لێئەگرێت وئەچێتە ناو باری خێزانی و تایبەتمەندی کەسایەتەوە ، تۆمەتی ناڕەوای ڕەوشت نزمی و بێڕیزی ئەوتۆی ، بێ بەڵگە ئەداتە پاڵی و بۆی دروستئەکات . ئەم دیاردەیە فەرهەنگێکی جنێودانی ناشیرین وسوککردنی یەکتری هیناوەتە کایەوە،بەوەشەوە نەوەستاوە درۆش هاتوەتەپاڵی . وەک دەر ئەکەوێت ئەم نەریتە و ڕاهاتنە لەناوماندا ڕەگێکی مێژوویی هەبووە، ئەوەتەی من لەژیاندام هەست بەم دیاردە ناشارستانیە دەکەم ، گوێم پڕبووە لەو فەرهەنگە جنێودانە ، کەئەمڕو لەزۆر ئاستدا بەردەوامە بەڵکو ئەمڕۆ بەشێوەیەکی مەترسی دار گەشەی کردوە ڕەگی داکوتاوە ، هەموو ئاستێکی ژیانی کۆمەڵایەتی و خێزانی و کەسایەتی خزمایەتی گرتوەتەوە، مەترسی ئەوە هەیە نەوەی نوێمان ، بەو کەلتورە نامۆیە میشکیان پڕ ببێت ، ڕەنگ بداتەوە لەژیان و کردارو ڕەفتاریاندا وکۆمەڵێکی نادروست بێتە کایەوە ،کەدەبێتە مۆرانەیەکی ناوکۆمەڵی کوردەواری ،بێهێزو لاوازیئەکات ڕیزەکانی پەرتەوازەئەکات، بە بندەستی ئەیهێڵێتەوە ، هەردەم ڕێزەکانی ناو کۆمەڵ وگەل ، کەرت کەرت ئەکات ڕێزەکانی تێک ئەدات ،

دوژمنایەتی بەردەوام پەیدائەکات ، باری ژیانی هەموو تێک ئەدات شەڕی براکوژی بەرپائەکات ،کەئەبێتە هۆیەکی گرنگ بۆ دابەشبوون ودوبەرەکی و دوژمنایەتی لەناو کۆمەڵگەی کوردستانیدا ، سەری دوژمنمان ناپەرژێت بەخۆمانەوە خەریک ئەبین هەروا بەژێردەستەیی ئەمێنینەوە. زۆر هەلی چارەنووسیمان لەدەست ئەچێت .

بەپێی وردکردنەوە و تێبینی ودواکەوتن و ئاگاداریم ، هەموو سەرکردەکان ، بەسەرکردە کۆن وکۆچکردوەکانەوە و بە سەرکردە نوێکانیشەوە ،،، وهیچ لەسەرکردەیەکی کورد ، بەدەر نەبووە لە بەخشینەوەی جنێوی ناڕەوا بەسەریاندا، زۆرجار بێبەڵگە بووە ، هیچ لەوسەرکردانە بەدەرنین لەجنێودانی ناشیرین ، هەریەکە بەشی خۆی جنێوی ناڕەوای پێدراوەو بەریکەوتوە ،ڕۆژانە پێی ئەدرێت ،ئەم لاجنێو بەسەرکردەی ئەولا ئەدات ، ئەولاش جنێو بەم لا ئەدات (ناوی سەرکردەیەکی کوردم پێبڵێن . کەسوکایەتی پێ نەکرابێت).

ئەگەر هەرلایەنێک هەرکەسێک ڕەخنەی هەبێت ، لەسەرسەکردەو فرمانبەرێک بەرپرسێک ، کە هەڵەیەک ، کارێکی ناڕەوا ،خراپەیەکی کردبێت یان خیانەتی کردبێت ، ، بابە ڕونی و ئاشکرا بەبەڵگەی ساغکراوە ، ڕەخنەکەی بخاتە ڕوو ئازایانە بێگەڕانەوە، بڵاویبکاتەوە بیخاتە واری یاساییەوە ، کەبەم شێوەیە بەرژەوەندی گشتی ڕەچاو ئەکات ، لەم ڕێگەیەوە ،کارەکە مەبەستی خۆی ئەپێکێت و ، ڕەوایە ،،، تا ئەو سەرکردەو کار بەدەستە بدرێت بەدادگای گەل ، خراپەکانی بخرێتە ڕوو ڕسوابکرێت. نەک بەجنێوی ناشیرێن وپڕ لە شەرمەزاری ، کەپارچەیەکن لە بێڕێزی و تۆمەتی ڕەوشتنزمی . بۆ بەجنێو ،،، ( کەجنێو بێدەسەڵاتە هەموو کەس پێی ئەوێرێت)، بۆ بەڕێگەیەکی زانیاری و وردکردنەوە لێکۆڵێنەوە وسەلماندنەوە و بەڵگەوە نەبێت ،،؟، کە کەس لاری لەوجۆرە ڕەخنانە نیە و پێی خۆشە، ئەبیت ئازایانەو بەرونی و ئاشکرا بێنە پێشەوە، تا چەوتیەکان وهەڵەکانمان ڕاستبکرێنەوە کەسان وکاربەدەستانی خراپکار ڕوتبکرێنەوە ولەناو کۆمەڵدا ڕسوا بکرێن دور بخرێنەوە تازیاتر زیان بەکۆمەڵمان نەگەیەنن . ئێمە چاوپۆشی و لەخراپەکاری و گەندەڵی و چەوتی وخیانەت ناکەین، ،ئەولایەن وکەسانەی خاوەن بەڵگەن وتۆماری ساغکراوەیان پێیە، پێویستە بەجەختبن ، ئازایانە نەگەڕێنەوە پشت بەستوو بەیاسا، لەسەری برۆن. سندوقی هەڵبژاردنیش هۆیەکی گرنگە بۆ سنوور دانانی گەندەڵی و خراپەکاری.

ئەگەر بەراوردێک بکەین ئەم دیاردەیە بەو زەقیە نیە ، لەهیچ وڵاتێکدا بەشێوەی لای ئێمە نیە، سەرکردەی ئەوتۆیان هەیە پاشل پیسەو گەندەڵەو ملیارەها دۆلاری کۆکردوەتەوە و لەبەردیداوە وگێلەو خەریکی ڕابواردنەو دەها کەم کوڕی هەیەو ناوی بەخراپەدەرچووە وزیانی بەگەلەکەی گەیاندوە ،بەڵام بەڕێژەی سەرکردەکانی ئێمەی پێنەکراوە،،،،، کەنمونە زۆرە بۆ ئەو سەرکردەو پاشایانە .

ئەو دیاردەیە ، کە لەکوردستاندا ئەمرۆ لەئارادایە لەوانەیە دەستی دەرەکی بەدواوە بێت .
بێگومان لەکاتی وەهادا کەپیزەکانی ناو نەتەوەیەک دوبەرەکی و بەرامبەری دوژمنایەتی ئەکەوێتە نیوانیانەوە ، پیزەکانی کەلێنی تێئەکەوێت ، کەسانی ئەوتۆی پیاو خراپ و پیاوی بێگانەو ئەنانی ودەرون نەخۆش، داخ لەدڵ و ئەوانەی کەبەرژەوەندیان نەماوە دێنە ناو ڕیزەکانی گەلەوە و نیشتمان پەروەرانەوە، بەئاسانی جێگەیان ئەبێتەوە ،کاری خراپەکاریان بەوریایی ئەنجامئەدەن ، ئەوانەی گێل و نەزانن و هەرزەن بەفیت وهاندانی کەسانی گومان لێکراو، کاری نابەجێ ئەنجامئەدەن ، لەوانەیە زۆریان هەڵ خەڵەتابن، گیرانەوەیان ئاسانەو لەوانەیە ڕۆژێک پەشیمان ببنەوە ، زۆر جارکەسانی ناپاک هەن ، دزەئەکەنە ناو پیزەکانی گەلەوە، کاری خراپەی خۆیان لەژێر جەتری ئەوناکۆکیدا ئەنجامئەدەن وخۆیان بەدڵسۆز ئەدەنە قەڵەم .
نموونەیەکی بەرچاوی دوێنی ئەهێنمەوە[ بەپێی راپۆرتی پیاوانی کار بەدەستانی ئینگلیزو دوژمنان لەساڵەکانی ١٩١٨ بەدواوە ، دەربارەی زەمانی حوکمدارێتی شێخ مەحمودی نەمر نووسیویانە]، کە تائەمرۆژ قسەی پێ ئەوترێت ، ( خەڵکی یارمەتیان داوە کەناویان ناوە خولە،،،، ، لەم دواییەدا زانیم ئەوناوەی لێنراوە ،کاتێک ئەدرەسێکم پرسی وەرامیان دامەوە وتیان لەو لا وێنەکەی،،،،،، وەیە منیش وتم ئەوناوە،نازانسم شوێنەکەی لەکوێیە،،،؟ ) .
هەربەپێی راپۆ رتەکان ، لەزەمانی ئەودا سلێمانی فرە تاقم وکۆمەڵ وڕێکخراوهەبوون هەریەکە لە ئاوازێک ئەیخوێند و لە ئاشێکی ئەکرد . بەشیک ئینگلیزی ئەویست ، بەشێک تورک (جلخوار)، بەشێک خەوی بەخەلیفەوە ئەدی ، بەشیک بەغدادی ئەویست ،بەشێک بازرگانی موسێلی لاپەسەند بوو . بەشێک لە خەمی سەربەخویی کوردستاندابوون لەدەوری شێخ مەحمود بوون ، بەشێک لەڕۆشنبیران ڕەخنەو گلەییان هەبوو سەیر کەربوون ، تەماع ئارەزوی هەندێک لەشێخان لەولاوە بووستێت، سەروک هۆزەکانیش بەپێی بەرژەوەندی تاکیان هەر یەکەیان لەئاشێکی ئەکرد . دیمان چۆن هێزی گەل کەرت کەرت بوو، دوست و دوژمنان پێیان ئەوتین ( نازانین کوردان چیان ئەوێت، بڕوایان بەسەرکردەیەک نیە هەموو لەدوایەوە بڕۆن، پرۆگرامیکی ڕونیان نیە ، هیزەکانی خۆیان یەک نەخستوە، ڕێگەی ڕونی خۆیان نەدۆزیوەتەوە )
لەئەنجامدا، لەوکات وساتە چارەنووسیەدا زوربەی زۆری خەڵکی وەک پێویست نەهاتنە پێشەوە پشتی شێخ مەحمودیان بەردا، دوایی چۆن دەستبەتاڵ دەرچووین ، ئەمرۆ ئەزانین دەردەکان چی بوون چارەو دەرمانیان چیبوو،،؟.هۆی تریش زۆر بوو هەموو بەسەریەکدا کەڵە کەبوون ، بەو هۆیانەوە ڕۆژمان بەم ڕۆژەگەیشت، (بەڵام لەدوای باران کەپەنک)،،،؟ . ئەمرۆ ئێمە پێویسمان بە ئاشتەوای نەتەوەیی هەیە ، یەکتری قبوڵ بکەین ، یەک هێزو یەک پرۆگرامی چارەنووسی بین.

١٠ / لــەم کاتــە ناســک و چــارەنــووس ســازەدا ،دۆزی کــورد ئــەمــڕۆ لــە پۆپــەدایــەو کوردلەهەمووجیهاندا وەک نەتەوەیەک ناسراوە، کە دابەشکراو پەنجاملیۆنیە ، بەچاوێکی ڕێزەوە سەیری دوارۆژی ئەکرێت ، پێویستمان بە کۆمەڵی یان ناوەندی پیران هەیە وەک ئەوەی هەیە لەوڵاتە پێش کەوتوەکاندا بەناوی سیناتۆر یان پیران ، لەپیاوی لێهاتو ، رابوردوی پاک و ناودار و بەئەزمون ، زاناو ،شارەزا و خاوەن بڕوانامەی بەرز پێک بهێنرێت، لە زۆرینــەی بێلایــەن ، بەشێکێش لە ئاست بەرزی ناو لایەن و حیزبەکان

کاری بێلایەنی بێت و ناوبژی کەربێت هەموو گوێ لە بڕیارو داواکاریەکان و پێشنیازیان بگرن ، لەبەرزترین ئاستدابێت ، وهاوبەشی بنەڕەتی بێت لەبڕیاری چارەنووسیدا ،بەناوی هــەمــوو کوردەوە بدوێت ، وەک پەڕلەمان دەسەلاتی هەبێت

# دوا وتەی کۆتایی

لەکۆتایی ئەم یادەوەریەدا هیوادارین ئەم تاوانە گەورەیەی بەعسی فاشت و عونسوری عەرەب وتاوانەکانی زەعیم سدیقی خوێن ڕێژ ، لەبیر نەکەین ، شێوەی گرتن و ئازاردانی هاوڵاتیان لە ئینزیباتخـانەی سـەربازی سـلێمانی و کارەسـاتی ٩حـوزەیرانی سـاڵی ١٩٦٣ کە لەو ڕۆژەدا کۆمەڵکوژی تیا ئەنجامدراو زیاتر لە ٥٠٠٠ هاووڵاتی بەپیرو جـوان کەسـایەتی و فەرمـانبەر و کاسب و هەموو چینەکان لە تەویلەکانی حامیەی سلێمانی چەند ڕۆژێـک بەنـد و تونـدکران ، هێشتنیانەوە بێ نان وئاو ، ئامادە بەنیازی جێنۆسایدکردنیان وڕۆژانە کۆمەڵێکیان هەڵئەبژارد بۆتیرۆرکردنیان زۆریان لەتەویلەکاندا گیانیان لەدەستدا وتوشی نەخۆشی درێژ خایەن بوون ،.

ئەم تاوانـانە بـوونە تۆمارێـک وبەڵگەنـامەیەکی مێژوویـی نـامەردی ڕووڕەشـی ورسـوایی ڕەوشتنزمی ونامرۆڤایەتی ودڕندەیی بۆعونسوریەکانی عەرەب بەوشێوەیەک ئەنجامیاندا کە نەتەوەی کورد هەردەم نەوە بە نەوە لە بیری نەکەین ، بڵگەنامەیەکی نـامەردی و دڕنـدەیی ڕەگەزپەرستانی عەرەب ، ببێتە وانەو پەندیک کە ئەو نەتەوە پەرستانە چۆن کوردیان بەو دەردەبرد و هەرکاتێکیش بۆیان هەڵکەوێت و فرسەتیان هەبێت لەوە خراپترمان لێئەکەن ، کە نابێت هەرگیز لەبیری بکەین .هەر بۆ ئەو مەبەسـتە منـیش وەک یـادەوەریـەک نووسـیمەوە، بەشێوەی ئەوەی لە بەرچاوم ئەنجامدراو ئەوەی کەسانی کە بۆیان گێڕامەوە.

ئەو تاوانە نەک بەتەنها لە سلێمانی ڕویاندا بەڵکو لەهەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا ، هەمان تاوان وکاری نامرۆڤانەو دڕندەیی وبێبەزەییـانە وکۆمەڵکـوژی ئەنجامـدرا ، دەسـتیان نەگێرایەوە لەکوشتنی خەڵکی تەنها هەر ڕەگەزی کورد بووایە ئەکوژرا ، لەکەرکـوک کـورد کۆمەڵ کوژکرا، چەند گەڕەکیان کاوڵ و وێران کرد لە گەڵ زەوی تەختیانکرد دانیـشتوانیان کۆشت یان دەریانکردن و ڕەوپێکران، بەرەو شارەکانی تری کوردستان یان بۆ عـەرەبستانی عێراق.

لەدواوتەدا ولەکۆتایی ئەم نووسینەدا داوای لێبوردن ئەکەم و هیوادارم ئەگەر باسـێک یـان گێرانەوەیەکم لەبیرچووبێت یان ناوی کەسێکم لە یادکردبێت یان لەبیرچووبێتەوە یان بەرێزێک زانیاری لەلا هەبێت یان هەڵەیەک هەبێت ، ئاگادارمبکەنەوە ڕاستیبکەنەوەبۆم ، تالە دواهاتودا ئەگەر فرسەت بوو چاکبکرێن .

کاتێـک دەسـتمکرد بەنووسـینەوەی ئەم یاداشـتەو بیـرەوەریە تەنهـا مەبەسـتم باسـکردنی لاپەڕەیەکی ڕەشی چەپەڵی تاوانکاری ونامەردی ودڕندانە ودوژمنایەتی شۆڤێنیزمی عەرەب

بوو بەرامبەر بەنەتەوەی کورد ئەنجامدرا ، کەببێتە تۆمارێکی مێژوویی کەهەردەم ڕۆڵەکانی کورد و نەوەی نوێ ئاگاداربن لێی، لەباسکردن یادەوەریماندا بەردەوامبین لەبیرماندابن ، لەبیر نەچنەوە ، وەک چون هەمووگەلان و نەتەوەکانی جیهان ئەولاپەڕە ڕەشانە وتاوان کاریانەی دوژمنان بەرامبەریان ئەنجامیان داوە ، هەرگیز لەبیری ناکەن ، پشتگوێی ناخەن وەک دیکۆمێنتێکی مێژوویی ئەیپارێزن ، پەندی لێوەرئەگرن ، لەسەر ڕۆشناییان ڕۆڵەکانیان لەدوبارەبوونەوەی لەداهاتودا ئەپارێزن لەساڵی ٢٠٠١ دا دەستمکرد بە نووسینەوەی ئەم یادەوەریە بەئەمانەتەوە ڕاست ودروست وەکچۆن ڕویانداوە نووسیومەتەوە ، خۆم لەئینزیباتخانەدا، لە لایەکی پەنجەرەی ژورەکەمانەوە ڕاوەستابووم بەچاوی خۆم دیومەو گوێ بیست بووم ، ئەوەی نەم دیوەو گوێم لێی نەبووە لەسەر زمانی هاوڕێکانیشمەوە وەرمگرتوە وشە بەوشە وەک خۆی تا توانیومە نووسیومەتەوە باسمکردون وپاراستومە وەکخۆی بێلایەن دور لەهەڵگرتنی رک و کینە لەسەرکەسێک یان کۆمەڵێک ، سوکایەتیم بەکەس نەکردوە، هەندێک زانیاریم بەگرنگ نەزانیبێت کەبێبایەخە نەم نووسیوە. ئەگەر بەناچاری ناوی کەسێکم نووسێبێت بۆ ناسینەوەی ئەوناوەی پێیناسراوە ناچارییوو بەوناوەوە نووسیومە ، داوای لێبوردنیان لێئەکەم ، لەنووسینەکاندا بەڕێزەوە ناوی ئەوکەسانەم نووسیوە کەلە ئینزیباتخانە لەگەڵماندا بەندبوون ، بێڕێزیم بەرامبەر کەسیان نەکردوە لە نرخی کەسیانم کەم نەکردوەتەوە ، ئەم نووسینەم وەک بەڵگەیەکی مێژوویی نووسیوە ( تەنها بۆمێژووە ).

# نووسین و ژیاننامەی هەندێک
# لەوبەڕێزانەی کەلە ئینزیباتخانە گیرابوون

زۆر لەم نووسینانەی ئەم بەشە ، لەلایەن ئەوکەسە بەڕێزانەوە نووسراوە یان لە لایەن خانەوادەکانیانەوە نووسراوە، یان خۆمان دەربارەیان نووسیومانە بەپێی دەستکەوتنی زانیاری لەسەریان ، ئەوانەی خۆیان نووسیویانە بێ دەستکاری تۆمارمانکردون بڵاومانکردوەتەو تەنهاچەند وشەیەک نەبێت کە بەباشمانزانی تۆمارنەکرێت کەپەیوەندیان بەباسەکەوە نەبوو، زۆر لەنووسینەکانیان بیروبۆچوون وزانیاری و یادەوەری خۆیانە .

هەندێک لەیادەوەریەکان ئەگەڕێنەوە بۆ کەسانێک کەبەدەستی جەندرمەو جەلادەکانی زەعیم سدیقەوە توشی ئازارو ئەشکەنجەدان ومالّ وێرانی و دەربەدەری بوون کە لەئینزیباتخانە نەگیرابوون ،بەشێکیان لەشوێنی کەدا توشێ ئازاردن بوون ، یاخود پێش ئێمە یان لەدوای ئێمەو یان لە شوێنانی کە گیراون ،زۆرترینیان هی زەمانی زەعیم سدیقی خوێنڕێژن کار بەدەستی سەربازی ناوچەکەبوو .

ئەگەر هەموو ڕوداو یادەوەریەکان و زوڵم و زۆری شۆڤێنیەکانی عەرەب لەوماوە کەمەدا کۆبکەینەوە زۆرن بەڵام هەر ئەوەندەمان دەستکەوتوە ، دوای گەڕان و پرسی زۆر هەر ئەوەندەم زانیاری دەست کەوتوە، هەرچەندە ژیاننامەی زۆریانم دەست نەکەوتوە بەڵام هەر ئاماژەم پێداون لەناو باسەکاندا ، وەک مەسەلەکوردیەکە ئەڵێت (مشتێک نمونەی خەروارێکە) لەخوارەوە نووسینەکان ئەخەینە لەبەردەمی خوێنەواری بەڕێز

## هەندێک نووسراوی بەڕێز : حەمەڕەشێد ئەحمەدشانە



حەمە ڕەشید ئەحمەد شانە کوڕێ گەڕەکمان بووماڵیان لەسەرکارێزبوو ، هەرلامنداڵیەوە ئەمناسی و چەندجار ، تاقمی ئێمە بە قۆچەقانی شەڕمان لەگەڵ تاقمی ئەوانکردوە ، بەلاوێتی هەردەم ئەمدی .

لە قاوە خانەی سەرچیمەن ، نانەواخانەی هەبوو ، لەساڵی ١٩٥٩ دا یەکێکبوو لە ( ئەندامانی لیژنەی ڕێکخستنی کرێکارانی سلێمانی ) لەگەڵماندابوو بەتایبەت لێپرسراوی کرێکارانی نانەواخانەوە چێشتخانەکانبوو ، زۆرترین کۆبوونەوەکانمان لەماڵی ئەمان بوو ، پیاوێکی نیشتمان پەروەرو دڵسۆزبوو حەزی بەچەپڕەویبوو ،بەدرێژایی ژیانی هەرخەریکی سیاسەتبوو لەوپێناوەدا لەژیانیدا توشی گرتن و نەبوونی ودەر بەدەری ئازار بوو، ، لەم دواییەدا ئەندامی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی سەر بە (ی، ن ،ک ) بوو،

بەداخەوەساڵی ٢٠١٢ دا کۆچی دوایی کردوە . چەند خۆی کوردپەروەرو دڵسۆزبوو . ئەتوانم بڵێم خێزانەکەی ( لایەقە خان ) بەو وریاییەوەی وەک ئەو وابوو خەباتکەربوو یارمەتی دەری هەمیشەیی بوو لەخەباتدا یارمەتی دەری بوو ، ئاسان کەری ڕێگەی خەباتی بوو. هەردەم بەدوایەوەبوو بەخۆشی ونەبوونی ودەربەدەری هەردوم بەدوایەوەبوو هاو بەشی خۆشی و ناخۆشی بوو ، ناخۆشی ژیان کاری تێنەئەکرد ، بەدەمی پڕلەپێکەنینی بەردەوام ، هەموو هیلاکی و بێزاری و تەگەرەو ناخۆشی ژیانی لەبیر کاک حەمەڕەشید ئەبردەوە .

ئەمەش بەشێکە لە نووسراوەکەی :

( بەدەستکاریەوە مەبەست لەوەیە، کە هەر ڕستەیەک ماناکەی پەیوەندی بەباسەکەوە نەبووە ، لابراوە ) ئەوەی ماوە وەک خۆیەتی ، نووسیویەتی :لەیادم مابێ بەڕێز کاک حەمە سەعیدی مام ئەورەحمانی بەرخانەقایی (١)دوای چەند مانگێک لەگەڵ بەڕێز کاک کەریمی (برای شەهید قادرتەگەرانی ) کەخۆی سەر بەخۆمانبوو هات پێی وتم کاک حەمەڕەشێد خۆت بشارەوە ، وتم

بۆ ،،،؟ وتی کاک عەلی ئیبراهیم دەروێش گیراوە، منیش ئاگاداری هەڤاڵانی ناوچەم کرد کە خۆشم ئەندام بووم لەگەڵیاندا کەشتێکی واهەیە ، وتیان وەختی ڕۆیشتنە دەرەوەنیە ،لەکۆبوونەوەیەکی تردا هەر باسم لەوەکرد ڕەئیان نەبوو .

ڕۆژی دوای ئەوە جێبێکی سەربازی هاتە بەردوکانەکەم ، ئەفسەرێک و سەربازێ بوون ، وتیان کێ حەمەڕەشیدە ،،، ؟ ،وتم لێرەنیە ، مەگەر حەمە ڕەشید شەریفی نانەوایان بەمن زانیبوو لەدەرەوە ڕایانگرتبوو ، ئیشآرەتی بۆمن کرد وگیرام .

برام بۆ ئینزیباتخانەی سەربازی لای معاونێکی ئەمن. وابزانم ناوی (ئەبو عۆف)بوو ، داینام کە ئاوڕم دایەوە شەهید ئەنوەردارتاش و مامۆستاباقی سەعیدم دی، کابرای ئەفسەری پۆلیس وتی (تعال ) ئیمزابکە وتم چی نووسراوە ،،،؟ خوێندیەوە.

دوای ئەوەی دەهاساڵ تێپەڕبووە زابتەکە ئاوڕی دایەوە لەیەکێک وتی ئەمە یەکێکیانەو وتی( نعم سیدی) کەئاوڕم دایەوە، دوای مردن ڕەحمەت باشە بینیم کە کاک عەلی ئیبراهیم دەروێشە ، هەرچی بەخەیاڵیدا هە بیوو دابوو بەکۆڵی من و شەهید ئەنوەر دارتاش و مامۆستاباقی سەعید.

{ تۆزێک پشویاندا هەر ئەوەندەم زانی (شەهید ئەنوەر ومامۆستاباقی ) یان چنگ لەسەرشان بەشەق هێنا. هەرچەندە هەردوکیان خۆڕاگرو مەردبوون ، ئەومامۆستاباقی یە بەیەک عەرەبی قسەی ئەکرد ، ئەوەی بە خەوێش عەرەبی نە بیستنێ لەوباشتری دەزانی، ئەوانیشیان داگرتەوە ، خوری شۆر ، ئیتر لەژورەکەدا ٠(مەبەستی حەوشەکەیە ) هەر چواریان بەجێ هێشتین ، وتم کاک عەلی ( مەبەستی عەلی ئیبراهیم دەروێشە ) وەرە خوارەوە ،لەسەر چەند فەردەیەک هەڵنیشتبوو ، وتی بۆ،،؟ ، وتم کۆبوونەوە ئەکەین . کاک ئەنوەر هاواری کرد وتی وەختی ئەوەیە،،؟، وتم بەڵێ لەدەرەوە ئەموت ئەمانگرن بابڕۆین ، ئەتانوت کەی وەختی ئەوەیە،،،؟ ، ئەوەکاک عەلی شایەتە ئیستاش ئەڵێم وەرن کۆبوونەوەبکەین ، وتی کەی وەختی ئەوەیە ئەبێ وەختێ دیاری بکەی کە وەختی بێ، با لەیادم نەچێت هەموو ئازاد کراین ، بەبڕیاری( م ٠ س) کاک عەلی لەپارتی دەرکرا بەیانیشی لەسەر بڵاکرایەوە .}

دەمەو عەسربوو کۆمەڵی ئەفسەر و سەرباز کردیان بە ژوردا تومەز ئەوە ( عەقید خەلیل ) ئامر لیوای ١٩ ، شەوانە ئەیان بردین بۆ نزیک کارێزەوشک بۆتێهەڵدان (٢)و ئەشکەنجەدان ، دوای من کەس نەگیرا ، ئەولیوایە نەقلبوو ، زەعیم سدیق بەلیوای ٢٠ ەوە هاتەجێگەی، کەس لەو دڕنەترو توندو تیژتر نەبوو ، شەو تابەیانی لێدان و هەڵواسین ،،، بێجگە لەکاک ئەنوەردارتاش ومامۆستاباقی ، گەلێکی تریش هەر گیرابوون وەک کاک عوسمان سەعید و عەسمانی حاجی کەریم و بەڕەحمەت بێت وەستا شەفیقی فیتەرو کاکە حەمە فەرەج ئەفەندی ولەتیف مەحمود

کشمیش و فەرەیدون عەلی ئەمین و قادربرسی و ئەمینی عەبدەو عەبدوڵڵەی حاجی عەلی حەمامچی ، زۆری تر لەیادم نیە ، کوڕێکی شیوعی گیرابوو باوکی شاوەیسی پێوەبوو (٣) بەڕاستی خۆڕاگربوو نزیکەی ٤٠ ڕۆژ لەوئینزیباتخانەیە ڕامانبوارد ، پاشان هەموو براینە سەرەوە مەبەستم بەندیخانەی سەرەوەیە ، (ئەوخەڵکە نەبایان دێبێت نەباران بەزۆری لەگەڵ یەک ناجۆربوون ) ناهەقیشیان نەبوو چونکە هەمانبوو یەکتریان کردبوو بەتەڵەوە ، بەڵام لە چاو ئینزیباتخانەدا بەهەشتێک بوو بۆ خۆی ، بەزۆری ئەوبرادەرانە بەڕەحمەتی خواچوون . لەڕۆژی ٢١/ ٣ / ١٩٦٣ واتەیەکەم ڕۆژی جەژنی نەورۆز بوو دەرگاهی بەندیخانەیان کردەوە هەوموو بەڕەڵلا کراین .

بەپێشوازیەکی زۆرەوە بەندیخانەمان بەجێهێشت ،سرودی جەژنە جەژنی کوردستانە ، جەژنی نەوەرۆزە کەهی مامۆستا ع . ع شەونم بۆ یەکەم جار لەلایەن خوالێخۆش بوو کاک ڕەفیق چالاکەوە وترا .تائەوکاتە بۆ هیچ بەندییەکی شار کەئازاد بوبێت ئەو ڕیو ڕەسمە نەکرابوو ، ئەوەش تەنها لەبەر خۆشەویستی کوردو کوردستانبوو( کەقسەی زمان ودڵی هەموو لایەک وەک یەکبوو ) چەند ڕۆژێ دوای ئازادبوونمان لەزیندان دانرام بە ئەندامی ( ٨ ،ق .س ) کرام بەلێپرسراوی ڕێکخراوی وارماوە بەنازناوی( مەلا ئەسعەد ) ، یەک دومانگێک لەوێ بووم ، گویزرامەوە بۆ ڕێکخراوی سورداش ( وردەوردە ئەو نزیک بوونەوەی پارتی و ڕژێمی ئەو کاتەی بەعس ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئاڵۆزی تێئەکەوت ئەوەبوو ٩ / ٦ / ١٩٦٣ لە هەموو لایەکەوە پەلاماری کوردستان دراو لە شاری سلێمانی هات وچۆ قەدەغەکرا، هەرچی پیاو و لاوی شار هەبوو ڕەشبگیرکران و خرانە گەوڕەکان وقاعەکانی سەربازگەی کانێسکان، زیاد لە سەدکەس لەوانە و بەزیندویی گوللە باران کران ، وکران بەژێر گڵەوە، هەزار مەخابن لەوڕۆژە پرلەکارەسات و خوێن ڕشتنە ، ئەوجێگایەش ئەکەوێتە دوڕیانی خوار پارکی ئازادی،لە ساڵی ١٩٦٤دا تەرمەکانیان هینرانە دەرەوەو بەوپەڕی شکۆمەندەوە لە گردی شەهیدان بەخاک سپێردران ، ئەم کوشتن و کوشتارە لە سەر دەستی زەعیم سدیق ئەنجام درا لەهەر کات و هەلێکدا داگیرکەران لەهەر کۆڕو کۆمەڵ وتاقمێکدا بووبن گەلی کوردی هەژاریان بەوردەردە بردوە لە ناو وڵات و نیشتمانی خۆماندا ، لەدوای ماوەیەک شەڕولێکدان و گیانبازی کە لەشکری (یەرموکی عەرەبی سوری بەدویان) هێنابوو بۆڕاو ڕوت و شڕەخۆری سەریان درا بەبەردی چیاسەختەکانی کوردستاندا لە هەموو لایەکەوە هەڵهاتن بەعس لە ناو خۆیاندا دەلاقەیان تێکەوت ، عەبدولسەلام عارف هەموویانی ڕاماڵی و بەعسی لە سەر دەسەڵات هێنایە خوارەوە ، هەمدیسان دەنگی گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتی و ئەڕژێمە تازەیە کەوتەوە سەر زمان ، من مەبەستم مێژوو تۆمارکردن نیە ، ئالەم کاتانەدا دێوەزمەی دوبەرەکی و شەڕی براکوژی درکەت و پارتی دیموکراتی کوردستان بوو بەدوو بەش (بەناوی مەکتەبی سیاسی و مەلایی )

١ لەماڵی خوشکەزاکەی شێخ سەلام .

٢ منیان بە دەست و قاچ بەستراوی بەلولەی دەبابە هەڵ
واسی دوایی ڕایان کێشام لە پشتیەوە .

٣ / مەبەستی جەوهەر سدیق شاوەیسە .

***

## هەندێک نووسراوی

## هەڤالی شاعیری کۆچکردو بەڕێز  قادر برسی



بەڕێز قادر برسی کە سایەتیەکی هەڵکوتوی شارەکەبوو، خاوەنی زۆر  بەهرەی  ناوازەبوو ، نەفس بەرزبوو کاری ڕەوشتنزمی و مەرایی بەدڵ نەبوو، خۆشەویست بوو لەلای ئەوانەی ڕۆژێک ئەویان ناسیبێت کوردپەروەری، بێتەماع و بێ هەڵپەبوو بۆ پلەوپایەو دەستکەوتی تـایبەتی، بەنانەسکی قایلبوو نەک بەدەستکەوتی بەمنەت .

قسەزان و نوکتەزان بیرتیژو هەردەم ئامادەی وەرام بوو ، لەکات و سات وشـوینی گونجـاودا بەزویی ئەهاتە دەست ورامی بەجێ و مەنتقی بوو ، دڵپاک بوو هەردەم ئامادەبوو بۆهاوکاری و هاوڕێیەتی .

کوردێکی دڵسوزو بوو. ورەبەرز بوو ئـەوبـوو کـەنـەی هیـشت زۆری ئـەوخـەڵکـە بـروخێن ، بەرگەگری بێ هاوتابوو ئازابوو ، لەهەموو گرنگتر شاعیرێکی بەهەڵوێست بوو  ،. کاتێک ئەم چنددێرە ئەنووسم هێشتا دەرحەق ئەو هاوڕێ مەزنە بەکەمی ئەزانم.لەئینزیباتخانە بووە هاوڕێ و یارمەتی دەری هەموو  ، دڵپاک بوو دوربوو لەهەڵگرتنی گیانی رک و کینە بەقسەی نەستەق هەردەم خەریکی بەرزکردنەوەی ورەمان بوو فریاد ڕەسی هەمووبوو خۆنەویست بوو .

تاکۆچی دواییکرد لایەنگیری پارتی دیموکراتی کوردستان بـوو لەگەڵ  ئەوەشـدا  پەیوەنـدی ئاسایی  باشبوو لەگەڵ کۆمەڵ و ناوەندو پارتەسیاسیەکاندا .

لەسالی ۱۹۳۳ دا لە شاری سلێمانی لەگەڕەکی کانێسکان لادایک بووە  لەڕۆژی ٥ / ١٠ /٢٠١١ دڵەگەورەکەی لەلێدان کەوت ، ئاری و ئارامی لەدوای خۆی بەجێ هێشت لەگەڵ چوار کچ .

**لێرەوە دەقی نووسینەکەی ئەنووسینەوە :**

لەڕوژگارەکانی سەدەی ڕابووردودا وسەرەتاکانی شۆڕشی ئەیلولی مەزنـدا ، ئەوەبـوو میـری کەوتە قەڵاچۆو ڕاونانی دانیشتوانی سەرانسەری کوردستان بەشارو دێهات و شارۆچکەکانیەوە بەهێرش وشاڵاوکردنە سەر هاووڵاتیان و نیـشتمان پەروەران و ڕاپـێچ کردنیـان بـۆ زینـدان و گرتووخانە تاریک ونوتوکەکان ، بەبیانووی پڕوپوچ و نابەجێ .

وداتاشراو بۆگرتن و داپڵۆسین لەلایەن جەڵادەخوێنخۆرەکان کە ژن و پیاومناڵ وگەنج وپیری ئەگرتەوە کەمنیش لەوهات و هاوارە بێبەش نەبووم ئەوەبـوو لە ڕۆژی ١٨/ ١٠/ ١٩٦٢دا لە بەڕێوە بەرایەتی پۆستە و بروسکە ڕاپێچی گرتوخانەیان کردم بەرەو ئینزیباتخانەی سەربازی کەبەرامبەر ڕێست هاوس ودەشتی وەیس بوو ، لەنزیک باخچەی گشتی ئێستاوە ،گرتوخانەکە سیخناخ بوو جمەی ئەهات لەگیراوەکان ، بەشێوە تاوانی هەمەجۆر وەکو پارتایەتی ویارمەتی دانـی شـۆڕش ووپێـشمەرگایەتی ولیـژنەی نـاوچەو سـەندیکاکان و ڕێکخـراوە جەمـاوەرییە پیـشەییەکانی شـاری سـلێمانی ودەوروبەری کە برێتـی بـوون لە چەنـدین کەسـایەتی وەک مامۆستایان{ ئەنوەر دارتاش ،ومحەمەد باقی سەعیدو، عەسمان سەعید ناسراو بەعوسـمانی نەعە و، فەرەیدون عەلی ئەمین } هەروەها [حەمە ڕەشی ئەحەشانەو، عەلی ئیبراهیم دەروێش ، وقادر برسی ،وحەمەی فەرەجە فەندی و کەریم و ڕەئوفی برای ،وکەمالی کوڕی ،و ئەحـمەد و ڕەسوڵ سێوکانی، حاجی دەروێشی بەقاڵ، و عەبدولی حاجی محمەدی سلۆ، وجەمال جەلالی غاز خۆی وباوکی، و مام حەمەو مینی زاوای شەهید یاسین حەمە ساڵح، وعومەرسەعید ناسراو بەعومەرچەتە، وجەزای عەلی کاتب ،و عەبە خڕەی موزەمید ،وتۆفیقی برای ،وحەمەی لالەمین ،وعوسمان شوکرەی کەبابچی ،وعەبدولی ماستاو ،وچەند کەسانی کە هەروەها براپۆلیسەکانمان وەکو شەوکەت نووری ، و کەمال حامد ئەسعەد ،وکوڕێکی تریش کەخەڵکی کفری بوو بەداخەوە ناوەکەیم لەبیرنەماوە لەتەک چەند پۆلیسێکی تریش هەروەهابرایەکی شەوکەتی دانساز زەنگەنە پێم وابێ ناوی کاک سالح زەنگەنەبوو، و چەند ئەحمەد ناوێکیش کە گیرابوون لەوانە ئەحمەد کانی ساردی نانەوا،] لەسەرکوشتنی یەکێک لەپیاوەکانی میری کەگوایە بەگومانی ئەوەی کە (ئەحمەد) ناوێ بەم کارە هەڵساوە بۆیە ئەو هەموو ئەحمەدەیان گرتبوو بۆدۆزینەوەی ناو براو، دیسانەوە چەند کەسێکیش لەکۆمۆنیستەکان گیرابوون لەسەرچالاکی کردنی خۆیان لەوانە :

( فـایز زبیـدی، وجەوهەر سـدیق شـاوەیس،و دکتـۆر فـارس رحـیم ،و عـومەر کاسـترۆ ) لە بەعـسیەکان ( سـلیم عیـسی زیـبەق ،وئەیـاد سـەعید سـابت ،وکەسـێکی تـریش کەنـاوکەیم لەیادنەماوە ) کە هەر ئەوکاتە کـرایە وەزیـری پەروەردەی عێـراق کە لە سـلێمانیەوە لەڕوژی

بەربوونماندا بەهۆی ٨ شوباتی١٩٦٣ بەرەو بەغدادیان بردن ، ئەم سێکەسەیش لەوکەسانەبوون کەلە کاتی خۆیدا تەقەیان لە عەبدولکەریم قاسم کردبوو ، جانازانم بۆچی تر گیرابوون و نێرابوونە بەندیخانەی سلێمانی بۆلای ئێمە ، هەروەها کۆمەڵێکی تریش کەبرێتیبوون لە (حەبیب محەمەد کەریم فەیلی ،ودکتۆر سەروەر محەمەد کەریم ،و وەستابەکری پێڵاو دروو ، و ئەمینی عەبدەی شۆفێرو ،و حەمەلاوی یاریدە دەری جگە لەفوئاد مەلامەحمود کە دەستگیر نەکرابوو بەبیانوی ئەوەی کە گوایە تاوانبارکرابوون بەوەی لە ڕێکخراوێکی ڕامیاری نێوان بەغداد و سلێمانیدا کاردەکەن .

بەداخەوە کەکاک (جەمال پێنجوینی وحەمەساڵحی برایم) لەیاد نەبوو لە سەرەوە ئەبوو بەتێکەڵاو لەگەڵ ناوەکانی پێشو بمنوسینایە داوای لێبوردن لەهەموو ئەو کەسانەی کەناوەکانیانم لەیاد نەمابوو و هکو

لوتفی مەحمود فەندی ڕەسام ناسراو بەکشمیش برای شەهید محەمەد قودسی .

ئینجا نۆرەی ڕوداوە سەیری سەمەرەکانی ئەوقەسابخانەیە کە تێیدابووین وەکو فارس ئەڵێ تەڕ یەڕ نەباشەد ، دیارەمەرجی سەرەکی ئازایەتی و نەشڵەژاندنە واتە شپرزەنەبوون لەسات وکاتی لێقەوماندا وەکو چەندین بەسەرهات و ڕوداوی تری ئەم و ئەو لەوانە، ڕوداوەکەی کاک ڕەشۆل عەبدوڵلە کەلەژێر ناوی قەلەباچکەدا ئەگیرێ لەناو تورەکەی تەتەرێکدا کە گوایە پارەی بەدەرەوەداوە، واتە بەشۆڕش ، هەربۆیە ئەیگرن و ڕاپێچی بەردەم زەعیم سدیقی ئەکەن ، وئەمیش لە وەڵامدا بەوپەڕی ئازایەتیەوە ڕوئەکاتە زەعیم سدیق و ئەڵێ( من نە قەلەباچکەیشم و نەپارەیشم بەکەس داوە من ڕەشۆلم ڕەشۆل نەلەکەسیش ئەترسم تەنیا لە خوانەبێ ، چونکە هەر تۆبووی زەعیم سدیق لە ساڵانێکدا کەبەدو نەجمەیی نەقلی سلێمانی بووبوویت ، ئەوکاتە بەندە متعاهدی نادی عەسکەری بووم ،چەنددەها جار پێت ، ئەتوت تۆم لە براکانم خۆشتر ئەوێ جائێستا تۆسولتانی ئەم شارەیت ، پیاو هەیە من لێی بترسم .

دەم ودەست کەزەعیم سدیق خۆی ئەیزانی کەڕەشۆل عەرەبی نازانێ کەبۆیان تەرجومەکرد و لەقسەکانی گەیشت دەستیکردە ملی کاک ڕەشید لەگەڵ خۆیدا بە قاقای پێکەنینەوە بەرەو دەرگای دەرەوی برد ، هەرلەوکات وساتەدا کشمیش رووی ئێکردم وتی قادر برسی ئەڵێی چی ،،،؟ ، منیش وابکەم ، کارێکی والەتەک زەعیم سدیقدا بسازێنم ، منیش لەوەرامدا وتم، ئەوەتەنیا تیرێک بوو لە کەوانی کاک ڕەشێد بەباشی ئامانجی خۆی پێکا، جاتکام ئەوەیە کشمیش گیان ئەوە بەکەس دووپات ناکرێتەوە، نەکەی گونی خۆت و ئیمەیش بەتەقاندن بدەی بەزەعیم سدیق و سەربازەکانی، ئیتر هەردوکمان بە نائومیدی لێی دانیشتینەوە سەرجێگەی خۆمان. حەمەی لالە ئەمین جارێکی تر بەهەر فێڵ و فەرەجێ بوو هەندێ پەڕۆو پاتاڵی ئالان

به دەستی چەپییەوە کەگوایە لەلێداندا دەستی لەجەمام چووە. ئەوەبوو لە شەودا هەندێ موزەمیدی سەربازی هاتن بۆ تەماشاکردنی نەخۆش و برینداەکانی بەند کراوەکان .
ولێدراوەکان ، لەوانەش کاکە حەمە چووە بەردەمیان بەعەرەبی تێی گەیاندن کەئەمیش لەئەنجامی لێدان دەەستی چەپی لەکارکەوتوە، ئەوانیش ناویان نووسی وژورەکان گەڕان و هاتنەوەلامان دیسانەوە کاکە حەمە چووە لایان بۆ ئەوەی تیماری دەستی بکەن ، بۆ نەگبەتی کاکە حەمە چونکە بەفرت و فێڵ خۆی ئەوکارەی کردبوو، لە بیری ئەچێتەوە کە دەستی چەپیان پێشانبدات ،،، لەبری دەستی چەپ دەستی ڕاستی خۆی ئەداتە دەستیان، ئەوانیش دەست ئەکەنە قاقای پێکەنین ،وئەڵێن پێش ئێستا دەستی چەپت پیشانداین لەکوێوە بوو بەدەستی ڕآست؟ ئەم بەزمەی بۆیەکرد مەبەستی ئەوەبوو بەوهۆیەوە بەبیانووی دەستییەوە سەرێ لە دەرەوەی ئینزیبات خانەو نەخۆشخانەی دەرەوە بدات، بەداخەوە ئاواتەکەی نەهاتەدی ئیتر ئەوەندەی نەخایاند لە بەندیخانەی سەربازیەوە بەرەو بەندیخانەی گەورە براین کە ئەوسا لە سەرو نەخۆشخانەی کۆمارییەوەبوو لە سەر شەقامی پیرەمێرد .
ئەوەبوو پاش ماوەیەک، ڕووداوە سەربازییەکەی ( ١٤ ڕەمەزان )ی تیاپەیدابوو لە ساڵی ١٩٦٣ دا هەر بەو بۆنەیەوە هەموومان بەرەڵلە کراین و دەرگامان بۆخرایە سەرپشت بەهۆی ڕێکەوتنێک لەنێوان میری بەغداد و سەرکردایەتی کورد، پێشوازیەکی گەرم و گوڕمان لێ کرا لە لایەن جەماوەری شاری سلێمانیەوە لەشەوی جەژنی ڕەمەزاندا، بەربوونی ئێمە بەندکراوەکانی شۆڕشی کوردستان بە (ئاڵ و گۆر ) بەکەس و کاری خۆیان شادبوونەوە .
لەکۆتاییدا داوای تەمەن درێژی بۆ هەموو ئەو زیندانیانەی ئەوسا کە لە ورۆژگارە سەخت وتاڵانەدا بەوپەڕی ئازایەتی وجوامێرییەوە ڕووبەڕووی دوژمنان بوونەوە ،ماندو نەبوونی لەهەموو ئەو قارەمان وتێکۆشەرانەی شۆڕشی ئەیلول دەکەم کەلەیەکەم گرتنی ساڵی ١٩٦٢ بەشداربوون، یاخود لە زیندان وگرتووخانەکاندا گیانی پیرۆزیان بەخشی، دووبارە سوپاسی بێ پایانی هەموو ئەوکەسانە ئەکەم کە یارمەتی دەری ماڵ و خێزانەکانی گیراوەکانی ئەوسایان ئەکرد لەوانە بەتایبەتی حاجی دەروێشی بەقاڵ ، لەتەک ئەو هەموو پیاو چاکانەی دەرەوەی بەندیخانە وەکو حاجی ئەحەڕەشید و گەلێ پیاو چاکانی هاوتای خۆی .
لەگەڵ سوپاس و ڕێزمدابۆ نووسەری ئەم پەرتووکەمامۆستابەڕێز (محەمەد باقی سەعید)ی هاوڕێم، هیوادارم پێنوسە خاوێنەکەی هەرلەکاردابێت بەشێوەی (گۆڤاری ئامانج )ی ئەوسەردەمەی ئەوسا کەبەنهێنی دەر ئەچوو .

لەکۆتاییدا ئەم پارچەشێعرەی خۆمتان پێشکەش ئەکەم

## ڕۆژانێک لە سەرەتاییەکاندا

ڕۆژانێکێ سەخت ودژوار
کوڕە ئازاکانی ناوشار
بۆبەرگری لەکوردستان
بوونەشورە بوونەدیوار
ڕژانە سەرجادەو شەقام
بەیەک دەنگ وبەیەک ڕەفتار
لەشارەوە بۆلادێ کان
خێڵ وتیرە بوونەچەکدار
ناویان لێنرا بەپێشمەرگە
کچ و کوڕانی هەرزەکار
چەشنی چەپکی گوڵ وخونچە
بۆپێشوازی وەرزی بەهار
بۆهەمیشە دەست لەناودەست
دور لەچاوی پیسی بەدکار
ئەمڕۆش پیرو بە ساڵاچوو
لەناواندا وون و نادیار
زۆر لەوانەش کران بەشت
نەیان دیبوو ئێش و ئازار

# عەبدوڵڵەی پەرستیار



عەبەی حاجی عەلی دەروێش ئەمین حەمامچی کەلەبنەماڵەیەکی شاری سلێمانیە، باوکی ودایکی بەکاری حەمامچێتیەوە خەریکبوون بەتایبەت لەحەمامی موفتی ،لەبنەماڵە ناسراوەکانی سابوون کەرانن کەماڵیان لەسەرچادەکەبوو بەرامبەر چوخمەکەو مالێ حاجی کەریمی شمقار .دوای ماڵیان هاتە تەنیشت ماڵی ئەحمەد ئاغای ڕەسوڵ ئاغا بەرامبەر حەمامی موفتی کاک عەبدوڵڵە لەگەڵ براکەی تۆفیقی عەلی دەروێش ئەمین لە ئینزیباتخانە بەندبوون کاک تۆفیق لە شەقامی نالی پێڵاو فرۆشبوو بەڵام ئەم زوبەرەڵلابوو بەتۆمەتی یارمەتی پێشمەرگە گیرابوو چەندساڵێکە کۆچی دوایی کردوە ، عەبدوڵڵە بەتۆمەتی پێشمەرگەی ناو شار گیرابوو ، زۆر ئازاردرا .

# ( حەمەی حەمەلاو )



حەمەی حەمەلاو ناسراو بە حەمەلاو لە ساڵی ١٩٢٩ دا لەدێی خەراجیـان لەدایـک بـووە ، لە ساڵی ١٩٥٩دا پەیەوندی کردوە بە ڕێزەکانی ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە لەهەمان ساڵدا پلەی ئەنـدامێتی پـێ دەبەخـشرێ ، لە سـاڵی١٩٦١ دا لەکـارگەی چـگەرەی سـلێمانی دامەزراوە ، لەڕێزەکانی پارتیدا کاری هێنان و بردنی داو و دەرمان و بەیانی پێسپێرراوە لەگەڵ پێویستی حیزب لە نێوان ڕێکخستنی سسلێمانی و ڕێکخستنی ناوچەی بەغداد ، کەلۆریەکەی کارگەی جگەرەیان بەکا ئەهێنا بۆ ئەومەبەستە .

لەمـانگی ١١ی سـاڵی ١٩٦٢ دا لەبـازگەی سـلێمانی دەسـتگیر ئەکرێـت دواتـر ڕەوانەی ئینزیباتخانەی سلێـانی دەکرێت ،ئازارو ئەشکەنجەی زۆر ئەدرێت ، دواتر ڕەوانەی بەندیخانەی گشتی سلێمانی دەکرێت ماوەیەک دەمێنێتەوە ، تاکۆدەتای ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ دا لە گەڵ هەموو گیراوەکاندا ئازاد دەکرێت. کاکەحەمە زاوای مەحمودی مەلا عیزەت بوو خەڵکی دێی خەراجیان بوو .پیاوێکی کوردپەروەر و ڕاست و دڵسۆزبوو ، هەردەم ئامادەبوو بۆ خزمەتی بێ بەرامبەر بۆ نەتەوەکەی . لەساڵی ١٩٨٩ داکۆچی دوایی دەکات.

## (جەزا عەلی کاتب )



لەساڵی ١٩٤٦دا لە شاری سلێمانی لەگەڕەکی گۆیژە لەخێزانێکی کوردپەروەر لەدایکبووە، هەر لەتەمەنی منداڵییەوە، شەیدای ڕێبازی پارتی وبارزانیبووە،لە ڕیکخستنەکانی ناوشار پێشمەرگە بووە.

خوێندنی سەرەتایی ودواناوندی زانستی لە سلێمانی تەواوکردوە. لەدای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لە ئینزیباتخانەی سلێمانی لەگەڵ حەمەی فەرەج ئەفەندی وکاک کەمالی کوڕی وکۆمەڵێک نیشتمان پەروەر بەند دەکرێت ،بەتۆمەتی پێشمەرگەی ناوشار ، ئازارو ئەشکەنجەی زۆر درا ، دواتر ڕەوانەی بەغداد دەکرێت لەگەڵ د. سەروەر ، دوای کۆدەتای بەعس ٨شوبات ١٩٦٣ئازاد دەبن .

لەساڵی ١٩٦٦ پەیوەندیکردوە بەلقی چوار وشۆڕشەوە لەبیارە ، دوای بەیانی ١١ ئازاری ١٩٧٠ کرابە بەڕیوەبەری شارەوانی ڕانیە دوای کرابە بەڕێوەبەری شارەوانی بەکرەجۆ .

لەساڵی ١٩٧٢ دا ژیانی خێزانی پێکهێناوە ، لەساڵی ١٩٧٤دا پەیوەندیکردوە بەشۆڕشەوە ،دوای نسکۆ لەگەڵ خەڵکی هاتەوە ، لەروداویکی نەزانراودا لەڕۆژی ١٩٨٢/٤/١ دا کۆچی کرد .

# وەستا بەکری پێڵاو درو



وەستا بەکر دانیشتوی شاری سلێمانیە و دوکانی پێڵاو درونی هەیە لە ڕاستە بازاڕەکەی خوار حەوزەوشکەکە ، لەئاستی بازاڕی دۆلارەکە کەپشتی داوە بەو بازاڕەوە ، کادرێکی چالاکی پارتی بوو ، هەرچی نووسراو وبڵاوکراوەهەبوو کە لە بەغداد لەچاپ ئەدرا ، بەنهێنی ئەنێررا بۆ کوردستان ، لەڕیی ئەمەوە ئەیانهێنایە دوکانی ئەم، دوایی کاک فوئادی مەلامەحمود لەلای ئەم وەریئەگرت ، بەهۆی گرتنی بەیانەکانی ناو لۆری کارگەی جگەرەوە، گیرا کەناو وئەدرەسی دوکانی وەستابەکری لەسەربوو ، بەوهۆیەوە زۆر ئازار درا، تا ئەمرۆژ هەرلە دوکانەکەیدا بەکاری ڕۆژانەوە وبژێویەوە خەریکە، دەربارەی ڕۆڵی فوئادی مەلا مەحمود کەبەیانەکان ناوی فوئادیان لەسەر بوو، چووبوون بۆ گرتنی دەستیان نەکەوتبوو ، باوکیان هێنا بۆ ئیزیباتخانە ،داوای کوڕەکەیان ئەکرد ، دێمان پیاوێکی کەڵەگەتی بەویقار بوو لێی نەدرا ، بردیان بۆ لای وەستابەکر ، پرسیان ئەم پیاوە ئەناسیت ،،،؟، وتی : بەڕاستی نای ناسم قەت نەم بینیوە ، وەستابەکریش وتی : من نای ناسم ،دوای ئەوە ڕێگەیان دابچێتە دەرەوە.

## تۆفیق ئاغا کەریم خان



لە٢ /٤ /١٩٣٠دا لەسلێمانی لە دایکبووە لەگەڕەکی دەرگەزێن ،لەخێزانێکی بووەی ناسراوی سلێمانیە لەبنەماڵەیەکی ناوداری ئەم شارەن (سلێمانی) . قۆناغی سەرەتایی لە قوتانخانەی خالدیە تەواو کردوە ئاستی خوێندنی تادواناوەندی بووە ، لەساڵی ١٩٥٥دا ، دەورەی موزەمیدی تەواوکردوە ، لە گوندی حاجی مامەند دامەزراوە، پاشان لەنەخۆشخانەی گشتی لەسلێمانی، لەساڵی١٩٨٦ خانەنشینکراوە . کادرێکی دڵسۆزی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە ، لەڕۆژی ١٥ /١١ / ١٩٦٢دا لەئینزیباتخانەی سلێمانی گیراوە، گویزراوەتەوەبۆ بەندیخانەی حیللە ( بابل ) لەوێ ماوەتەوە تالە رۆژی٢٢ /١ /١٩٦٣ئازادکراوە . لەساڵی ١٩٦٤ گەڕاوەتەوەبۆسەرکارەکەی . لەکۆتایی ساڵی١٩٨٧کۆچی دواییکردوە، لاوێکی لە سەرخۆو هێمن بوو کەمدوبوو ڕەوشتبەرز بوو ، باوکی (کەریم خان ) لەپیاوە بەناو بانگ وناسراوی شارەکەبوو زۆر قسەخۆشبوو کەسایەتی شارەکەبوو.

# حاجی فەرەجی سوسێ



لەساڵی ١٩٠٠ دا لەدایک بووە، لەساڵی ١٩٧٣دا لەسلێمانی کۆچی دواییکردوە . لەتەمەنی لاوێتیدا پەیوەندیکردوە بەحیزبی هیواوە، دۆستایەتی هەبووە لەگەڵ بارزانی نەمردا لەوکاتانەی بەڕێزیان لە سلێمانی دەستبە سەر بووە. دڵسۆزوکوردپەروەربووە، بەماڵ یارمەتی شۆڕشی ئەیلولی داوە، لەبنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانیە هەردەم هەبوو بووە ،بنەماڵەکەی لەسلێمانی سەربەخوو بێوەی بوون، لەدوای خۆی خیزانێکی زۆری بەجێ هێشتوە کەناسراون ، لەناو خەڵکیدا ڕیزیان هەیە.

لەئینزیباتخانە لەگەڵمان گیرابوو بەتۆمەتی ئەوەی یارمەتی پێشمەرگەو شۆڕشیداوە .خوشبەختانە ئازاری ئەوتۆنەدرا چەند ڕۆژێکی پڕ یادەوەری و ڕێز و پڕ لە قسەیخۆش لەگەڵیا ئەوکاتانەمان بردەسەر ، زو بەرەڵا کرا لەدوای خۆی یادەوەریەکی خۆشی بەجێ هێشت.

# دەربارەی بنەماڵەی حاجی فەرەجە ئەفەندی



ئەم بنەماڵەیە بەکاروباری بەڕێوەبردنی گەراجەوە خەریکبوون لەسەرو ئەوەوە لۆری باریان هەبوو ، بۆ گوێزانەی ماڵی بازرگانی ، گەراجەکەیان لەشوێنی تەلاری نەقیبی ئەمڕۆدا بوو .
خێزانێکی دەوڵەمەندبوون ، لەکوڕانی حاجی فەرج کەگیرابوون برێتیبوون لە کاک محەمەد و ڕەئوف ، لەگەڵ کەمال کوڕی حەمەی فەرەجەفەندی ، جگە لەو دوبرایە ( کەریم و جەمال کەبرایان بوون زوو بەربوون) .
کاتی خۆی لەمانگی ١٠ ساڵی ١٩٦٢ دا لۆریەک گیرا بە بەیانی پارتیەوە، کە بەرەو قەڵادزێ ئەچوو بەوهۆیەوە ئەم بنەماڵەیە گیران سیانیان لە ئینزیباتخانە بە بەندکراوی مانەوە .
لەئینزیباتخانە ئازارو ئەشکەنجەی زۆریان چێشت ،کە ئاگایان لە بەیانەکان نەبووە بەڵام بەسەرئەماندا شکایەوە ، بووە کارەساتێک بۆ ئەم خێزانە ، کەلەکارەساتی ٩ /٦ / ١٩٦٣دا کەمالی کوڕیان ئەگیرێت ، کەسەیرئەکەن ناوی لەسجلی ئینزیباتخانەدا هەرماوە بەوهۆیەوە ، لەکارێزەوشک لەگەڵ پۆلێک شەهیدی تر گوللەباران ئەکرێن هەر بەزیندویی ئەکرێن بەژێر خۆڵەوە .

## بنەماڵەی سێوکانیەکان



حاجی ئەحمەد سێوکانی        حاجی محەمەدی سێوکانی

سێوکانیەکان چوار برابوون حاجی محەمەد، وحاجی ئەحـمەد ، و حـاجی مەحمـود، وحـاجی ڕەسوڵ لەدایک بووی سێوکان بوون سەر بە ناحیەی بنگرد کەبەسەر گۆمی دوکاندا ئەیڕوانی. لە ساڵی ١٩٤٨ دا حاجی محەمەد شۆفێری تایبەتی شێخ مەحمـودی نەمربـووە.، هەموویـان تێکەڵاوی کاری سیاسەت بوون ، لەڕێزی پارتی دیموکراتی کوردستاندا کاریانکردوە ، بەهەموو تواناکانیانەوە خزمەتی شۆڕشیان کردوە گەراجەکەیان (لەدەبۆکەدابوو کەئێستا بازاڕی دەبۆکەیە ) و سەیارەکانیان تەرخانکردبوو بۆگویزانەوەی ماڵی بازرگانی وخەڵکی، لەنێوان سلێمانی و هێلی ڕانیەو قەڵادزێ .

لەساڵی ١٩٦١دا حاجی ئەحمەد وحاجی ڕەسوڵ، نەفی ئەکرێن بۆ (نوگرەسەڵمان ) ، لەکۆتایی ساڵی ١٩٦٢دا دیسانەوە لەگرتوخانەی ئینزیباتخانە هەموویان ئەگیرێنەوە، تەنها حاجی محەمەد و حاجی ڕەسول بۆماوەیەکی زۆرتر ئەمێننەوە و ئازارو ئەشکەنجە ئەدرێن . بەتۆمەتی ئەوەی بەیانیان لەلۆری ئەوانداگرتوە و یارمەتی پێشمەرگەیانداوە وبەیـان و پێویـستی شۆڕشـگێران ئەگوێزنەوە بەلۆریەکانیان ،دوایی بۆ بەندیخانەی گشتی سلێمانی ئەگوێزرێنەوە،. لەکاتی مەنعی تەجەولدا دەبنە پێشمەرگە ، لەکاتی شەڕی براکوژیدا ، لەساڵی ١٩٦٤ دا واز لە پێشمەرگایەتی ئەهێنن ،خەریکی کەسابەت ئەبن ، زۆرترین بەسەرهات و گیرانیان لەسەرکوردایەتی و یارمەتی شۆڕشەوەبووە هەموویان کۆچی دواییان کردوە.



بەڕێز مەلامستەفا بارزانی ، لەدوای گەڕانەوەی بۆ باوەشی نیشتمان لەسەردانەکەیدا بۆ سلێمانی لەگەڵ چەند کەسایەتیەکدا کۆبووەوە لەوێنەکەدا : حاجی ئەحمەد ڕەشید کەسایەتی شارو بەقاڵ لەگەڵ ڕەشۆلی هونەر مەند دەرکەوتوو

## ڕەشۆلی هۆنەرمەند



ئەم هونەرمەندە یەکێک بووە لەکەسایەتیە ناو دارەکانی شاری سلێمانی، یەکێک بووە لە دەنگ خۆشەکانی شارەکە، هەردەم لە دیوانی شێخی نەمردا ئامدەبووە، پیاوێکی کۆمەڵایەتی بوو، لەلای زوربەی زۆری خەڵکی شار ناسرابوو، زۆرترینساڵەکانی ژیانی بە بەڕێوەبردنی یانەی فرمان بەران و یانەی سەربازیەوە خەرێک بووە، بەهۆی یانەی سەربازیەوە، کەلە بەردەرکی سەرابوو ناسیاوی لەگەڵ زەعیم سدیق پەیدائەکات، بەو هۆیەوە کاتێک کەگیرا لە ئینزیباتخانە زەعیم سدیقی ناسیەوە بەڕەڵلای کرد .

پیاوێکی قسە خۆش و نوکتە زان بوو، لەگەڵ قاشە یوسف سڵێمان لەساڵەکانی ١٩٦١بەدواوە هاوڕێ بوو بەوهۆیەوە فرمانی گرتنی دەرچوو بەتایبەت ساڵی ١٩٦٤، سلێمانی بەجێ هێشت لە ناوچەی پێنجوین پەیوەندی کرد بەپێشمەرگەوە ،هەرلەوێش کۆچی دواییکرد ، خێزانەکەی

**بەناوی ئەختەر بوو ، لەوکاتەدا کە تەرمی شێخی نەمر هێنرایەوە بۆسلێمانی لەساڵی ١٩٥٦ دا لەبەردەرکی سەرا تەقەی لێکراو خێزانەکەی ڕەشۆل گوولله‌ی بەردەکەوێت شەهید دەبێت.**

# شێخ ڕەئوف سەید نوری نەقیب گڵەزەردیی بەرزنجی



لە بنەماڵەیەکی ئاینی و نیشتمان پەروەریە لەساڵی ١ /٧ / ١٩٠٨ دا لە گەڕەکی مەڵکەندی لە دایکبووە ، لە ٣/٧ / ١٩٩٤ کۆچی دوایی کردوە لەگردی سەیوان لای شێخ مارف بەخاک سپێردراوە .

لە ڕۆژی ٢٠/ ٦ / ١٩٦٣ دا لەلایەن دڕندەکانی زەعیم سدیقەوە گیراوەو ماڵی تالانکراوە وبەڵگەنامەو ڕۆژنامەو وێنەی زۆری شۆڕشی شێخ مەحمودیان لەماڵەکەیدا سوتاندوە، هاوکاری شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی کردوە لە پیران و جاسەنە و ئاوباریک . کۆڕەکانیشی دەوری کوردایەتی و شۆڕشگێریان دیوە کە شێخ تاهیری کوڕی ماوەیەکی زۆر پێشمەرگە بووە ، کاتی خۆی ئەفسەربوو لە سوپای عێراقدا ، لەگەڵ شێخ سەلاحی کوڕیان ، شێخ ئەحمەدی کوڕی دەورێکێ دلێرو ئازایانەی هەبووە لەدەرەوەی وڵات ، لەناوڕیزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا چالاکانە کاریکردوە . لەوێنەکەیدا بە ئاشکرا دیاربووە کەلەگیراوەکانی ئینزیباتخانەبووە ، ئەم بەڕێزەلە ئینزیباتخانەدا لەگەڵمان نەبووە لەدوای بەربوونی ئێمە گیراوە

# هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی حەمەجان عەزیز قادر



لەساڵی١٩٢٤ لەدایکبووە ، لەساڵی ١٩٩٥ کۆچی دواییکردوە ، زەعیم سدیقی تاوانکار ، هەربەئازاردانی گیراوەکانی ئینزیباتخانەوە نەوەستا ، بەڵکودەستی غەدرو کاری نامەردانەی زۆر شوێنی کەی دەگرتەوە ، یەکێک لە تاوانەکانی دژی خانەوادەی حەمەجان بوو ،.کاتێک کاک حەمەجان مفەوەزی پۆلیس بوو لەساڵی ١٩٦١دا، لە قەڵاکەی قەشقۆڵی نزیک دوکان ، لە گەڵ پۆلیسە دڵسۆزەکانی هاوڕێی ، توانی دەستبگرێت بەسەر مەخفەرەکەدا (مەرکەزەکەدا ) ،کەچەکی زۆری جۆراوجۆری تیابوو وەک کلاشنکۆف وهاوەن وتەقەمەنی وفیشەک ، هەمووی پێشکەشی سەرکردایەتی شۆڕش کرد ، کە لەوکاتەدا شۆڕش تازەبوو زۆر پێویستی بەچەک وتەقەمەنی هەبوو بەوهۆیەوە چەندین پێشمەرگەی بێچەک پێی چەکدارکرا .لەوکاتەدا یەکێک لە سەرکردەکانی پێشمەرگە وتبووی : بەهۆی هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەیان ، کۆمەڵێک چەکمان دەستکەوت ژمارەی چەکدارانمان زیادیکرد کە لەوکاتەدا زۆر پێویستمان پێیبوو.

لەکاردانەوەی ئەم هەڵوێستە دا، زەعیم سدیق لەتۆڵەی ئەمەدا ، لەشەوێکی ساڵی ١٩٦٣ دا هەڵیکوتایە سەر هەردو ماڵەکەی حەمەجان لەگەڕەکی خەبات ، دەستیکرد بە جنێودان و ئازار دانی خێزانەکەی ، هەموویانی کردەدەررەوە ، بەشۆفڵ و مودەرەعە خانووەکەی ڕوخاند ، لەگەڵ زەویدا تەختی کردن و نەوتی کرد بەسەر دارو پەردویانداو ئاگری تێبەردا ، تا هەمووی نەسوتا وازی نەهێنا ، هەرچی بلۆک وداروپەردوی مابوو، بردی بۆگردی سەیوان ( سەرقەبران ) لەوێ ڕەبیەی عەسکەری پێدروستکرد . پالاماری ژن و منداڵەکانیان دان بەزۆر سواری زیلی سەربازیانکردن بەرەو ماوەت بردیانن . ماوەیەک لە ئەشکەوتی مالومە مانەوە، دوایی لەدێیەکانی ئاوەکورتێ و عیساوێ نیشتەجێ ئەبن .

کاک حەمەجان وەک پێشمەرگە لەوناوەدا ئەمێنێتەوە بەتایبەت لەچەمی ڕەزاندا لەگەڵ بەڕێز مام جەلالدا. لەساڵەکانی پەنجاوە کاک حەمەجانمان ئەناسی ئینزیباتبوو ، زۆر بەتەنگ

ئەنجامدانی کارەکەیەوەبوو لە گەڵ زاوایەکی ئێمەدا ، بەناوی حاجی حسەین .    ئنزیبات بوون . لەگەڵ هەلگیراسانی ئاگری شۆرشی ئەیلول بووەتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان ، لەداخی  لەناوبردنی کوڕەکەی  ، کەلەلایەن ڕژێمی بەعسەوە لەناوبرا ، ناوی (ڕەفیق ) بوو ، کاری تێکرد هەربەو هۆیەو بەو داخەوە لەساڵی ١٩٩٥ دا سەرینایەوە ، کۆچی دواییکرد.

تێبینی : زانیاری لەلایەن حاجی سڵیمانی کوڕیەوە وەرگیراوە

# حەمەی لالە ئەمین



کاکە حەمەی لالە ئەمین لەبنەماڵەیەکی ناو شاری سلێمانیە کەپێکهاتبوون هاتبوون لەپینج برا لەبەریزان  عەلی و مەحمود  و ئەحمەد و محەمەد، کەهەموویان بە کاری بەڕێوەبردنی چایخانەو ئوتێڵ و چێشتخانەوە خەریک بوون، وەک وابزانم کەسیان ژیانی هاوسەریان پێکنەهێنـابوو ، تاکە خوشکێکیان هەبوو خزمەتی ئەکردن ، کاکە حەمە پیاوێکی قسەخۆش و کاسـایەتیەکی کۆمەڵایەتی بوو ، کورد پەروەر و دڵسۆزبوو ،نهێنی پارێزبوو، زۆر قسەی نەئەکرد ، کـەمتـر نیازی دڵی ئەدرکاند ، ئەندامی پارتی بوو ، هەرچەندە لەبەندیخانەدا، دانی بەم ڕاستیەدا نەئەنا ، بیرمان بۆ ئەوە ئەچوو لەوانەبێت کەگومانی هەبێت یەکێک ڕاستی لەسەر بڵێت ، کەحەقی بوو ، هەردەم جل و بەرگی کوردی تازەو ڕێک و پێکی لە بەردابوو ، بەپـەلـە پیتکـە خـۆی ئەتەکاند، کاک مەحمودی برای ئەندامی پارتی بوو لەبەشی کاسبکاران، ماڵیان لە سابوونکەران بوو، وائەزانم تائەمڕۆ کاک عەلی و کاک مەحمود و ماون کاکە حەمە کۆچی دوایی کردوە،،،؟ ،

# ئیسماعیل عەبدوڵڵە



خەڵکی دێی چنارەیە سەر بەقەزای دەربەندیخان لەبنەماڵەی سەیدەکانی بەرزنجەیە لەساڵی ١٩٣٠ لە دێی چنارە لە دایک بووە لەلایەن چەتەکانی زەعیم سدیقەوە لەڕۆژی ٢٠ /٦ / ١٩٦٣ دا دەستگیرکراوە کە زانیویانە ئەندامی پارتی دیموکراتە و هاوکاری شۆڕشی ئەیلولی مەزنە، پاشان ماڵی تاڵانکراوە، لەگەڵ چەند زیندانیەکی تردا لەگرتوخانەدا ئەوەندە ئازاریان داوە دونینۆکیان دەرهێناوە ئەوبەندکراونەی لەگەڵیدا بوون،تا ئیستا هەندێکیان لەژیانداماون لەشاری دەربەندیخان نیشتەجێن، بەبەندکراوی ڕەوانەی بەندیخانەی (موسەیەب ) کراوە لەمانگی٧ ی ساڵی ١٩٦٥ بەلێبوردن ئازاد کراوە .

، دوای چەند ساڵێک بەهۆو کاریگەری ئەشکەنجەوە کۆچیدوایی کردوە . شێاوی باسە زەعیم سدیق لە سپیدارەی نزیک چنارە، دوای نەبەردیەکی پێشمەرگە لەداخا دێیەکەی کاولکردو کۆمەڵێک لاوی گرتوە بەبەر چاوی کەس وکاریانەوە ئەو دڕندەیە گوللەبارانی کردون . ئەم بەڕێزە نەلە ئینزیباتخانەو نەلەبەندیخانە لەگەڵمان نەبووە ئەشی لەشوێنی کە بەندبووبێت

## هەوڵی لەناوبردنی زەعیم سدیق

## بەسەرهاتی کەمال قادر ڕۆستەم



وەستاکەمال لەساڵی١٩٤٣دا لەگەڕەکی مەڵکەندی لەدایک بووە، لەساڵی ١٩٦١ لەڕیزی ڕێکخستنەکانی پێشمەرگەی ناوشاردا کاریکردوە ، لەوساڵەدا لەگەڵ هاوڕێکانی گرتنی مەرکەزی پۆلیسی سەرشەقامیان پێسپێردرا لەسەرکارێز کەوەعدبووە لە سەعات ١٢ شەودا بیگرن وەستاکەمال ئەڵێت : لەماڵی عەلی مارف یەکمانگرتبوو سێ کەس بووین ئامادە بۆ ئەم کارە وکاک عومەری سەید عەلیمان لەگەڵبوو دواتر فەرمان دەرچوو کە واز لەم کارەبهێنین .

گرنگترین چالاکیمان ئەوەبوو ئێمە ڕۆژانە لە چایخانەی سۆلاف ( کەئێستاکاسەمۆڵە) برامبەر بەماڵی شێخ عەزیزی تاپۆ هەردەم لەوێ دائەنیشتین، لەوێ برادەرێکی کوردی مەندەلی مان ناسی کە حیمایەی زەعیم سدیق بوو، ناوی فەیزوڵلە بوو، ڕۆژێک لەدانیشتنێکدا لە گەڵی قسە بەقسەداهات ، وتی زەعیم سدیق زۆر زاڵمە غەدر لەخەڵکی سلێمانی ئەکات ، ئەگەر ئێوە ، یارمەتیمان بەدەن ئەتوانین بیکوژئن ولەناوی بەرین ، ، ئێمەیش وتمان ئەمە بیرۆکەیەکی پەسەندەو جوابت لێئەگێڕینەوە، کە پەیوەندیم کرد بە لێپرسراوەکەی خۆمەوە وەڵامم بە ئەرێ وەرگرتەوە، وبەفەیزاڵلام وت: کارێکی پەسەندەو بەکلاشینکۆف و دەمانچە ئەنجام نادرێت بەڵکو بە خەنجەرو چەقۆ. با بەبێدەنگی بێت، بێتەقە. فەیزاڵلا وتی : ئێمە شەش کەسین کە شەوانە پاسەوانی زەعیم سدیق ئەکەین .

دوایی بە فەیزوڵلام وت : ئەم کارە خۆتان ئەنجاممی بدەن ، ئێمە ئەتوانین لەناوشار دەرتان بکەین ، تۆزیک گومانم لێی پەیداکرد، رۆژیک لەگەڵی چووم بۆ جولەکان وخانوی باخەوانەکەم پیشاندا کەلەخوار ناوەندی جەمهوری بوو ، ئەوکاتە دەوری هەموو دەشتبوو، بەپیلانەکە ڕازیبوون، ئێوارەیەک دانرا بۆ ئەنجامدانی.

لەحیزب برادەریکیان بەرەو ڕووکردمەوە کە ناوی فەتحوڵلەبوو ئازاو چابوکبوو ،هات بۆ چایخانەکە کەبچین چەک لە لێپرسراوەکەمان وەربگرین و بەرەوجولەکان بۆشوێنی دیاریکراو

بچین ، بۆ ئەوەی لەکاتی خۆیدا ڕزگاریان بکەین، کاتێک گەیشتینە شوێنی مەبەست دیمان بەسەرباز تەنراوەو لەبۆسەدان ،بەفەتحوڵلام وت: لێم دوربکەوەرەوە دیارە چاوەڕوانی ئێمەن ، کەمنیان دی بانگیانکردم دەستگیریانکردم بەقۆناغە تفەنگ تێم کەوتن بردیانم بۆ حامیە بۆ بەردەم زەعیم سدیق کەلە ژورێکدا لەگەڵ ئەفسەرەکانی دانیشتبوو ، وتی ئەمەیە ویستی من بکوژێت،،،؟. ئەوانەی لە دەوری بوون ، عەقیدسالم وملازم ڕەشید ورەئیس فەیسەڵ و کەسانی تر ئامادەبوون ،کەوتنەوێزەم ئیعتیراف بکەم . عەریف ئیسماعیل و ڕەئیس عورەفا سوبحی کە ئیستیخبارات بوون لەوێبوون کەوتنە لێدانم وهەڵیان واسیم و ئەیان وت سەیدی بیدەرەدەستمان بالەدەرەوە لەت و پەتی بکەین . دوایی بەرەو ماڵ بردمیان وتیان کوا کەمال ،،،؟ ، دایکم لەوەڵامدا وتی ئێمە کەمال ناومان نیە، لەماڵەکەماندا باوەشێک بەیان و دەرمانیان گرت ، براکانم هەموو گیران من بۆحامیە وئەوان بۆ ئینزیباتخانە، وتیان :ئەو بەیانانەت لەکوێبوو؟ لەکوێ چاپکراوە؟ ئەگەر ڕاست نەلێیت ئیعدام ئەکرێیت لەسەری ، لەژورێکی بچووکدا هەڵیان واسیم ، بەیانی برام بۆ ئینزیباتخانە، ملازم ڕەشید المهداوی زۆری لێدام کە ئیعتیراف بکەم، بردمیانە ژورێکی بچوک و بەستمیانەوە، دوکەسیان هێنایە بەردەمم، یەکەم حسەینی چایچیبوو، دوەم حەسەن دالآشبوو کەلە گەڵیاندا ولەگەڵ فەیزوڵلادا ، لە مەیدانی ماستەکەجارێک چامان خواردبووەوە، پاش دوڕۆژ لێدان و ئازاردان بەیانیەک عەریفێک بەناوی سەیدکامیل هات پەتەکەی لە دەست و پێمکردەوە وتی مژدەبێت ئینقیلاب بووە و زەعیم سدیق بە خۆیوو لیپواکەیەوە بەرەو بەغداد ڕۆیشتوە، دوای ئەوەش من بۆماوەی ٥٤ ڕۆژ لەوێ مامەوە برامە گرتوخانەی سەرەوە بەکەفالەتی ١٠٠٠ دینار ئازادکرام (.بۆ تێبینی):

١ / ئەم نووسینە لەلایەن بەڕێز مامۆستا حەمەڕەشێدی خۆشنووس نووسراوەتەوە کەلەزاری بەڕێز (کەماڵ قادر ڕۆستەم )وەریگرتوە و بەڕاسپاردەی ئەو نووسیویەتیەوە .

٢ / وادەرئەکەوێت لەکاتی ئێمەدا نەگیرابێت ، ئێمە لەئینزیباتخانە نەمان دیوە بەپێی نووسینەکە دوای ئێمە گیراوە بەتایبەت لەوکاتەدا کەباسی ئەکات ئێمە گوێزرابووینەوە بۆ گرتووخانەی گشتی.

## حاجی دەروێش غەفور ئەمین


حاجی دەرویش غەفور ئەمین

کەسایەتیەکی ناسراوی شاری سلێمانیە لەساڵی ١٩١٢ لەسلێمانی لەدایکبووە لەساڵی ٤ / ٦ /١٩٧٥ دا کۆچی دواییکردوە. هەر بەهۆی سەرنەکەوتنی شۆڕشی کورد و ڕێککەوتن نامەی الجەزائیری لەساڵی ١٩٧٥ دا بەوداخانەوە سەری نایەوە .

لەساڵی ١٩٦٣ دا لە بەندیخانەی گشتی سلێمانی گیراوە لەلایەن زەعیم سدیقەوە بەهۆی هەڵوێستی وپشتگیری پێشمەرگەوە شۆڕشگێڕانەوە وکوردایەتیەوە ، وکە یارمەتی شۆڕشی نوێی گەلەکەمانی داوە لەگەڵ حاجی ئەحمەد ڕەشید وەکالەتی کۆمپانیای وەبەرهێنانی زەیت و ڕۆنی ڕوەکیان بەدەستەوەبوو ، هەلێک بوو بۆ یارمەتی دانی شۆڕش بە ڕۆن و بەرهەمەکانی ئەوکارگەیە.

بەڕاستی پیاوێکی بەڕێزو هەڵکەوتو بوو ڕۆشنبیرو شارەزای کێشەی کوردبوو هەردەم خولیای دەنگو باسی شۆڕش و سەرکەوتنەکانی پێشمەرگەی کوردستان بوو، بەخشندەبوو، لەبەندیاخانەی گشتیی سلێمانی دیمان وناسیمان، بەودڵە فراوانەوە بەخشندەییەی مانگانەی بڕێەوە بۆ ئەوکەسانەی کە لە بەندیخانە دا لەگەڵمان بوون گیرابوون و کەم دەستن و خێزانەکانیان هەژارو نەبوو بوون .

بەڕێز: جلالی کوڕی بۆی گێڕامەوە (لەگەڵ هەموو براکانم پێشمەرگەبووین، دوای نسکۆی ١٩٧٥، کاتیک لە شآخەوە گەڕاینەوە بۆناوماڵ، زۆر بەتاسەوەبووین بۆبینینی باوکم کەماوەیەکبوو نەمان دیبوو، کە ویستم باوەشی پیابکەم ،، دیم خەمناک وبێدەنگ و دڵتەنگ دایشتوە بێتاقەتەو نەجوڵاو پێشوازی لێنەکردم، قسەی لەگەڵ نەکردم. هەروەها بەوشێوەیە لەگەڵ براکانیشم وابوو .

منیش لە دایکم پرسی، هۆی چیە و بۆ، چی بەسەرهاتوە؟ قسەی لەگەڵ نەکردم، دایکم وتی لەخەفەتی سەرنەکەوتنی شۆڕش هێزی ئەژنۆی شکاوە، مردن بە ئاوات ئەخوازێت و ئەلێت:

خۆزگە جەنازەی کوڕەکانم بۆ بهاتایەتەوە خۆشتربوو لەلام، نەک هەواڵی سەرنەکەوتنی شۆڕشی گەلەکەم، ببیستاتە و خۆزگە نەمدیبایە، وتی: هەر بەهۆی ئەو تاسە و خەمە گەورەیەوە بەنائومێدی سەری نایەوە.

***

## بەڕێز نوری ئەحەقومار

## هەوڵی چەند لاوێکی کەی پێشمەرگە بۆ لەناو بردنی زەعیم سدیق



لەوڕۆژەوەی کە یەکەم چاپی ئەم یادەوەریەم نووسیوە جەندەها کەس بەدەمی باسیان بۆکردوم کە چەند لاوێکی پێشمەرگەی ناو شار خوێنگەرم وگیان لەسەردەست، هەوڵیانداوە لە سەربانی مزگەوتی گەوەرەی سلێمانیەوە، تەقە لە زەعیم سدیق بکەن لەبۆسەدابوون وچاوەروانبوون زەعیم سدیق بەوناوەدا تێپەڕێت لەناوی بەرن، بەنیازی رزگارکردنی شارەکە لێی ، لەئەنجامدا کەتیپەڕ ئەبێت هەموو دەستئەکەن بە تەقە لە کاروانەکەی ، بەڵام بەداخەوە بەرنەکەوتبوو و پرسیم کێبوون ئەوانەی ئەنجامیانداوە وچۆن بووە؟ تائەمڕۆ زانیاری تەواوم دەستنەکەوتوە جیاوازی هەیە لە گێرانەوەیداو یەکێک لە وپێشمەرگانەم دەستنەکەوتوە کەخۆی لەگەڵیاندا بووە، بیگێڕێتەوە، وەک لە زۆرکەسم وەرگرتوە ئەڵێن ئەو بەڕێزانە، بەم کارەهەڵساون، ئەمانەن بەوهۆیەوە ناوی هەموو ئەوکەسانە ئەنووسم، لەوانەیە زیاد بن یان کەم بن بەهەرحال ئەم ناوانەیان داوە پێم :

١/ شێخ سدیقی چاپچی

٢/ بەکر ئیسماعیل ( بەکری حەلاو)

٣/ نوری حەمەعەلی

٤/ ئیبراهیم حەمە خورشە

٥/ عومەرچنگیانی

٦/ کەمالی ئەحەقومار

٧/ پێشمەرگەیەک بەناوی قوربانی

(وەک گێرایانەوە هەموویان ٧ حەوت پێشمەرگەبوون ).

لەم دواییەدا بەڕیز نوری ئەحەقومارم دی برای کەمالی ئەحەقومار کەیەکێک بووە لە ئەنجامدەرانی ئەوچالاکیە وتی : {ئەوەی ئاگادارم ئەوپێشمەرگانەی کە ئامادەبوون لەوچالاکیەدا،

لەمانگی شەشی ١٩٦٣دا لەکۆلانی خوێندنگەی کانیئاسکان خۆیان ئامادەکردبوو کە زەعیم سدیق بەوناوەدا تیبپەڕێت  دەست ڕێژی لێبکەن ، کەزەعیم سدیق ئەگاتە ئەو ئاستە بەهەموو دەست ڕێژی لێئەکەن ، لەئەنجامدا سایەقەکەی و دوحیمایەی ئەکوژرێن ، خۆی بەرنەکەوتبوو بەپێ ڕایکردبوو بەرەو حامیە بەرەو مالی شێخ لەتیف ( کەمالّیان ) لەولاترەوە بوو ، بەوشێوەیە خۆی ڕزگاری بوو . وتی ئەوپێشمەرگانەی بەم چالاکیە هەستان ئەم بەڕێزانەبوون:

١/ فەتح اللّەئەحمەد بەگ

٢ / شێخ محەمەد

٣ /سەلام مەلا سابیر

٤ / کەمالّ ئەحە قومار

٥ / عەلی فاتە

٦ / بەکر ئیسماعیل  (بەکری حەلاو) }

لێرەدا هەست بە جیاوازی ناوەکان ئەکرێت تائەم ساتە، بێگومان ناوەکان بەشیوەیەکی ڕاست ودروست نین ، ڕوداوەکەم وەک خۆی ، بۆمساغنەبووەتەوە

## فوئاد مەلا مەحمود



(داوا کراو )کەدەست نەکەوت ، لەگەڵ وەستاعومەر، نـەگیـرا، بـەیانـەکـان کـە ئـەگـەیـشتنە سلێمانی، ئەبران بۆ دوکانی وەستابەکر لەوێ (کـاک فوئـاد) وەری ئـەگـرت، دوایـی لـەلایـەن هەڤاڵانی پارتیەوە وەر ئەگیرا ودابەش ئەکر

# وەستا عومەری حەمە سەعید پێڵاودرو



ئەمساڵ لەبەهاری ساڵی ٢٠١٥ دا ،لاوێکی پێشمەرگە بەناوی: (نەقیب سیروان عومەر حەمە سەعید) لە چاپخانەی شەعب، پەیوەندی پێوەکردم وتی من برازای وەستابەکرم، باوکم ناوی (عومەر حەمە سەعیدە) پێشمەرگەو ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، باوکم بووە  هەردەم لە بەغداد بەیانی پارتی داوەتە دەستی ئەمینی عەبدەو حەمەی حەمە لاو کەبەلۆریەکەی کارگەی جگەرە بیهێننەوە بۆ سلێمانی.

نوسراوێکی بەدەستەوەبووو  کورتەیەکی ژیانی باوکی  تیابوو کەدەوری هەبووە ، لەکاروانی خەباتی نەتەوایەتیدا ، بەم شێوەیەی خوارەوەخوارەوە بوو منیش نووسیمەوە :

باوکی  (عومەر حەمەسەعید ) ، برای وەستابەکرە ، وەک ئەوپێلاو دروبوو ، لەساڵی ١٩٢٦دا ، لەسلێمانی لەدایک بووە، لە٢/٢/ ٢٠١١ کۆچی دوایی کردوە، لەلاوە تێکۆشەرەکان و پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بووە، تێکەڵاوی هەبووە لەگەڵ ماڵی فوئاد مەلامەحمود، دوایی لەکاتی نهێنیدا لەساڵی ١٩٦١ بەدواوە، لەکاتی زەعیم سدیقی خوێن ڕێژدا ڕاسپێرراوە هەردەم بچێت بۆ بەغداد لەچاپخانەی خەبات، بەیانی چاپکراو وەربگرێت(کە لەشوێنێکی نهێنیدا بوو ) بیداتە دەستی ئەمینی عەبدەو حەمەی حەمەلاو، هەرلەو جارەدا بەئاگاداری دوکتۆر سەروەر حەمەی دەروێش کەریم بووە، کەبەیانەکان وەر ئەگرێت ،ئەیداتە دەستیان . هەمووله ئوتێل سیروان بوون، کە دێن و دەچن، حەسەنی شێخ سەعید، لە ئوتیلەکەئەبێت، لە لایەکی ئوتێلەکەدا، دانیشتبوو کەئەبینێت دین ودەچن و بەکارێکەوە خەریکن، هەست ئەکات شتێک لەبن سەریاندایە، دوایان ئەکەوێت، خەبەریان لێئەدات. وەستاعومەر کە بەیانەکان ئەداتە دەستیان، بەتەنیا خێرا بۆ سلێمامی ئەگەڕێتەوە چاوەڕوانی وەرگرتنیان ئەکات .

## هەربۆ هەوێن دەوڵەمەندکردنی بیرەوەریەکان

### لە خوارەوەنووسین و چەند پارچە شێعرێکم هەڵبژارد

### کەبەبۆنەی کارەساتی ٩حوزەیرانەوە وتاوانەکانی زەعیم سدیقەوە نووسراون و تراون.

### یەکەم/



ئەحمەد حسین ئەحمەد

## ٩حوزەیرانی ١٩٦٣ چی فێرکردین ؟

### لەکوردستانی نوێوە ژمارە٤٥٩٢ لەرۆژی ٢٠٠٨/٦/٩

لاپەرە رەشە سەپێنراوەکانی ئەم شارە گەلێکن بەرەو رون شاراوە نین لەوەتەی بوونیاد نراوە و گەشـەیکردوە، خۆشەویـستی هەمووکـوردی بـۆلای خـۆی راکێـشاوە، وەک رووگەیەک بـاس لەپێـشەنکی وپیرۆزیەکـانی دەکرێـت، لەهەمانکاتـدا چـاوتێبرێن ورق و کیـنـەی داگیـرکەران وەستاونەتەوە ، تالەو سەردەمەوە تائەم دواییەش، سلێمانی کەوتبووە نێـوان دوزلهێـزەوە ، یەکێ رەش ویەکێ سپی هەرچی شاڵاوی رەشبوو کـاریگەری و شـوێنەواری بـرینە قوڵەکـانی بەتۆمارکراوی ماونەتەوە، بگرە چاوەروانی زرمەی داهاتوی ناخۆ شتریشیکردوە، بۆچی چونکە راوەستان لە ویستیدا نیەو نەبووە، هەرچی هێزی سـپی و روونـاکیە، کە لەسـەرەتاوە نـاخ و بەرگی گەشی نیشتمانپەروەریی ئەم شارە بـووە، وەک بەرنـامەیەکی بـروا ئـامێز تێیروانیـوە بـۆدابینکردنی (ئاشـتی ٠وئـازادی)، ئەودو وشـەیەی خەونـی هەمـوو مرۆڤێکـی دڵـسۆزەو لە چێژەکانیـان تێرنابێـت، وازهێنـان لێیـان ئەسـتەمە، باجەکەیـان تـابڵیی قـورس و ترسـناک وجگەربرە، سلێمانی شارە گزنگە خۆراگرتووەکەی کوردستان .

لەرۆژی (١٩٦٣/٦/٩)دا لەناکاو کەوتەبەر گـورزێکی گـران و ئێشێکی سـەختی داگیـرکەران، ئەوانەی چاویان بە تریفەی سەربەستی ئاسۆی ڕەنج و هەناسەی چارەنووسی گەلاندا هەڵنایەت و هەڵپەی کوژاندنەوەی بیری شوڕش و نەتەوایەتییان هەیە.

ئەورۆژە جاڕی قەدەغەکردنی هاتو چۆ درا، سنوری شارو ناو شەقام و کۆڵان و شوێنەگشتی ودیارەکانی بەژەندرمەی بەعس ، بەپاسەوانی نا نەتەوەیی عەرەبی ، دروستکەرانی پەیکەری مەرگ ،ڕاهاتووانی سیاسەتی درۆو ساختەو چاودابەستە بەدروشمی قێزەونی ( امه عربیه واحده ذات رساله خالده) قوتبوونەوە ،پشتبەستوو بە چەکی گەورەی وەک تانک و تۆپ وزرێپۆش و مەترەلۆز وهاوان ،چەکی سوکی وەک تفەنگی سیمینۆف وکلاشینکۆف وغەدارەو دەمانچە...هتد ، بەوپەڕی گرژی و دوژمنکارانەوە ڕژانە بەر ماڵانەوە ، شەڕو خوێنیان لێدەباری هەڵسو کەوت وهیرشی ناوەختیان ، تارمایی تـرس ودڵەڕاوکێـی بەخـشی بە هەمـووان ، هەرلەگەل گـرمەی ناسازی ئەو پەڵە هەورە ڕەشەدا ، دەیان مەفرەزەی سەربازی عەرەبی چاوسوور ، گۆشـکراو بەکـورد کوشـتن و سـزادان و سـوکایەتیپێکردن، بەشـێوازێکی نەریـت و بۆمـاوەی خۆیـان ، دوورلەهەموو یاسایەک ، دڕنـدانە ڕەفتاریـان دەکـرد، بێـشەرمانە خۆیـان دەکـرد بە ماڵانـداو دەکەوتنە پشکنین ، بەدوای پێشمەرگەو نووسراوی شۆڕش و ڕێکخراوەییدا . ئەوەندە لەو شارە تۆقیبـوون ، هەر چاوێکیـان کردبـوو بە چـوار، بەزۆر پەلکێـشی لاوان وپیرانیـان دەکـرد ، نەفرمیسکی دایک وخوشک وهاوسەرو منداڵ، نە سکاڵا کاری لەدڵی ڕەقیان دەکرد ، بەجنێودان و پەلبەستراوی بەرەو تەویلەکانی حامیەی سلێمانی و ئینزیباتخانە و گرتووخانەکـانی تریـان بردن ، فڕێیان دان ، ژمارەی گرتووان بەهەزاران مەزەندە دەکران ،هەموو چینەکانی کۆمەڵگە بەرکەوتن ، کرێکار ، جوتیار ،کاروانچی،مامۆستا ،خوێندکار ،پزیشک ،فەرمانبەر ، خانەنشین ، دادپرس ، پارێزەر ، سەربازو ئەفسەری مۆڵەتپێدراو، کەسانی میوان ...هتـد چەنـدان لەتـاو برسێتی وتینوێتی ونەخۆشی دەیانناڵاندو سەریان نایەوە، کێیان مەبەست بـووایە لەوزینـدانە بۆگەنەدا دەریان دەهێناو لەبەرچاوی هەمووان گوللەبارانیان دەکرد .

لەسەرانسەری شاردا بازێرەی تەق و تۆق دەستیپێکرد لە ئەنجامدا دەیان کەسی بێتاوان لەناو شارو دەوروبەری بەرکەوتن و گەشمردەبوون.

بەزۆری زۆردارەکی بەدەستگیراوەکانیان دەوت دەبێت جنێو بدەن بە سەرکردایەتی شۆرش و پێشمەرگەو ئیدانەی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردبکەن ، ئینجا وازتان لێدێنین ، بێگومان ڕۆڵە دەستگیرکراوەکانی شاری هەڵمەت و قوربانی لەوسیاسەتە گەندەڵە ڕەگەزپەرستیەی بەعسییە فەرمانڕەواکانی ولاتیان وەلاناو ڕەتکردەوە ، ئەوەبوو بێدادگاییکردن چەندانی تریش بەناڕەوا دەستڕێژیان لێکراو چوونە کاروانی شەهیدانەوە.

سەرکردە خوێنڕێژەکانی ڕژێم لەپێش هەموویانەوە زەعیم سدیقی گۆڕ بەگۆڕ کەدەیانویست سلێمانی لەبنەڕەتەوە هەڵبتەکێنن بەوەی کە پێگەی خۆپیشاندان وشۆڕشی ئەیلولە بەقسەی خۆیان (سەری مارە کە یە) و سەری پاندەکەنەوە، ئیتر کۆتاییی بەبەرنگاربوونەوە دێت و بەحەزو ئارەزووی خۆیان تەراتێن دەکەن و چیان بوێ لێی سەرپشک دەبن .

ئەم بۆچوونەشیان چووە پاڵ خەونە نەزۆکو خەیاڵ پڵاوەکانیان، شار پتر خرۆشا، ڕیزەکانی ئەوسای پێشمەرگە پتر قەرەباڵغ بوو، چالاکیەکان دەنگیاندەدایەوە، ئەمانیش (شەلم کوێرم نابوێرم ) ، لەسەرسیاسەتی سەرکوتکەری و خوێنڕشتن بەردەوامبوون ، لەزوربەی گوندو شارۆچکەی تر درێژەیان بەگرتن و کوشتن و داپڵۆسین دا.

ئەو ڕۆژگارانە بوون بەپەڵەیەکی شەرمەزاری بۆکۆدەتاچیەکانی بەعس وخۆڕاگریەکەیش بوو بەویست و بەرهەمێکی خەبات بۆخەڵکی کوردستان ،هەر لەو ڕوانگەیەوە دەیان شاعیرو نووسەر وسیاسەتمەدار بەشیعرو وتارو لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە ، بەشداریانکرد، ئەدەبیاتی بەرهەڵستکاری و نارەزایی لەدژی ئەوهەڵمەتە پڕ زەبرو زەنگەی ١٩٦٣/٦/٩ لەلاپەڕەی دیوانی شاعیران و ڕۆژنامە وگۆڤارەکاندا پرشنگدەدەنەوە ، جونکە گەورەترین و ترسناکترین مەنعی تەجەول بوو لەمێژووی شاری سلێمانیدا ،بۆنموونە مەلا ئەسعەدی مەحوی دەڵێت :

شەو ئەڕوا مەترسە ڕۆژی ڕوناکت وەتەن هەردێ

حەپسخانەی زوڵم ئەڕمێت وچاوی دوژمنت دەردێ

لەدیوانی عەدالەت ناحەقی پێوەن و زنجیرە

سبەی ئەشکێ ئەم زڕو هوڕەت لەپێ دەردێ

ئەزموونی نۆی حوزەیران (١٩٦٣)ئەوەی بەگوێدا چرپاندین دوای شەوەزەنگ کازیوە و دوای تێشکاند هەڵسانەوە لە دایک دەبن ، ئەوان لەسەرەتاوە وتیان : ئەگەر بجوڵێنەوە داوای سەربەستی بکەن ،چاوەڕوانی مەرگی خۆتان وکاولکاری وڵاتەکەتان بکەن ، هەردەم و دەس ، دڵەزینـدوەکان ومەچەکە پۆڵایینەکانی پێشمەرگە و ویستی بەگوڕو بەتوانای جەماوەریش وەڵامماندایەوە وتیان : بەرزڕاگرتنی دروشمی ( کوردستان یانەمان ) ودرێژەدان بەشۆرش وکۆڵنەدان ، هەموو ڕیسەکەتان دەکەینەوە بەخوری، ئێمەبەرەو ڕووناکی پێ هەڵدەگرین ،لەوپێناوەدا تێدەکۆشین تابەدی هێنانی سەرفرازی گەل وسەندنەوەی تۆڵەی زۆرلێکراوان وشەهیدانی ڕێگەی ڕزگاریی کوردو کوردستان بەدڵنیاییەوە ئاسۆی هیواو سەرکەوتن پێشوازیمان لێدەکات ، شانازی و سەروەری بۆ شەهیدانی ئەوڕۆژە ڕەشانەو مەرگ بۆ تێکڕای داگیر کەران .

## دووەم/ شـوێنەوارێکـی ڕەزاگـران و بـەجـێ مـاو لـەشـارەکـەمانـدا (بەدەستکاریەوە)

### ئەحمەد حسین ئەحمەد

لەساڵەکانی پێش کۆتایی سەردەمی پاشایەتی، حکومەتی نوری، سەعید، زەعیم رکن عەمەر عەلی کەرکوکی کرد بە (متە سەریف )، پارێزگاری سلێمانی ، سێ ساڵی بە سەربرد ١٩٥٤- ١٩٥٧ ، لە سەرەتادا لەخوارو دەشتی وەیس سەربەگەڕەکی چوار باخ، بۆیەکەم جار بڕیـاری دروستکردنی بینایەکی فرە ژوری فراوانی دا بەناوی (دار العجزە )ەوە، واتا خانەی پەککەوتە یان تەمەڵخانە، کەلەوەپێش لەگەڕەکی شیوی قازی لەخانووەکەی حاجی مەلا ئیسماعیل بوو، ئەم خانووە لە بەردی مەڵکەندی و قسڵ و گەچ دروستکرا ، سەقفەکەی بەخشتی سور چنرا وسەرەکەی بەچیمەنتۆ داپۆشرا، لە ساڵی ١٩٦٣ دا بیناکە لەلایەن بەعسیەکانەوە چۆڵ کراو کرا بەبنکەی سەربازی و کۆکردنەوە و دابەشکردنی ئینزباتی ناو شار، لەکارەساتی ٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣دا کرابە بنکەی کۆکردنەوەی هاووڵاتیانی گیراوی بێتاوان سـزادانیان و ناردنیـان بۆگوللە باران کردنیان ، دوای ماوەیەک ئەوتاقمە پیاوکوژە لـەلایـەن عـەبدالـسەلام عارفـەوە دورخرانەوە ، ئەوبینایە بەردەوام هەر بەبەشێک لە ئینزیباتخانە و شوێنێکی مەترسیدار مایەوە ، دواجار کە بەعسیەکان هاتنەوە سەر کورسی حوکم هەر بەهەمان شـێوە مایـەوە. پاشـان کردیانە مەحکەمەی سەربازی پازدە ، کرایەوە بەشوێنی زەبرو زەنگ ئازاردان و جەورو زوڵم و سوکایەتی پێکردن ، کە دانیشتوانی ئەم شارە تێکۆشەرە بەچاوێکی پڕلەقینەوە سەیریان ئەکرد . دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ بوو بوشوێنی زۆخێزانی ئاوارە ماوەیەک بەچۆڵی مایەوە ، دوای دەست پێاهێنانی کرابە بنکەی بەڕێوەبردنی کاروباری شارستانی و ڕەگەزنامە تائەمڕۆژ هـەر بەوشێوەیە ماوەتەوە .

**هەو بەوبۆنەیەوە پارچە شیعرێکی**

**بەڕێز کاک ئەحمەد حسەین ئەحمەد پێشکەش ئەکەین**

## (هێڵی سور)

زۆر زۆر بوون بۆ گیانی شارە خۆڕاگرەکەم

ناوی سیانیان دەهێنم گۆڕیان پڕ لەئاگر دەکەم

حوزەیرانی شەست و سێ لە شۆڕشی ئەیلولدا

کارەسات دروست بوو زوربەی کۆمەڵگەی لولدا

لەپێش هەموویانەوە زەعیم سدیق مستەفا

گۆمی خوێنی دامەزراند ڕوخانی پردی وەفا

لەنۆی ئەو مانگەدا بوو هات و چۆی قەدەغەکرد

ڕەشبگیری ئەنجامدا و سەدانی بۆ مەرگ برد

نالەی گریان وشیوەن لەگەڵ خوڕەی فرمێسکا

گەیشتە عەرزشی عەزیم خوێن مەیی لەگەڵ ئێسکا

شاریان کرد بەگۆمی خوێن لەکەس نەسڵەمینەوە

دەستیان چووە گیانی گشت دانیشتوان بەقینەوە

ئەو کوشتن و بڕینە ویژدانی هەراسان کرد

دەنگ دانەوەی تاوانیان ڕێی مەرگیانی ئاسانکرد

حوکمی ئەم شارە دەبێت هۆش وبیری لەگەڵ بێ

هێڵی سور نەبەزێنێ بەعەشقی کورد تێکەڵ بێ

## سێیەم/ (بەڵگەیەکی تر لەسەر تاوانەکانی زەعیم سدیق)

### ئەمیرە محەمەد

لەهەمان لاپەڕەی کوردستانی نویدا نووسراوە، ڕۆژنامەی ( النهزە) چاوپێکەوتنێکی کردوە لە گەل زەعیم سدیق ئێمەیش چەند دەستەواژەیەکی لێرەدا دوبارە دەکەینەوە : ڕۆژنامەکە باسی پاڵەوانێتی وخزمەتی زەعیم سدیق ئەکات بۆ نەتەوەی عەرەب نووسیویەتی: (پیاوێکی سادەوفیداکاربوو، هەردەم لەهەوڵی ئەوەدابوو کە یەکێتی نیشتمانی جێگیربکات ،وتویەتی لیواکەمان چەندین داستانی قارەمانێتی لە سلێمانی ئەنجامداوە شارەکەی بەرقەرار کردوە و توانیویەتی وێرانکەرە تیکدەرە شیوعیەکان ڕیشەکێش بکات وسەرکەوتنی لەزۆر ناوچەکاندا بەدی هێناوە دژی یاخیبووەکان ، کەهەموویان ورەیان روخاوە لەحاڵەتی ترس و تۆقیندان، خۆیان پێناگیرێت لەبەردەم هێزی لیواکەماندا ڕائەکەن. وتویەتی لەشەڕی ئاغجەلەردا یاخیبووەکان زیاتر لە ٣٠٠ کوژراو و برینداریان هەبووە ، هەر بەوپێیە لە شەڕەکانی ناوچەکانی خورمال و پێنجوین وچوارتاو بەرزنجە هەمان سەرکەوتنی بەدیهێناوە ،

وتویەتی لەپێش کۆدەتای ١٤ ڕەمەزان (٨) شوبات خۆم بەوێژدان وبریاری تاکی خۆم ڕەفتارمکردوە بۆبەرژەوەندی گشتی کارمکردوە ئاوڕم نەداوەتەوە لە فرمانەکانی عەبدولکەریم قاسم. باسی چەند سەربازێکی کردبوو کە چەند ئازایانە کوردیان کوشتوە و لاشەی یاخی بووەکانیان بۆهێناوە ، هێزەکانی هەموو هاوکاریەک دەکەن لەپێناوی ئاسایشی ناوچەکەدا .





ئینزیباتخانەی سلێمانی ( بەشی دوەمی) کە بۆ حەوانەوە وچالاکی سەربازی دابەشکردنیان بەکار ئەهێنرا، ئیستا بنکەی بەڕێوەبەرایەتی باری شارستانی و ڕەگەزنامەی سلێمانیە

## چوارەم/



**بەختیار مەلا عیزەت**

**حوزەیرانەکانی کوردستان**

**کورت کراوەی نووسینێکی : بەختیار مەلا عزەت، لەکوردستانی نوێدا ژمارە٤٥٩٣ لەساڵی ٩/٦ /٢٠٠٨ دا بڵاوکراوەتەوە.**

**لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم . و بەپێی بەرنامە ونەخشەی کۆلۆنیالیستەکان ،خواروی کوردستان لکێنرا بەعێراقی عەرەبیەوە. لە٦کانونی ١٩٢١ سوپای عێراقیان دروستکرد .سەرۆکێکی بێگانەیان لەحیجازەوە هێناو ، کردیان بە پاشای عێراق، دەوڵەتی عێراقیان پێک هێنا ،لە ودوو شوناسە جیاوازەی کوردستان و عەرەبستان. لە جوگرافیایەکی دەستکردا پێکەوەگرێدا ، کەگەورەترین کێشەی سیاسی ئابوری و کۆمەڵایەتی هێنایە ئاراوە ، کەمە نەتەوایەتیەکی سوننە مەزهەب دەسەڵاتیان گرتەدەست. کێشەی نەتەوایەتی و مەزهەبی سەریان هەڵداو ، هەشتا و حەوت ساڵ دەوڵەتی عێراق وسوپای عێراق کەوتە، بەرپاکردنی شەڕ لەگەڵ گەلی کوردستان ودەرو دراوسێدا چ لەئێران چ داگیرکردنی کوێت و بێسەرو شوین کردنی مرۆڤی کورد چ بە تاک و چ بەشێوەی ڕەشەکوژی و دروست بوونی هەزاران گۆڕی بەکۆمەڵ .**
**لێرەدا ئەگەر بڕوانینە لاپەڕەکانی مێژوو و دیکۆمێنتەکان و مەرگە ساتە خوێناویەکانی حوزەیرانی هەشتاو حەوت ساڵی عێراق دەبینین ، کورد توانیویەتی ڕووبەرووی ئەوهەموو کارەساتانە بێتەوە .**
**بۆیە بە پێی کۆرۆنۆلۆجی چەند دیمەنێکی مەرگەساتەکانی مانگگی حوزەیران دەخەینە ڕوو :**
**/- (لە١٤/٦/١٩١٩) دا مێجەر نۆئێل گەشتێکی بۆ باکوری کوردستان کرد کە ٣مانگ و (٧ ) ڕۆژی خایند گەشتەکەی بەیاوەری جەلادەت بەدرخان براکەی جەمیل پاشابوو .مێجەر نۆئێل ئەفسەرێکی سیاسی بەتوانابوو. وەک ڕاوێژکار حوکمداریەکەی شێخ مەحمود دانرا لە ١٩١٨/١١/١٦. بەنوێنەرایەتی (وێلسن ) بەئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆر لەبەردەرکی سەرا**

وتەیەکی بەوبۆنەیەوە بەفارسی خویندەوە بەڕەسمی شێخ مەحمودی بەرزنجی بەحوکمداری کوردستان ناساند.

‌‌/- (لە١٨/٦/ ١٩١٩) سەرکردەی مەزن شێخ مەحمودی بەرزنجی. سەر بەرزانە تامرد ژیانی ژێر دەستی و ملکەچی قبوڵ نەکرد هەمیشە دەیفەرموو.

نامەوێ ژینی ئەسارەت بەسمە عومری گومڕەهی

نایکەمە سەرخۆم بەدەستی مودەعی تاجی شاهی

قەت بە ئەمری دوژمنانم نامەوی فەرماندەهی.

(بەسەرهاتەکانی شێخی نەمرو شۆڕشەکانی ، لای زۆری رۆڵەی گەلەکەمان ڕونە ، لەنەبەردی بەردەقارەمانەوە تانەبەردیەکەی ئاو باریک ،لەساڵی ١٩٣١دا لەوکاتەدا ڕوئەکاتە ئەقڵ و دۆگماکانی عەرەب و پێیان دەڵی:

گەر مانعی حەقی میللەتی کوردبن ، عەرەب

بێشک نوێژەکانم بەکوردی قەزائەکەم

/- لە ١/٦/ ١٩٢٦ شوکری فەزلی کۆچی دوایی کرد یەکێک بوو لەوشاعیرە هەڵکەوتوانەی زەمانی شێخ مەحمود، لەپارچە شێحرێکیدا بەنامەیەک ناردویەتی بۆ شێخی نەمر کە بەگوێی ناحەزو گێرە شیوێنان نەکات :

ئیش کە ڕوی ئیستە لە هەورازە،سەرەولێژی نەکەی

فکری دوریشی ئەوێ هەر بە دوعاو نوێژی نەکەی

گێرە شێوێنێ کە کای کۆنی بەبادا لەکنت

چاکە هەر لێی خوڕی سەیری دەم و کاوێژی نەکەی

تائەگاتە ئەو دێڕەی دەفەرموێ :

سەرەتای ئیش هەموو یەکبوونە ئەویش نابێ هەتا

هەربرینێ ،کەلەدڵدا هەیە سارێژی نەکەی

لە ١٩ / ٦ / ١٩٤٧ لەبەغداد چوار ئەفسەری کوردستانی، مستەفا خۆشناو ، عێزەت عەبدالعزیز وخەیروڵلە عەبدوالکریم و محەمەد قودسی لە سێدارەدران بەتاوانی یاخیبوون لەدەوڵەت و بەشداری لە شۆڕشی بارزاندا و ڕوکردنە نیشتمانی دایک لەمەهاباد بەشداریکردنیان لەکۆماری مەهاباد دا لە (٢)ی ڕێبەندانی١٩٤٦ واتە ١٩٤٦/١/٢٢. کەڕۆڵی هەستیاریان

لەدامەزراندنی سوپای کوردستان و شەرو نەبەردیەکانیان لەوجەمهوریرتەدا دژی سوپای داگیر کەری حەمە ڕەزاشا ئەو چوار ئەفسەرە شەهیدە لەدواکاتی ژیانیاندا کە ١٤ سەعات مابوو ، بۆ لە سێدارەدان نامەیەکیان ئاڕاستەی نەتەوەکەیان کرد کە پارچەیەک بوو لەگیانی شۆڕشگێڕی و بەرگری نەتەوەیی .

کە لەدواکاتی ژیانیاندا تەحەدای داگیرکەران و دوژمنانیان ئەکرد وەسیەت نامەیان بۆ نەتەوەکەیان ئەوەبوو کە یەکڕیزو بەرگەگرو بەجەخت بن ڕیگەی ڕاستی نەتەوەپەروەری و سەردەم بگرنەبەر.هەر وەهانووسیبوویان کە بەرامبەر واجبی میللی ، هیچ دوانەکەوتوین ، تەنیا نەسیحەتی ئێمە ئەوەیە کەلاوان و نیشتمان پەروەرانی کورد نوکرانی زات بکەنە نیشانە، وەیەکێتی بکەنە پەیڕەوی خۆیان ، بۆشکاندنی تەوقی ئیستیعمار ، وەڕزگار کردنی هەموو میللەتێکی مەزڵەم بێجیاوازی . برایان دوژمنی جەهالەت بن ، بەهەموو تواناتانەوە شەڕێ جەهالەت بکەن ، دوای جەهالەت مەکەون ،،، وەک سەربازێکی ئازاد ،تائاخرین توانا هەوڵماندا،وە گەیشتینە ئەم نەتیجەیە ، ئیدی بۆ یەکێتی بۆ ئازادی ،بژی کوردەکوردستان.

واژوی : خەیرۆڵا عەبدولکەریم ، مستەفا خۆشناو ،عیزەت عەبدولعەزیز ، محەمەد مەحمود قودسی .

١٩٥٠/٦/١٩ ڕۆژی کۆچی دوایی منەوەرێکی وەک پیرەمێردی شاعێرو فەیلەسوف وڕۆژنامەوەان ونووسەرو پسپۆڕو کۆکەرەوەی پەندی پێشینیان کەبە شیعر دای ڕشتەوە ، نەورۆزی وەک جەژنێکی نەتەوەیی لەناو دڵ و دەرونی لاوان و نیشتمان پەروەراندا بچەسپێنێت ، لەدوای خۆی سامانێکی کەلتوری کوردی بۆمان بەجێ هێشت .لەهۆنراوەیەکدا نووسیویەتی :

| | |
|---|---|
| چیم کردوە هێشتا لە کوێمە | میللەت لەمەو دوا ئەمێدی پێمە |
| سەیر کە بەهارم لێبێ ئیشاالله | لەکوردستاندا بیکەم بە هەڵلا |
| بەیداخی کوردی بلەرێنمەوە | ئیرسی ڕۆیوەکانی بگەڕنمەوە |

هەرلە ٩ حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣دا لەبەیانی ئەورۆژو مانگ و ساڵەدا لەسلێمانی (منع التجول ) ڕاگەیەندرا ، زەعیم سدیق ئامر لوای ٢٠ ی سەربازی ، بەپێی پلانێکی دەوڵەتی مەرکەزی بەعسی فاشێست لە ڕەشبگیریەکی کەم وێنەدا ، هەموو خەڵکی ناو شاریان گرت ،بەرەو تەویلەکانی ناوحامیە بران و لەوێ بەندکران ( کەئیستا پارکی ئازادیە) لەورۆژەوە ڕۆژانی دی دەیان کەسیان شەهیدکرد، لەوانە (یاسین وئەنوەر دارتاش و حەمەبۆرو ئیسماعیل ومامۆستاحاجی باقی)، تاوانی ئەوانە ئەوە بوو کە تەنهاکوردبوون . گەرکەسێک لەوانە جنێوێکی بدایە بەڕابەری ئەوکاتەی کوردایەتی بارزانی سەرفراز دەبوو .

**لەڕۆژی ٢٣ /٦ /١٩٦٣دا ڕژێمی فاشی عێراق ( ٢٨) هاووڵاتی کوردیان بە بیانووی جۆراو جۆر لەشاری کەرکوک پێکەوە لەسێدارەدا لەوانە پارێزەر ونووسەری گەورەی شێخ مارف بەرزنجی بوو**

**هەر لە ٦/١ ١٩٧٥ یەکێتی نیشتمانی کوردستان دامەزرا لەگەڵ کۆمەڵی ڕەنجدەران یەکیان گرت دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ شەرەفی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی کوردی نوێی کوردی بە باڵابرا .**

**لە ٢٥ /٦ / ١٩٨١ دا سیاسەت مەدارو شاعێر و نووسەرو ڕۆژنامە نووس و پێشمەرگە سەیدا سالح یوسفی لەبەغداد تیرۆرکرا ، لەلایەن پیاو کوژەکانی بەعسەوە .هەمو ئەمانەی سەرەوە بەشێکن لەزنجیرە ڕووداوەکانی حوزەیران کە بۆتە مێژوویەکی پڕ لەبەهای نەتەوەکەمان. هەموو ئەمانەی سەرەوە بەشێکن لە زنجیرە ڕوداوەکانی حوزەیران کە بۆتە مێژوویەکی پڕ بەهای گەلەکەمان .**

***

## پێنجەم

## یادەوەری بەڕێز حەمە ڕەزا ئیبراهیم ئەحمەد قەرەداغی

## ناسراو بەحەمە ڕەزای کادیر

## دەربارەی مەنعی تەجەولی ساڵی ١٩٦٣



**بەڕێز حەمەڕەزای قەرەداغی (کادیر ) بۆی گێرامەوەو نوسیویەتی:**

**١/ لەکاتی مەنعی تەجەولەکەدا تەمەنم ١٣ ساڵ بوو ڕوداوەکانم بەچاوی خۆم بینیوە تائەمڕۆ لەیادما ماوە .**

**لەبەیانی زوی ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٩ ئیعلانی قەدەغەکردنی هات و چۆ بڵاوکرایەوە. لەڕۆژی ١٩٦٣/٦/٨دا زۆری خەڵکی شارو لادێ نەیان زانیبوو کە مەنعی تەجەول ئەبێت. هەر ئەو بەیانیە زوە خەڵکێکی زۆر لەلادێکانەوە بەر رەو سلێمانی هاتبوون ، نەیان زانیبوو مەنعی تەچەول ئیعلان کراوە کەوتنونەداوی مەفرەزەکانی لەشکری زەعیم سدیقی تاوانکارەوە زۆریان شەهید کرابوون. پیاوکوژەکانی بەعس بەخێرای لە شاردا بڵاو بوونەوە، لەهەموو گەڕەکەکانی شار بنکەی سەربازی و ڕەبیەیان داناو دروستکرد بۆکوکردنەوەی گێراوەکان و شەهیدکردنیان و توندکردنیان لەتەویلەکانی حامیە، کەئێستا (پارکی ئازادیە) هەرلەوناوەدا کۆمەڵیک لەلاوانی شارەکەیان شەهیدکردبوو بەزیندویی کرابوون بەژێر خۆڵەوە دەبابەلەسەر گۆڕەکانیان ڕاگرتبوو وەستاندبوو، ئەم قەدەغەیەسێ ڕۆژی خایاندا، دوای ئەوەی قەدەغە تەواو بوو.**

**لەوساڵەدا ئێمە لەخانوویەکی گڵدابووین نزیک مەزادخانەکەی جادەی کاوە ، ڕامکرد بۆ بەر بەلەدیەکۆنەکە ، لەناو بازاڕدا دیم دوکان دارەکان خەریکی فڕێ دانی سەوزەو میوەی گەنیوو ڕزیو بوون کەخراپ بوون گەنی بوون. قەسابەکانیش خەریکی فڕێ دانی گۆشتەبۆگەن بووەکان**

بوون کەبۆنیان لەوناوەدابڵاو بوو . کەلەوکاتەدا بەشێوەی ئەمڕۆ شوێنی تایبەتی بەستنی گۆشتیان نەبوو . وەک ئەهاتەگەێم باسیان ئەکرد ئەیان وت بەهەزارەها خەڵک گیراوە ، بەتایبەت لەسەرا کۆنەکەدا برسی کراون چەندرۆژێک بەبرسی ماونەتەوە بەناچاری و بەردەوامی ژیان ، گەچی دیوارەکانیان خواردبوو پاشەڕۆی وڵاخەکانیان خواردبوو کەلەوکاتەدا ئیستەبڵی ئەسپ لەناو سەراداهەبوو .

بیستم کە کۆمەڵێکی زوریان لە خەڵکی شار لەحامیە ( کەئیستاپارکی ئازادیە ) گوللە باران کردبوو زۆریان مابوون هەر بەزیندویی بەشۆفل کردبوویانن بەژێر خۆڵەوە ، دەبابەکانیان بەسەر لاشەکانیاندا بردبوو .

دوای ماوەیەک بیستم کەلاشەوی شەهیدەکان لەحامیە دۆزراونەتەوە خەریکی هەڵدانەوەن ڕام کرد بەرەو حامیە تابزانم لەوناوەدا چی باسەو خەریکی چین ؟ .

کەچووم بەچاوی خۆم دێم خەریکی هەڵدانەوەی گۆڕەکانیانن ، لاشەی شەهێدەکان لەناو چاڵەکاندا دەر ئەهێنن لەولاوە دارو خەڵوزم بێنی لەوناوەدا بلاوکەوتبوون، کە خاوەنەکانیان خەڵکی لادێ بوون شەهید کرابوون .

لەناوچاڵێکدا چەند تەرمێکم بێنی کەخەریکی دەرهێنانیان بوون ، یەکێک لەوانەی کەدەریان هێنا تەرمی قەسابێک بوو کە هیشتا چەقۆی قەسابیەکەی بە قەدەوەبوو قەڵەوێک بوو لەدواییدابۆم دەرکەوت کەناوی ڕەحیمی عەینەیە . یەکێکی کەیان دەرهێنا و خۆم دیم هێشتا سەعاتەکەی دەستی کاری ئەکرد هەمووتیان ماشائەڵلە سەعاتەکەی پاتریەوە لەکارنەکەوتوە ، ئەوەندە ئەچوومەۆێشەوە لێم توڕەبوون و دەریان کردم دوریان خستمەوە، دواتر زانیم مامۆستا یاسین و مامۆستا ئەنوەر و عومەری حاجی یونس و سەلاح ئەحمەدە فەندی و چەند کەسێکی کەی تیابوو دەریان هێنابوون دەرکەوت ئەوچاڵە ١١ کەسی تیاشەهید کرابوو، داوایان لەهەندێک لەو شەهیدانە کردبوو کە جنێو بە مەلامستەفا بدەن ، ئەوانیش جنێویان نەدابوو شهیدیان کردبوون .

## ٢/ یادەوەریەکی تاڵی ترکەلەساڵی١٩٦٣دا ئەنجام درا :

لەسەر جادەی نێوان سلێمانی و دەربەندی خاندا لە نزێک تۆنێلەکە لەنەبەردیەکی پێشمەرگەدا کوڕێکی خزمی تیابوو کەناوی عەزیزحەمە ئەمین بوو گێڕایەوە لەوشەڕەدا لەپێنج پێشمەرگە زیاتر شەهیدبوون تەرمدەکانیان دەست کەوتبوو ، خستبوویانە ناو پشتی زێلێکی سەربازیەوە هەندێک لاشەیان سوتابوو لای سەرای کۆن لەفولکەی بەردەرکی سەرا ڕایان گرتبوو ، چەکاکانیشیان بەم لاو ئەولای زیلەکەدا هەڵ واسی بوو ، من منداڵ بووم بەچاوی خۆم دیم

**بەلایانەوە وەستام و زۆرم سەیر کرد ، تائەمڕۆژ وێنەی شەهیدە سوتاوەکان لەبەر چـاومن ، ئەوەندە وەستام و سەیرم کرد ئینزیباتێک لێم تورەبوو دەری کردم. ناوی دوان لەوشـەهیـدا ئەزانم وبیرمە یەکێکیان ناوی عەریف ڕەزابوو لەگەڕەکی خەبات دوەم  شەهید ناوی ئەحمەد بوو خەڵکی دێیەک بوو لەبناری شارەزور .**

# بەبۆنەی کارەساتی ١٩٦٣/٦/٩

**زۆر لەنووسەران و شاعێران دەربارەیەوە نووسینیان هەیە و شێعریان وتوە،**

**کە کاریگەرن لێرەدا بۆنموونە پارچە شێعرێکی، شێرکۆ بێکەس و کامەران موکری ، تۆمار کراوە ، پێش کەشی خوێندەواری بەڕێزیان ئەکەم .**



**پارچەشیعرێکی کۆچکردو شێرکۆ بێکەس دەربارەی کارەساتی نۆی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣**

**یەکەم :**

**دەشتێک هەمووی ڕوتەنی بوو**

**تەنها لەیەک شوێندا نەبێ**

**کەتۆپەگوڵ تۆپەگولی گەورە گەورە**

**داپۆشیبوو**

**کەس نەی زانی نهێنی ئەم پارچە عەردەو**

**تۆپەگوڵی گەورەچیە ،،، هەتاکوچون**

**عەردیان هەڵکەند**

**ئەوسائیتر ئاشکرابوو**

**کەچەند عاشقێکی فتبۆڵ**

**لەژێرەوە لە پاڵ ڕەگی تۆپەگوڵدا**

**ڕاکشابوون**

دووەم :

ئازادی سکاڵای خۆی هەیە

قوربانی سکاڵای خۆی هەیە

چیاش هەر سکاڵای خۆی هەیە

گۆڕستانی مۆمەکانیش هەر سکاڵای خۆیان هەیە

هەمووشیان گەر بیانەوێ

سکاڵایان شۆخ و شەنگ بێ

سکاڵایان ڕازاوە بێ

بەچرای وشەی سەوزو سور

ڕوئەکەنە تاقە کەسێ

سکاڵایان بۆ بنوسێ

عەرزوحاڵچیەکەی بەرسەرا

ئەوپەخشانەی

کەبەپێوە وەک فوارە

شەهیدکرا

سێیەم :

حەوشیی ماڵەکانی ئێمە

جگەلە چێمەن بۆ قسەو نانخواردن و

دانیشتن وپاڵکەوتن ولە دایک بوون و

نوستن وشوکردن و ژنهێنانیش،،، هتد

حەوشەی ماڵمان ،

زەعیم سدیق، جەنراڵی هاوینی مەرگ

بۆ یەکەم جار یەکەم کەس بوو

بۆیشی کردین بە قەبرسان

چوارەم

مامۆستایان و حوزەیران

وەکو ڕوبارە سەرچاوەن

دەنگیان یەکەو لەشیان یەکە

مامۆستایان لەم یادەدا

پۆلی باڵندەی وشەن و

حوزەیرانیش تەختەی ڕەشە،،!

حوزەیران  بەگەرمای مەراق بەقرچەی ئەو هەموو

کۆستانە ئارامتی وەک پۆڕی ناو گڕە پڕوکان

تۆ ئیستە وەک تەلی دڕکاوی چوار دەوری زیندانت

داخ بوویت و بەوێنەی خەرمانی سووتاوی مێژووت و

بەوێنەی بازنەی ئاگری ئەوپوش وپەڵاشەی شەوانە

لە کەژدا ئەڕۆن و ئەسووتێن، کەوتویتە هەڵقرچان

حوزەیران جەستەتی هاوێشتە ناو گەروی کڵپەوە

سەرت بوو بە سەری شاپڵێتەو

دەستت بوو بەجۆگەی پەنگرو

ملیشت بەگڕدان

حوزەیران بەهارتی خەڵتانی دڕک کرد

(ئەو دڕکە  رسکانی گوڵت بوو )

حوزەیران تۆی دایە بەر تیغی وەیشومە

(ئەوتیغە هەتوانی زامت بوو)

حوزەیران چەند شەتڵ و تۆوی گریانی

لەسنگتا شاردتەوە

(ئەو شەتڵ وتۆوانە کۆ گەرانەی ژانت بوو )

حوزەیران پاڵێکی پێوەنای بۆ کەندو هەڵدێرێ

( ئەوکەندو هەڵدێرە لوتکەبوون بەرەو ژوور )

جەنەڕاڵ سدیقی هاوێنی مردنیش

چەند پەتی بۆ ملی هۆنراوەت هەڵخست و

چەند چاڵی لە پشتی ولەشتا هەڵکەند و

چەند کونی کردە ناو دیواری سەرتەوە
پەتەکان ،،، پلیکەی سروودبوون بەرەو ژور
چاڵەکان،،، دێراوی ڕشتەبوون  بۆ چیرۆک بۆ دوارۆژ
کونەکان پەنجەرەی سەهۆڵی کۆنگرەی ئەوینی
خەڵکی بوون
حوزەیران بەقفڵی قەدەغەی هات وچۆ
چۆنێتی خولْقانی کلیلی فێرکردی
حوزەیران ،،،بە دۆزەخ ئاماژەی بەهەشتی بۆ کردی
حوزەیران ،،، بەسووتان سەوزایی لەگیانتا هەڵکردی

- لەکتێبی خاچ و مارو ڕۆژ ژمێری شاعیر :
- شێرکۆ بێکەس وەرگیراوە لاپەڕە ١٤٩ بەدواوە



## لەهونراوەی شاعیری کۆچکردو کامەران موکری
## بەبۆنەی کارەساتی نۆی حوزەیرانی ساڵی١٩٦٣

خونچەی بزەی لیووی ساوا
لەدڵۆپی ئەشکی چاوا
لەبێخی دڵی ناسکا
توایەوە وەک خوێن تکا
لەسەر سنگی کچۆڵەو وژن
بەخوێن نوسرا ئەمان کوژن
کۆرپە بەدایکا هەڵزنا
خەم بەدڵی ئاسنا
بەیان کاتی خۆر هەڵاتن
هەڵیکرد ڕەشەبای مردن
بەخرمەی ئەستێرەی دۆشکا
گەلێ دڵ وەک شووشە شکا
سلێمانی شاری خەم چێژ
ڕاهاتووی کوشتارو دەستڕێژ
سلێمانیەکەی بەرگەگر
یەکسەر هەمووی بوو بە ئاگر
تانک و زرێپۆش تۆپی مەزن
بانگیان ئەکرد ئەبێ بمرن

دوژمنی ئابڕو تکاو

بڕبڕەی مەردێتی شکاو

لەناو شارا بەبێ وچان

تۆوی ترس و مەرگی ئەجان

پشکۆی سام و خەم و سزا

بەپەنجەی ژینا ئەچزا

ماچی خوێناوی دایک و کوڕ

لەشەقاما ئەبوو بە گڕ

سوپای ساو و بێچەک کوشتن

قەدەغەی کرد تەرم ناشتن

لاشەی کوڕ لەکۆشی دایکا

پێڵوی سوری پیا ئەتکا

ڕۆڵەکانی کورد بانگیان کرد

ئەژی ئەوکەسەی ئەمرۆ مرد

کاتێ ئەڕۆن بەرەو سەیوان

بانگ ئەکەن بژی کوردستان

**

من کوردم ئاگری هەستم

گڕ ئە سێنی بۆ مەبەستم

نابم بەکۆیلەی بێگانە

کەنیزەک نین ئەو کیژانە

لەسەرمشتی خۆڵێ وڵات

بێپەروا گیان ئەکەنە خەڵات

**

چاڵێکیان هەڵکەند فراوان

قوڵ وەکو دەرونی تاوان

هەشتا لاوی کوردیان ڕێزکرد

لەدڵ بەهێزەکانی کورد

برا و هاورێ وکوڕ و باوک

**درانە بەر شێڵگەی تفەنگ**

**نرانە چاڵەوە بێدەنگ**

**خۆڵیان پێاکردن سەرانسەر**

**تەختکران بە گرێدەر**

**پێش مردن هەموو وتیان**

**ئەمرین بەبێباک بۆ ژیان**

**

**وەرن لەناودڵ بنووسن**

**کەمال و ئەنوەرو یاسین**

**لەگەڵ کاروانی شەهیدان**

**بوون بە قوربان بۆ کوردستان**

**



دیمەنی شآری سلێمانی لەساڵی ١٩٥٧

## دوا وشه ...

ئەگەرنمانەوێت باسی تاوانەکانی و نامەردیەکانی زەعیم سدیقی خوێنڕێژ وبەعسی فاشیست بکەین و زیاتر لەسەری بڕۆین ئەوەندەزۆرن نابڕینەوە، زۆرجار لەناو خەڵکیدا باسی دێتەپێشەوە بەشیوەیەکی جۆراو جۆر دەیگێڕنەوە کە باوەڕ پێکراونەبێت یان کەمتربێت لەوەی ڕویداوە یان موبالەغەی تیاکرابێت کەئێمە ناتوانین هەموویان بنووسینەوە، ئەگەر لەسەرچاوەیەکی باوەڕپیکراوەوە نەبێت

زۆر حەزمکرد وێنەوکورتەیەکی ژیانی هەریەکێک لەزیندانیە کانی ئینزیباتخانەوەربگرم ، بەداخەوە هەر ئەوەندەم دەستکەوت. هەرچەندە دو جار لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیدا ئاگاداریم بڵاوکردەوە و بۆ ئەومەبەستە بەزۆریانەوە پەیوەندیم کرد.

هەوڵمدا بەسەرهاتی هەموو ناوچەکانی کەی کوردستان بەدەست شۆڤێنیزمە عەرەبەکان و بەعسەوە لەوچەند ساڵەی حوکمیاندا بنووسم ، بەهۆی ئەوەی دوروڵاتم وەک پێویست دەستم نەکەوت .

دەرەفەتی ئەوتۆم نەبوو، کە باس لە ئازارەکانی لاوانی هەڵەبجەبکەم بەدەستی زەعیم سدیقەوە چیان بەسەرهات، زانیاری تەواوم لەبەردەستدانەبوو ، بەداخەوە ئەوەندەی لەم بارەیەوە بیستبێتم بەدەمی بۆیان گێرامەوە، بەناوی ، چەند کەسایەتیەکەوە وەک : بەڕێز کاک لەتیف قادر ئاغا کەلەوکاتەدا لێ پرسراوی لیژنەی ناوچەی پارتی بوو ، لەگەڵ مامۆستایان سەعدی و محەمەد قادر و مەریوان حیلمی: کە ماڵ و دوکانی زۆر لەشاری هەڵەبجە کاوڵکراوەو سوتاوە

و لەناویـشیاندا سـوتاندنی دوکـانەکەی ، شـاعیر ( مەلاکەریـم ناسـراو نـاتیق ) کەدیـوانە دەستنووسەکەی لەدوکانەکەیدا بووە سووتاوە و ئەوشاعیرە لەدواتەمەنی ژیانیدا بەو داخەوە سەری نایەوە کەبەرهەمی ژیان وداهێنانی شیعری سوتا بووە خۆڵەمێش .

لەلایەکی کەوە دەستی تاوانی گەیشتە شاری پێنجوین، کەزۆرتـرین موچەخۆرەکـانی میـری بەکۆمەڵ کۆکردەوە وگرتنی لەبەندیخانە ی سلێمانی توندی کردن کەلە بەندیخانـەی گـشتی سلێمانی زۆریانم ناسی . زەعیم سدیق بەهۆ و لەڕێی تاوانەکانیەوە کاری کردەسەر ژیانی هاو وڵاتیان بژێویان و کاری کردەسەر کەلتورو کەلە پوری نەتەوایەتیمان کە خەڵکی لەترسی ئەوەی توشی سزاو لێپرسینەوە ونانبڕین وگرتن و ئازارو ئەشکەنجە وکوشتن نەبـن ،زۆر نووسـین و وێنەو یادەوەری ونووسراو ونەختینەو یادەوەری ژیانیان لەدەستدا ولانـاوبران ، یـان خۆیـان لەناویان برد . ئەوەی کەنووسراوە .

ئەوەی پەیوەندی بە بەندکراوەکانی ئینزیباتخانەوە هەیە ، لەمانگی ئۆکتۆبەری سـاڵی ١٩٦٢ دەربارەیان نووسراوە تا ١ /٤ /١٩٦٣کە هەموو بەرەڵا کراین ، لەپیش ئەو ماوەیەدا ، ئاگام لە بەند کراوەکان نەبووە، هەرچەندە هەوڵمداوە زانیاریم وەرنەگرتووە و دەستم نـەکـەوتـوە، هەروەها لەدوای بەربوون، هـەمیـسان، زانیـاری ئـەوتـۆم لانیـەوە کـەهـەوڵـمداوە وەربیگـرم، لەئینزیباتخانە ئەوەندە کەس نەگیراوە، تازانیاریم دەستبکەوێت وگیراوەکان کەم بوون، ئەگەر یەکێک گیرابێت، دوای ئەوماویە لەشەوێک زیاتر نەماونەتەوە ، بەشێوەی جاران ئازار نەدراون، لەو ماوەیەدا کە ئێمە لەئیزیباتخانە بەندبووین هەر کەسێک لەئینزیباتخانە بەندبووە بێگومان لێرەدا ناوی نووسراوە لێرەوە ئەمەوێت زۆرسوپاسی بەڕێز مەریوان سەلاح حیلمی، و بەڕێز فەرەیدون عەزیز، و بەڕێز ئەژی کەمال حەمە حسەین بکەم کە یارمەتیان دام بۆ پێاچونەوەو نووسینەوەی و ئامادەکردنی و بەچاپ گەیاندنی چاپی یەکەم و دووەم .

هەر وەهاسۆپاسی مەریون مارف ئەکەم بۆ چاپی سێیەم دیزاینی کردوە ، لەگەڵ ڕێزو سوپاسم بۆ کارمەندو کرێکارانی چاپخانەی کاردۆ .

داوای لێبوردن ئەکەم لەوانەی ئەم یادەوەریە ئەخوێننەوە لە هەر هەڵەیەکی چاپ ئەگەر بەدی بکەن . بەپێی بیرو بۆچوون بیرۆکەی سیاسـی و پرانـسیپی حیزبایـەتـی ئـەوسـاتانەو بیـری شۆڕشگێڕی ئەوساتانەو، کەش و هەواو زروفی ئەوسـاتانە، نووسـیومە کـە شۆڕشـی یـازدەی ئەیلول پەرەی سەندبوو، لە زاخۆوە تاخانەقین و مەندەلی، گەلی کوردمان یەکهێزو یەکرپزبوو، لەژێر سەرکردایەتی سەوۆک بارزانی و بەڕابەری پارتی دیموکراتی کوردستاندا سەپـەرشـتی ئەکرا. ( ئەم یادەوەریەم بۆمێژوو نووسیوە تەنهابۆ مێژوو وەک مێژوو)

***



وێنەیەکی مەڵبەندی ( پ.د.ک) ئەوانەی ناسراون ، ١/تۆفیق کەریم خان یەکەم کەسی دانیشوی لای چەپ . ٢./ ئەحمەد زرنگ ٣./حەمەی حاجی تاهر.دانیشتوی سوچی ناوەڕاست. ٤/د.کەمال فوئاد کە لەپێشەوەڕاوەستاوە وتار ئەدات ٥. / عەبدول سوران ٦./حوسمان سەعید لەپشت حەمەی حاجی تایەر وەستاوە ٧/دوەمی دانیشتو حسەڕەشی خەیاتە جلکوردیەکە بەمشکی و و جامانەوە لەتەنیشتی ڕاستی دانیشتوە کراس سپیەکە فەقێ عەلی ماوەتیە لە١٩٦٠/١/٢٥



بینای ئینزیباتخانەی سلێمانی لە دەرەوە دەبینرێ . شوێنی حەوانەوەی ئامر ئینزیبات بوو ، شوێنی بەندەکان بوو



لەم وێنەیەدا پەنجەرەی ژورەکەی ئێـمە  دەرئەکەوێت لەگەڵ پەنجەرەی ژورەکەی پێشەوە کەچارپایەکەی پێوە هەڵپەسراوە کەهی لێکۆلێنەوە بوو لێرهەدا ئازارو ئەشکەنجە ئەدراین.



وێنەیەکی ناو حەوشەی ئینزیباتخانە لەم دواییەدا کەچاک کراوە. کەپەنجەرەو ژورەکەی ئێمە دەرئەکەوێت ، لە تەنیشتی ژوی لێکۆڵینەوە دیارەکە دو بەرمیل لە سەربانەکەیدا هەیە

## بۆبەردەم وەزارەتی شەهیدان و ئەنفال کراو

## زیندانە سیاسیەکان وبەرپرسان

هیوادارین گلەیی زیندانیەکانی ئینزیباتخانە وتاوانەکانی  زەعیم سدیق بەهەند وەربگرن کەزور ئەشکەنجە دران وئازاری زۆریان چێشت، هەندێکیان شەهید کران ئەتوانم بڵێم ئەو زیندانە سیاسیانەن کە کیسەکەیان بە زەقی لەبەر چاوە، کەبۆ یەکەم جار دوای شۆڕشی١٤ تەموز لاوانی کورد لەئینزیباتخانە بەودەردەبران ، لەتەویلەکانی حامیە توندکران زۆریان کوژران و توشی نەخۆشی درێژ خایەن بوون و لەڕیی ئەم بیرەوەریروە ئەتوانرێت بەسەربکرێنەوە .

هیوادارین ئەوناوانەی کەلەم بیرەووەریەدا هاتون بە هەند وەربگرن . کەبەئەمانەتەوە ناویانم نووسیەوە ماوەی پەنجاسال  تێپەڕبووە بەسەر ئەنجامدانی تاوانەکان کەزۆریان شەهیدبوون یان کۆچیانکردوە دانە دانەیان ماون کە هەندێکیان هەوڵ ئەدەن  بەزیندانی سیاسی وەربگیرێن  بەڵام تەگەرەی شاهید لە بەردەمیانداهەیە.

زۆرجار لەوڕووەوە گلەیی ئەکەن وەک زیندانی سیاسی وەرنەگیراون



## مامۆستا محەمەد باقی سەعید

**کورتەیەکی ژیانی خاوەنی ئەم یادەوەریە مامۆستا م . ب . سەعید**

*** لەساڵی ١٩٣٥ لەگەڕەکی گویژە لە سلێمانی لەدایکبووم.**

*** لەساڵی ١٩٤٢بۆیەکەم جار چوومەتە قوتابخانەی سەرەتایی غازی.**

*** لەساڵی ١٩٥١ چوومەتە دار المعلمین لەبەغداد .**

*** لەساڵی ١٩٥٥ چوومەتە مەعهەدی زمانی ئینگلیزی بەشی ئێواران .**

**.*لەساڵی ١٩٥٤ لەڕاپەڕینەکەی بەغداد هاوبەشیم کردوە لەبەر هەڵوێستی نیشتمانی بۆ ماوەی ساڵێک لەدارالمعلمین دەرکراوم .**

*** لەساڵی١٩٥٥ دا بەبێ تاقیکرنەوەی ، وبەپلەی بەرز دەررچووم.**

*** لەساڵی ١٩٥٦ بۆیەکەم جار دانرام بەمامۆستا لەماوەت ، بەهۆی**

**هەڵوێستی نیشتمانی وکوردایەتی چەندجارتوشی سزابووم و گوێزرانەوە بووم.**

*** لەساڵی١٩٥٨ دا گوێزراومەتەوە بۆ(قوتانخانەی بارزان ) لەناو شاری سلێمانی.**

*** لە ساڵی ١٩٦١هاوبەشی شۆڕشی ئەیلولی مەزنم کردوە، ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بووم.**

*** ڵەساڵی ١٩٦٢ دا یەکێک بووم لەدامەزرێنەرانی (یەکێتی مامۆستایانی کوردستان ) ، لەکۆنگرەی دامەزراندنیدا ،بووم بە ئەندامی سکرتاریەت و ئەندانی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ئامانج .**

*** لەساڵی ١٩٦٢ دا لە ئینزیباتخانەی سەربازی لەسلێمانی گیراوم ،دوای ئینقیلابی بەعس ئازادکراوم و بەوهۆیەوە ١٠ ساڵ تەرفیعم دواکەوت .**

*** لەساڵی ١٩٦٣دا لەبەر شەهیدبوون و گرتنی ئەندامانی سکرتاریەتی مامۆستایان ، ناچار بوومەتە سکرتێری یەکێتی مامۆستایان ،تاساڵی ١٩٦٥ بەڵکو تاکۆنگرەی دووەمی یەکێتی مامۆستایان ساڵی١٩٦٧**

* بۆمـاوەی چەندسـاڵێک ئەنـدامی نەقـابەی مەرکەزی گـشتی مامۆسـتایانی عێـراق بـووم، لەکۆنگرەکانیدا لەبەغداد تاساڵی ۱۹۷۳    هاو بەشبووم

* لەساڵی ۱۹۷۳ لەدوای ئەوەی لەدەورەی ئیدارەی مەدرەسی پلەی یەکەمیم هیناو بە ئیمتیاز دەرچووم ناچار کردمیان  بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئەمین زەکی لەکارێزی مەجید بەگ .

* لەساڵی ۱۹۷۳  وچومەڕیزی پێشمەرگەی کوردستانەوە .

* لەساڵی ۱۹۷۵ دا نەفی دیوانیە کراوم بۆماوەی ٥ ساڵ

*لەسـاڵانی ۱۹٦۳ . ۱۹۷٤ ، .۱۹۹۱ ، ماڵـەکـەم  کتێبخـانەکەم و تـاڵان کـراوە بـراوە ، سـەیارەکەم ( ژمـارە٥٩٠ سـلێمانی ) دەسـتی بەسـەرداگیراوە لەمەزاددا فرۆشـراوە .لەلایەن حکومەتی بەعسەوە ماڵ و کتێبخانەو سەیارەکەم  بەتاڵان براون

* لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە ماوەیەک سەرۆکی کۆمەڵەی هەرەوەزی بووم. لەگەڵ ئیدارەی (دار التوڵەبە)لە ساڵی ۱۹٦۹

* لەساڵی ۱۹۸۳ دا بەهوی کاری ناپەسەندی بەعسەوە خۆم خانەنشێن کردوە لەبەرئەوەی زوو تەقاعودبووم کە۲۸ساڵ خزمەتم هەبوو ،ئەمڕۆکەمترین مۆچەوەرئەگرم.

* لەچالاکی ڕوشنبیری و نووسیندا لەزۆرگۆڤارەو ڕۆژنامەکاندا هاو بەشێمکردوە نووسینم هەیە دەربارەی پەروەردەو مێژوو  وسیاسەت . تائەمڕۆ چەند کتێبێکم بەچـاپ گـەیانـدوە وەک: .

۱/ بۆ مێژوو :ئیزیباتخانەوە تاوانەکانی زەعیم سدیق .

۲/ بۆ مێژوو :چەندخاڵێکی چاکسازی لەبەردەم  کار بەدەستانی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

۳/ بۆ مێژوو : بیرەوەری دەربارەی دامەزراندنی یەکێتی مامۆستایان

٤ / بۆ مێژوو : کەرکوک ونەتەوەکـانی دەوروپـشتی بـەدرێژایـی مێـژوو، ٥./  بـۆ مێـژوو : ئاسایشی نەتەوەی کوردو خاکی کوردستان

٦/  بۆ مێژوو  :کتێبێک کە ئامادەیە (فرمێسکی ڕۆشنا).

لەڕوی خێزانیەوە لەساڵی ۱۹٦٤دا ژیانی هاو سەریم پێک هێناوە سێ کورو یەک کچم هـەیـە بەناوی

۱/ پـشتیوان لــەدایــک بــووی ســاڵی  ۱۹٦٥ ،ئــەنــدازیاری دورچــوی زانکــۆی موســێلە

۲/ ئاری لەدایک بووی ساڵی۱۹٦۷ ، دەرچوی زانکۆی تەکنۆلۆجیای بەغدادە .

۳/ دیاری لەدایک بووی ساڵی ۱۹٦۹ دەرچوی بەشی یاسایە لە زانکۆی هەولێر .

تاکە کچەکەم بەناوی جوان لەدایک بووی ساڵی ۱۹۷٦ ، دەرچووی بەشـی کـشت وکـاڵ لـە زانکۆی سلێمانی .

لەڕاپەڕینەکەی ١٩٩١ دا خانووەکەم زیانی زۆری بەرکەت لەبەرئەوەی ماڵەکەم دیواری بەدیواری ئەمنی سلێمانیەوەبوو (ئەمنە سورەکە )، زیانی زۆری بەرکەوت،ڕاپۆرتی پۆلیس ودادوەرم هەیەو بێسودبوو لەگەڵ بەسەرهاتی زۆرو گرتن و ئازاردان و ئەشکەنجەی زۆرو دواکەوتنی تەرفیع بۆماوەی ١٠ ساڵ و زیندانیکردنم لە ئینزیباتخانەو پێشمەرگایەتی و نەفی دیوانیەو .

لێقەومان و نەبوونی دەستکورتی ماڵوێرانی وتاڵانکراوی ، وەک :

١/ لەساڵی ١٩٦٣ لەلایەن دڕندەکانی زەعیم سدیقەوە تاڵانی کرام

٢/ لەساڵی ١٩٧٤ دا کەچوومە دەرەوە پێشمەرگە بووم ، ماڵەکەم ،سەیارەکەم بەژمارە ٥٩٠ سلێمانی لەمەزادی ئەمندا فرۆشرا کتێبخانەکەو ماڵەکەم خرایە زیلی عەسکەریەوە بەتاڵانی برا

٣/ لەساڵی ١٩٩١ دا لەگەڵ هەڵگیرسانی ڕاپەڕین هەموو ماڵەکەم بەتاڵانی برا وخانووەکەم بە ( ئار ،بی ، جی )زیانی زۆری بەر کەوت ، لە بەرئەوەی دیواری مالەکەم بەدیواری ئەمنە سورەکەوەبوو .

لایەن بەعسەوە توشی گرتن وماڵ کاولی و تاڵانی و نەفی ودەربەدەرییبووم ، کە دۆکۆمینت و بەڵگەو شاهیدی تەواوم هەیە . بەدرێژایی ژیانم تائەمڕۆ لەلایەن هیچ کۆمەڵ و پارت و ڕێکخراوێکەوە یارمەتی نەدراوم دەستیان نەگرتوم لەکاتی لێقەومان و نەبوونی زۆردا قەرەبوو نەکراومەتەوە، کەنزیکەی پەنجاساڵ لەگەڵیان و بەدوایانەوە بووم لەڕیزەکانیاندا بەچالاکی کارمکردوە. بۆ چاپکردنی کتێبەکانم یارمەتیان نەداوم.

لەسەرو ئەوە شەوە هاتووەوەتە گوێم ،گوایە بەهۆی حیزب و یەکێتی مامۆستایان وڕێکخراوەکانەوە لەسایەی حکومەتی هەرێمەوە سودەمەندبووم یارمەتیدراوم ، بەهۆی ئەوانەوە ئەمڕۆ( هەمە) ئەمە ڕاستنیە، ئەڵێم بەهیچ شێوەیەک لە ژیاندا یارمەتی وقەرەبوو نەکراوینەتەوە نەمادی ، نەمەعنەوەی . هەڵپەم نەکردوە ، هەوڵم نەداوە بۆپلەوپایەو وەرگرتنی زەوی وبەرژەوەندی تایبەتی خۆم .

هەر بۆ وەرامی ئەوە ئەڵێم، پێشەکی سوپاسی ئەوکەسە ئەکەین بێت بڵێت ئەمەوانیە وبڵاوی بکاتەوە کە، تاکێک ڕێکخراوێک ناوەندێک حیزبێک هەبوووبێت ڕۆژێک یارمەتی دابم.

بەپێچەوانەیشەوە بەدەستیانەوە توشی زیانی مادی بووم. بەلام سەرکەوتنی میللەتەکەم لەبەرترەبووە لە بەرژەوەندی گیرفانم، ئیستا لەوڵاتی نەرویج پەنابەرم.

محەمەد باقی سەعید مستەفا

ساڵی ٢٠٠٧